

د. واحد عومەر محێدین

# دانوستانەکانی
# بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی ی کورد و
# حکومەتەکانی عیراق (1921-1968)

"لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی"



سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ی کوردستان

دکتۆر واحد عومەر محێدین

# دانوستانەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی‌ی کوردو حکومەتەکانی عیراق ١٩٢١-١٩٦٨

(لێکۆڵینەوەیەکی مێژویی- سیاسی)

سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی کوردستان
سلێمانی ٢٠٠٦

# سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان

دەزگایەکی کەلتورییە لەساڵی ١٩٩٢دا دامەزراوە، ئامانجەکەی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستییە لەبوارەکانی ئاسایشی نەتەوەییو سیاسەتی نێو دەوڵەتانو ئابوریو مەسەلە ستراتیجییەکانو مەبەستی بەدەست هێنانی قازانجی ماددی نیە.

هەمو ئەو لێکۆڵینەوانەی کەسەنتەر دەریاندەکا، گوزارشت لەڕاو بۆچونی خاوەنەکانیان دەکەنو بەپێی پێویست گوزارشت لەڕاو بۆچونی سەنتەر ناکەن.


- دکتۆر واحد عومەر محێدین
- دانوستانەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردو حکومەتەکانی عیراق (١٩٢١-١٩٦٨)
- بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان
- سلێمانی ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن (٥٨٤)
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی سەنتەر : ٦/٤٣/١٠

# پێشەکی

دیپلۆماسیەتو دانوستان بەو پێیەی کەپرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی-سیاسییەو بەدرێژایی‌ی مێژووی مرۆڤایەتی بەشێوازو ئاستی جیاجیا پیادە کراوەو، لەگەڵ گەشەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ئامرازو رێوشوێنو ئاستەکانی گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە، وە لەم سەردەمەشدا بۆتە جێگەی بایەخی پتری هەموو ناوەندە رامیاری‌و سەربازی‌و ئابووری‌و زانستییەکانی جیهان لەسەر ئاستی نێوخۆیی وڵاتان بێت یان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بەچەشنێك کەدامودەزگای تایبەتو سستەمو فۆرمو ئامرازو بنەمای یاسایی تایبەت بەخۆی هەیە، کەوا لەهەموو یەکە نێوخۆیی‌و نێودەوڵەتیەکان دەکا پێی ئاشنا بنو لەبواری پرۆسێسکردنیدا رەچاوی بکەن.

گەلی کوردیش، وەکو گەلانی تری جیهان، لەمێژووی کۆنو نوێیدا زۆرجار دانوستانی ئەنجام داوەو رێوشوێنو ئامرازە رەخساوەکانی بەردەستی بەکار هێناوەو بەئەندازەی جیاجیا کەڵکی لێوەرگرتووە. دیارە دانوستانی سەرکەوتوو مەرجو بنەماو زەمینەو شەقڵی تایبەت بەخۆی هەیە، لەبەر ئەوە دەوڵەتان هەوڵی ئەوە دەدەن کەدامودەزگای تایبەتمەندی بۆ تەرخان بکەنو ستافی کارامەی بۆ پێبگەیەنن، حکومەتی عیراقیش کاری لەم ڕووەوە کردوە، بەڵام لەدانوستانەکانی لەگەڵ سەرکردایەتی کورددا، پتر پشتیان بەکەسانی سەربازی‌و حزبی دەبەست. بەڵام بەهۆی ئەوەی گەلی کورد لەزۆربەی قۆناغەکانی مێژوویدا قەوارەیەکی یەکگرتووی نەبووە، ئەمە کاری کردۆتە سەر توانای کاری دیپلۆماسی‌و ئەمە لەدانوستانەکانیدا لەگەڵ وڵاتانی داگیرکەری کوردستاندا بەڕوونی رەنگی داوەتەوە.

گەلی کورد لەمێژووی دوورو درێژی خۆیدا چەندین قۆناغی جیاجیای بەخۆوە بینیوە، لەچەشنی دامەزراندنی دەوڵەتو میرنشین، و دواتر داگیرکردنو دابەشکردنی نیشتمانەکەیو بەرپاکردنی بزووتنەوەی رامیاریو چەکداریو نسکۆو هەستانەوە، کە لەسەرلەبەریدا سێ خاڵی گرنگ شایانی ئاماژە پێدانە ئەوەش مانەوەی گەلی کوردە بەخەسڵەتە نەتەوەییەکانی خۆیەوەو دوور نەکەوتنەوەی لەسەر خاکی نیشتمانەکەیو سووربوونی لەسەر درێژەدان بەرێبازی خەباتکردن بەهەموو شێوازەکانیەوە لەپێناو گەیشتنی بەئامانجە نەتەوەییو نیشتمانیەکانی. لەروانگەی ئەوەی کوردستان کۆلۆنیەکی نێودەوڵەتییە[*] و کێشەکەی کێشەی وڵاتێکی داگیرکراوو دابەشکراوەو سیاسەتی جینۆسایدو بێوسایدی لەبەرامبەردا پیادە کراوە، بزووتنەوەکەی سروشتێکی نەتەوەییو نیشتمانیو دیموکراتیخوازی هەبووە.

کێشەی کورد لەباشووری کوردستان وەکو بەشێکی دانەبڕاو لەکێشەی نەتەوەیی کورد لەکوردستانی گەورەو لەئەنجامی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو یەکەمین جەنگی جیهانو دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقو لکاندنی باشووری کوردستان بەو وڵاتەوە، چارەنووسی ئەو پارچەیەی کوردستان بەشێوەیەکی یاساییو کردارەکیو دوور لەویستی گەلی کورد بەعیراقەوە گرێدراو تا ئەمرۆش درێژەی هەیە، ئەم راستیەش هۆکاری بنچینەیی پاڵنەری گەلی کورد بوو بۆ خەباتکردن بەهەموو شێوازەکانیەوە لەپێناو بەدەستهێنانی مافەکانی لەچوارچێوەی عیراقدا، وەخەباتی سیاسیو دیپلۆماسی، لەپاڵ خەباتی چەکداریدا، رێبازی سەرەکیو لەپێشینەی

---

[*] بۆ زانیاریی پتر لەبارەی ئەو زاراوەیەو چەمکەکەیەوە، بڕوانە: د.ئیسماعیل بێشکچی، کوردستان کۆلۆنیەکی نێودەوڵەتی، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە رێبوار رشید، ب١، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٣.

بزووتنەوەی نەتەوەیی گەلی کورد بووە لەو پێناوەدا لەهەردوو قۆناغی پاشایەتیو کۆماریدا. بەو شێوەیە دەبینین لەمێژووی ئەم گەلەدا چەندین پرۆسێسی دانوستانی بەخۆوە بینی لەگەڵ حکومەتەکانی عیراق بەتایبەتیو لایەنە پەیوەندیدارەکانی تردا بەگشتی، کەتێکرا زنجیرەیەك لەهەوڵی دیپلۆماسی کوردی لەباشووری کوردستاندا پێکدەهێنێت، بەئاراستەی بەدیهێنانی ئامانجە بنچینەییەکانی بزووتنەوەکەی.

لەقۆناغی فەرمانڕانی پاشایەتیدا لەعیراق، خەباتی هەمەلایەنەی گەلی کورد لەباشووردا راستەوخۆ لەڕووی دەوڵەتی عیراقو بەریتانیا بەتایبەتیو دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانو هاوپەیمانەکانی هەردوو دەوڵەتی ناوبراو بەگشتیدا بووە، بەڵام گەلی کورد لەو قۆناغەدا، جگە لەچەند هەڵوێستێکی پشتگیری تاکتیکی ناوبەناوو کەم بایەخی ئەم وڵات یان ئەو، ئەگینا جگە لەچیاکان کەس دۆستی نەبوون، ئەو راستیەش کاریگەری خراپی لەسەر گەلی کوردو نەگەیشتنی بەئامانجەکانی بەجێهێشتو ئەركو قوربانیەکانی لەو پێناوەدا قورستر کرد، بەجۆرێك کەزۆرێك لەگەلانی جیهان بەئەندازەیەکی زۆر کەمتر لەخەباتو قوربانیدانی کورد، بەئامانجی سەربەخۆیی گەیشتوون، دیارە هۆکارە سەرەکیەکانی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆری سستمی فەرمانڕانی لەعیراقو ئەو فەلسەفەیەی کەپشتی پێبەستووە لەهەڵسوڕاندنی کاروباری دەوڵەتداو، یەکانگیربوونی بەرژەوەندی وڵاتانی بەهێزی جیهانو نێوچەکە لەگەڵ حکومەتەکانی عیراقدا، نەك لەگەڵ گەلی کوردی داگیرکراودا، دیارە وێڕای کاریگەری نێگەتیڤی باری گەلی کوردو سەرکردایەتی بزوتنەوەکەی لەو بوارەدا کە بەشێك لەو بەرپرسیارێتیەیان کەوتۆتە ئەستۆ.

رابەرانی بزووتنەوەی کوردایەتی لەباشووردا لەماوەی نێوان پێش بەرپابوونی یەکەمین جەنگی جیهانیو کۆتاییهاتنی دەسەلاتی پاشایەتی

لەعیراقدا لەساڵی (١٩٥٨)، بریتی بوون لـە (شـێخ عبدالسـلام بـارزانی، شێخ مەحمود حفیـد، شـێخ احمـد بـارزانی، مصـطفی بـارزانی)، کـەتێکڕا لــەقۆناغێکی چارەنووســـازو هەلومـــەرجێکی نێوخـــۆیی‌و نێوچـــەیی‌و نێودەوڵەتی هەرە دژواردا جڵەوی پێشەوایەتیکردنی خەباتی ئەو قۆناغـەیان گرتە دەست، چونکە ئەو قۆناغە داگیرکردنـی ناوچـەکەو هـەردوو جـەنگی جیهــانی‌و دامەزرانــدنی دەوڵــەتی عــیراق‌و تــاج لەســەرنانی فەیســەڵ‌و پێکهێنانی حکومەتەکانی سەردەمی (شـێخ مـەحمود)و دانـانی یەکـەمین دەستوری عیراق‌و لکاندنی باشووری کوردستان بەعیراقـەوەو سـەربەخۆیی‌و بەئەندامبوونی عیراق لەرێکخراوی کۆمەڵەی گـەلان‌و قـایمتربوونی پێگـەو دەسەلاتی حکومەتی عیراقی بەخۆوە بینی. هەروەها قۆناغی نێـوان سـالانی (١٩٥٨-١٩٦٨) کۆمـەڵێك رووداوی گرنگی بەخۆوە بینی چ لەسەر ئاسـتی کوردی بێت یان لەسەر ئاستی عیراق، لەچەشـنی گـۆڕانی سسـتمی حـوکم لەعیراقداو رێبەرایەتیکردنی (پارتی) بۆ خەباتی ئەو قۆناغە بەرپابوونەوەی بزووتنەوەی چەکداری کـوردو دواتـریش لێکترازانـی ریزەکـانی بزووتنـەوەی کوردو زنجیرە کودەتا یەك لەدوا یەکەکانی نێو دەسـەلاتی رامیـاری عـیراق‌و کاریگەریـەکانی لەسـەر پرۆسێسـەکانی جـەنگ‌و دانوسـتانەکانی نێـوان سەرکردایەتی کـوردو حکومەتـەکانی عـیراق‌و ئـەو ئاکامانـەی کـەلێیان کەوتەوە، تێکڕای ئـەو بابەتانـە، خسـتنەڕوو وەلێکدانـەوەو بـەراوردکردن‌و هەڵسەنگاندی بابەتیانـە دەخوازێـت، ئـەم توێژینەوەیـەش هەوڵێکـە لـەو پێناوەدا.

## ئامانجی توێژینەوەكە

ئامانجی توێژینەوەكە بریتییە لەخستنەڕوو و دەستنیشانكردنی بنەما تیۆرییەكانی دیپلۆماسیەتو دانوستانو بایەخی لەڕاییكردنی پەیوەندییە رامیاریەكانداو خستنەڕووی رەوشی رامیاری عێراقو باشووری كوردستان لەنێوان سالآنی (١٩٢١-١٩٦٨)داو باری رامیاریو یاساییو رەوتی مێژوویی وتووێژەكانی نێوان سەركردایەتیی كوردو حكومەتەكانی عێراق بەتایبەتیو لێكدانەوەی ناوەڕۆكی پرۆژەی وتوێژەكانو چۆنێتی ئەنجامدانیانو ئامانجەكانی هەردوو لایەنی پەیوەندیدارو ئەو رێوشوێنو ئامرازانەی كەلەو بوارەدا بەكاریان هێناوەو هۆكارەكانی پەنابردنیان بۆ رێوشوێنی دیپلۆماسیو ئاكامی وتووێژەكانو دەستنیشانكردنی پەیوەندی نێوان هۆكاری رووداوەكانو ئەنجامەكانیانو كاریگەری هەردوو شێوازی خەباتی رامیاریو چەكداری گەلی كورد لەسەر هاوكێشەی ململانێی، كە لەئەنجامی داگیركردنی باشووری كوردستانو بەزۆر لكاندنی بەدەولەتی تازە دامەزراوی عێراقەوەو خەباتی گەلی كورد لەپێناو بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییو نیشتمانیو دیموكراسیەكانیدا هاتۆتە كایەوە. ئەم توێژینەوەیە هەولێكە بۆ نووسینەوەی چەمكێكی مێژووییو دیپلۆماسیەتی كوردیو هەلسەنگاندنی ئەو وتووێژانەی سەركردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی كورد لەو قۆناغەدا كە لەگەڵ دەسەلآتدارانی عێراقدا ئەنجامیان داوە، چونكە ئەو بابەتە تا ئێستا نەبۆتە ئامانجی هیچ توێژینەوەیەكی ئەكادیمیی سەربەخۆ.

## رێبازی توێژینەوەكە

بەرەچاوكردنی بوارو سروشتی زانستی بابەتەكەو، بەمەبەستی ئەنجامدانی توێژینەوەكەو گەیشتن بەئامانجە زانستییەكانی، بەگونجاومان زانی كە رێبازی گشتگیری یان پێكهاتە بەكار بهێنین، ئەوەش بەكەڵك

وەرگرتن لەچەند ڕێبازێکی زانستی وەکو ڕێبازی وەسفی مێژوویی‌و ڕێبازی شیتەلکاری‌و ڕێبازی بەراوردکاری، چونکە هەنگاوە زانستییەکانی ئەنجامدانی توێژینەوەکە وا دەخوازێت کەرەوتی مێژوویی ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە بخرێتە ڕوو وەلێکدانەوەو هەڵسەنگاندن بۆ هۆکارو ئەنجامەکانی‌و بەراوردکردنی نێوان پرۆسەکانی وتووێژکردن لەقۆناغە جیاجیاکانی نێو چوارچێوەی ماوەی بابەتی توێژینەوەکە ئەنجام بدرێت.

## کێشەی توێژینەوەکە ( هۆکارەکانی هەڵبژاردنی بابەتەکە )

هۆکارە سەرەکیەکانی هەڵبژاردنمان بۆ بابەتی توێژنەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی توێژینەوەیەکی زانستی تایبەت‌و سەربەخۆ بەو بوارە لەو چوارچێوە مێژووییەدا کەڕێبازی توێژینەوەی زانستی وەکو پێویست تێدا بەکارهاتبێت لەبەرئەوە هێشتا وەڵامی زۆر پرسیاری زانستی تایبەت بەو بوارە نەدراوەتەوە، لەم ڕوانگەیەوە وێڕای بەهەندوەرگرتن‌و بایەخی زۆری هەموو نووسینەکانی پێشووتر لەو بارەیەوە، هێشتا ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی زانستی‌و سەربەخۆ لەڕێگەی خستنەڕوو وە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندن‌و بەراوردکردنی بابەتەکەمان بەپێویست زانی.

## ئاستەنگەکانی توێژینەوەکە

دیارە ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر بابەتێکی ئاڵۆزو هەمەلایەن‌و لەو چوارچێوە مێژووییە دووورودرێژو پڕ لەڕووداوو گۆڕانکاریانە لەسەر ئاستی نێوخۆیی‌و نێوچەیی‌و نێودەوڵەتیەدا، بەبێ ئاستەنگ نابێت، کە بەلای توێژەرەوە بریتی بوون لەئاستەنگی زانستی‌و خۆی لەزەحمەتی بەدەستهێنانی بەڵگەنامەی مێژوویی پێویست‌و سەرچاوەی زانستی کە بەشێوەیەکی بابەتیانە نووسرابێت دەبینێتەوە، کەدووربێت لەئارەزووی تاکەکەسی‌و حوکمی پێشوەخت‌و خۆبەخستنەوەی توێژەر بەئایدیاو پابەندێتیەکی

رامیاریەوە کەکار بکاتە سەر ئاڕاستەی زانستی توێژینەوەکەی. هەروەها رووداوو گۆڕانکاریو بارودۆخی باشووری کوردستانو عیراق هەمیشە کاریگەریی نێگەتیڤی لەسەر هەموو بوارەکانی ژیان بەگشتیو پرۆسەی زانستی بەتایبەتی بەجێهێشتووە، ئەو کاریگەریەش بەپلەی یەکەم لەسەر خوێندکارانی خوێندنی باڵا دەردەکەوێت. ئاستەنگێکی تر کەشایانی ئاماژە پێدانە بریتیە لەنەتوانینی بەشێك لەتوێژەرانی خوێندنی باڵا (قۆناغی دکتۆرا) بۆخۆ تەرخانکردن بۆ تەواوکردنی پێداویستیەکانی بڕینی ئەو قۆناغە وەکو پێویستو لەماوەی دیاریکراوی خۆیدا، بەهۆی پێداویستی کۆلیجەکانیان بەراژە یان بۆ کاروباری زانستیو کارگێڕی هیچ نەبێت لەم قۆناغەدا.

## پەیکەری توێژینەوەکە

لەبەر رۆشنایی مەرجو پێداویستیە زانستییەکانی رێکخستنو ئەنجامدانی توێژینەوەکە، بەگونجاومان زانی کە لەڕووی پەیکەرییەوە دابەشی بکەینە سەر پێشەکیو شەش بەشو ئەنجامو راسپاردەکانداو، هەر بەشێك چەند باسو داخوازێکی لەخۆ گرتووە.

بەشی بەرایی تەرخان کراوە بۆ توێژینەوە لەبنەما تیۆریەکانی تایبەت بەدیپلۆماسیەتو دانوستان لەڕووی پێناسەو چەمكو مەرجو شەقڵو ئاستەکانیەوە، هەروەها ختنەڕوو و لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ریشەی مێژوویی چالاکی دیپلۆماسیو وتوویژ لەلای چەند نموونەیەکی هەڵبژاردەی دەوڵەتو میرنشینو رابەرایەتیەکانی کورد، وەکو چوارچێوەیەکی گشتیو دەروازەیەك بۆ چوونە ناو بابەتە سەرەکییەکەوە، ئەوەش لەروانگەی ئەنجامدانی توێژینەوەکە لەباسکردنی گشتیەوە بۆ باسکردنی تایبەت کەبریتیە لەباشووری کوردستانو عیراق لەساڵانی (١٩٢١-١٩٦٨)دا.

لەبەشی یەکەمدا باس لەبابەتگەلێك کراوە وەکو دامەزراندنی دەوڵـەتی عیراق‌و دانانی دەستوری ساڵی (١٩٢٥)و یەکلاکردنەوەی کێشەی باشـووری کوردستان (ویلایەتی موسڵ) لەڕێگەی لکانـدنی بەعیراقـەوە بـەبڕیارێکی نێودەوڵەتی‌و هەڵوێستی رابەرایەتی‌ی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کـوردی ئـەو قۆناغە (شێخ مەحمودی حفید) لەڕووداوەکانی ئەو سەردەمە بەگشتی‌و تاج لەسەرنانی فەیسەڵ‌و دانـانی دەسـتورو چارەنووسـی باشـووری کوردسـتان بەتایبـەتی‌و وتووێـژەکانی نێوانیـان لەگـەڵ حکومەتـەکانی عـیراق‌و بەریتانیاداو هۆکارو ئەنجامەکانی، هەروەها باسکردنی وتووێـژەکانی نێـوان رابـەرانی بزووتنـەوە رزگاریخوازیـە کوردیـە چـەکداریەکانی بـارزان‌و دەسەڵاتدارانی عیراق‌و بەریتانی.

بەشی دووەم تـەرخان کـراوە بـۆ لێکۆڵینـەوە لەوتووێـژەکانی قۆنـاغی فـەرمانڕانی (عبـدالکریم قاسـم) لـە (١٤/٧/١٩٥٨-٨/٢/١٩٦٣). لەڕووی تاووتوێکردنی پرسی گۆڕانکاری عیراق لەسـاڵی (١٩٥٨)دا لەبـەر رۆشنایی چەمکی شۆڕش‌و کودەتاو، هەڵوێستی کورد لەحکومـەتی نـوێ‌و هەڵوێستی حکومەت لەگەلی کـوردو مافـەکانی‌و بـاری دەسـتوریی گـەلی کـورد لەدەسـتوری کـاتیی سـاڵی (١٩٥٨)داو وتووێـژەکانی نێـوان سەرکردایەتیی کوردو حکومەت لەو قۆناغەداو داخـوازی‌و بـاری سـەرنج‌و هەڵوێسـتی هـەردوو لایـەنی پەیوەندیـدار لەیـەکتری‌و هۆکـارو ئامـانج‌و ئاستەنگ‌و ئەنجامەکانی ئەو وتووێژانەو کاریگەرییان لەسەر پەیوەندیەکانی نێوانیان. هەروەها بـاس لەراگەیانـدنی بزوتنـەوەی چـەکداری رزگـاریخوازی نەتەوەیی کوردی سـاڵی (١٩٦١)ی باشـووری کوردسـتان کـراوە، لـەڕووی هۆکارو ئامانجەکانی‌و رەنگدانەوەی لەسەر باری گـەلی کـوردو مافـەکانی‌و چارەنووسی حکومەتەکەی (قاسم)، لەتێکڕای ئەو بابەتانـەدا ئامـاژە دراوە بـەرۆڵی فاکتـەرە خـۆیی‌و بابەتییـەکانی هـەردوو ژینگـەی نێوخـۆیی‌و

نێودەوڵەتیو کاریگەریان لەسەر ئاراستەی پەیوەندیەکانیان بەگشتیو وتووێژەکانی نێوانیان بەتایبەتی.

لەبەشی سێیەمدا توێژینەوە لەبارەی وتووێژەکانی نێوان سەرکردایەتی کوردیو حکومەتی عیراقی سەردەمی بەعس (٨/٢/١٩٦٣-١٨/١١/١٩٦٣) کراوەو سیاسەتی بەعس لەبارەی دۆزی نەتەوەیی گەلی کوردو داخوازیەکانیەوەو، باری دەستوری گەلی کورد لەدەستوری (٤/٤/١٩٦٣)داو هەڵوێستی سەرکردایەتی کوردی لەبەرامبەرداو هۆکارەکانی پەنابردنیان بۆ دانوستانو پرۆژەکانیان لەو بارەیەوەو هۆکارەکانی سەرنەگرتنی وتووێژەکانیانو ئەو ئاکامانەی کەلێی کەوتەوە تاووتوێکراوە.

لەبەشی چوارەمدا، لێکدانەوەو هەڵسەنگاندن بۆ پەیوەندیەکانی نێوان سەرکردایەتی کوردیو حکومەتی عیراقی سەردەمی سەرۆك کۆمار (عبدالسلام عارف) کراوە، لەڕووی هەڵوێستی سەرکردایەتی کوردی لەپرسی لەکارخستنی دەسەڵاتی بەعسو هاتنە سەرکاری (عارف)و هەڵوێستی حکومەتی نوێ لەگەلی کوردو داخوازیەکانیو باری دەستوری گەلی کورد لەدەستوری (٢٢/٤/١٩٦٣)و (٢٩/٤/١٩٦٣)و هەڵوێستی گەلی کورد لەبەرامبەرداو تاووتوێکردنی پرۆژەی وتووێژەکانی نێوانیانو ئاڕاستەی بەرێوەچوونی پەیوەندیەکانو دەستنیشانکردنی هۆکارو ئامانجو ئاکامی وتووێژەکانو کاریگەری فاکتەرە نێوخۆییو نێودەوڵەتیەکان لەو بارەیەوە لەسەر هەریەك لەدوو لایەنە پەیوەندیدارەکە.

بەشی پێنجەم تایبەتە بەخستنەڕوو وەلێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو باڵەکەی نێو سەرکردایەتی کوردو حکومەتی عیراقی سەردەمی سەرۆك کۆمار (عبدالرحمن عارف). لەڕووی تاووتوێکردنی ناوەڕۆکی پرۆژەکانی وتووێژکردنو هۆکارەکانی ئەنجامدانیو

خاڵەکانی ڕێککەوتن یاخود دژیەکی لەنێوانیانداو کاریگەری ژینگەی نێوخۆیی‌و دەرەکی لەسەر ڕەوتی پەیوەندیەکانیان‌و بارو پێگەی هەر لایەنەیان‌و ئاکامی وتووێژەکان‌و کاریگەریان لەسەر باری تایبەتی باشووری کوردستان‌و باری گشتی عیراق.

توێژەر لەئەنجامی خستنەڕوو لێکدانەوەو بەراوردکردن‌و هەڵسەنگاندنی بابەتی توێژینەوەکەدا گەیشتە چەند ئەنجامێك کەپوختەی گرنگترینیان خراونەتە ڕوو.

## سەرچاوەکانی توێژینەوەکە

بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە پشت بەژمارەیەکی گونجاو لەسەرچاوەی زانستی‌و مێژوویی هەمە چەشن، بەزمانەکانی کوردی‌و عەرەبی‌و ئینگلیزی بەستراوەو بەشێوازی جۆراوجۆر کەڵکیان لێوەرگیراوە، لێرەدا پوختەی گرنگترینیان وەکو نموونە دەخەینە ڕوو، لەوانە ئەو سەرچاوانەی کەتایبەتن بەبواری تیۆری دیپلۆماسیەت‌و دانوستان: (د. فاضل زكي، شوقي ناجي جوادو عباس غالي ابو التمن، د. فؤاد شباط، د. زايد عبيدالله مصباح، السفير عبدالفتاح شبانة، د. اسماعيل صبري مقلد، د. كاظم هاشم نعمة، د. سموحي فوق العادة، السيد عليوة).

بۆ چالاکی دیپلۆماسی لەسەردەمی دەوڵەت‌و میرنشین‌و ڕابەرانی بەشێك لەبزووتنەوە ڕامیاری‌و چەکداریەکانی کورددا تا ساڵی (١٩٢١) وەکو چەند نموونەیەکی هەڵبژاردە ئەم سەرچاوانە کەڵکیان لێوەرگیراوە: (شەرەفنامە، محمد امين زكي، عبدالرقيب يوسف، د. كاوس قفطان، لازاريف، محمد حەمە باقی، د. جەلیلی جەلیلی، صالح محمد امين، نەوشیروان مصطفى امين، صالح قفطان، د. عبدالله محمد علیاوەیی، نازناز محمد عبدالقادر، و ......هتد).

لەو یاداشتنامەو سەرچاوە بایەخدارانەی لێرەدا بەکارهاتوون بریتین لەیاداشتنامەو نووسینی کەسانی ئاگادار یان بەشداربوو لەلایەنێکی

روداوەکانی ئەو سەردەمانە وەکو سەرچاوەکانی تایبەت بە(احمد تەقی، ئەدموندز، بیل، سۆن، دانا ادمز شمیدث، رفیق حیلمی، عبدالعزیز یاملکی، سەجادی، شێخ لەتیفی حەفید. فؤاد عارف، محسن دزەیی، عبدالکریم فرحان، عبدالله احمد رسول پشدەری، علی کمال عبدالرحمن، هانی الفکیکیو....هتد).

ئەو سەرچاوانەی کەوێڕای لێکدانەوەو باری سەرنجی نووسەرەکانیان، هەریەکەو دەقی ژمارەیەك بەڵگەنامەی تێدا بلاوکراوەتەوەو بایەخی زۆریان هەیە وەکو (شازین هێرشو نزار محمد، مسعود بارزانی، محمد امین زکي، عبدالرزاق الحسنی، جرجیس فتح الله، د. کمال مظهر احمد، جلال تاڵەبانی، صدیق صالح، ابراهیم جلال، مەحمود الدرة، د. سعد ناجي جواد، حسن العلوي، د. مارف عمر گوڵ، د. علي کریم سعید، منذر الموصلي، د. ولید حمدي، د. عبدالفتاح البوتاني، لیث الزبیدي، د. عادل البلداوي، ماجد عبدالرضا، حبیب محمد کریم، دیڤید ماکداول، شلومو نکدیمون، کریس کۆچێرا، د. گۆینتەر دیشنەر)، وەتێزەکانی ماستەری هەریەك لە: (شۆڕش حسن عمر، عبدالرحمن البیاتی، میڤان البادی، محمد عبدالله کاکە سور، عزیز البارزاني، طالب عبدالجبار حیدر، کریم مراد عاتي).

وەبۆ دەقی دەستورەکانی عیراق (١٩٢٥، ١٩٥٨، ١٩٦٣، ١٩٦٤) پشتم بە (د. رعد الجدة) بەست کەتایبەتە بەدەقی ئەو دەستورانە، وێڕای پەرتووکەکەی (د. حمید الساعدي)، بەلام لەبواری لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی ئەو دەستورانە لەگەڵی کوردو مافەکانی وێڕای (د. محمد عمر مولود)و (د. محمد هماوندی) پتر کەڵکم لەماستەرنامەکەی (شۆڕش حسن عمر) وەرگرت.

هەروەها بۆ پتر دەوڵەمەندکردنی زانستیی توێژینەوەکەو لەسنووری توانادا ژمارەیەك لەپەرتووك بەزمانی ئینگلیزی لەباری مێژووی کوردو

باری سیاسیی عیراقەوە بەکار هاتووە، وێڕای چەند بابـەتێکی لـەو چەشـنە لەسـەر تـۆڕی زانیـاری نێودەوڵـەتی (ئینتـەرنێت) بـەزمانی ئینگلیـزیو عەرەبی.

# بەشی یەکەم

## دانوستانەکانی رابەرایەتی کوردو حکومەتەکانی عیراق و دەسەڵاتدارانی بەریتانیا لەقۆناغی فەرمانرەوایی پاشایەتیدا

## ( ١٩٢١-١٩٥٨ )

دانوستان[*] لایەنێکی گرنگی هاوکێشەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان (هاوکاری،کێشمەکێش، و ململانێ) پێکدەهێنێت[**]، چونکە پرۆسەیەکە شیاوی ئەوەیە کە لەسایەی هەمو هەلومەرجێکدا بەکاربرێت، ئەگەر بەئەندازەی جیاوازیش بێت.

دانوستان کرۆکی دیپلۆماسیەت پێکدەهێنێتو زۆرجار لایەنە پەیوەندیدارەکان لەسەرەتاوە پەنای بۆ دەبەن. ئەگەر لەو رێگەیەوە سەرکەوتوو نەبوون، لەوانەیە پەنا بەرنە بەر رێوشوێنی تر وەکو توندوتیژیو رێوشوێنی سەربازی، بەڵام بۆ راگرتنی جەنگو یەکلایکردنەوەی کێشە

---

[*] لەزمانی کوردیدا زاراوەکانی وەکو (دانوستان، دانو ستان، گفتوگۆ، پێکەوە دوان)و لەزمانی عەرەبیدا (مفاوضة، مباحثة، تعامل، تدبیر أمر)و لەزمانی ئینگلیزیدا (Negotiation) بەکاردەهێنرێت. بۆ نمونە بڕوانە، گیوموکریانی، الباکورة، ج١، ط١، مطبعة ناوخۆش، فەرهەنگی ئۆکسفۆرد ئینگلیزی-کوردی، چ١، بلاوکرنەوەی نووسینگەی التفسیر، چاپخانەی نازە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٢٢٦. سردار عزیز خۆشناو، خەرمانەی یاسا، چ٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٩، ل ١٩٨. د. ابراهیم اسماعیل الوهب، القاموس القانوني انکلیزي-عربي، ط١، شرکة الطبع والنشر الاهلیة، بغداد، ١٩٦٣ ل ١٩٥، حارث سلیمان الفاروقي، المعجم القانوني عربي-انکلیزي، ط٣، مکتبة لبنان للنشر والطبع، بیروت، ٢٠٠١، ص ٣٢٨، جون ورتبات وهارڤی پورتر، قاموس انکلیزي- عربي وعربي-انکلیزي، مکتبة لبنان، ١٩٩٦، ص ٢٥٦.

[**] بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. کاظم هاشم نعمة، العلاقات الدولیة، شرکة ایاد للطباعة الفنیة، بغداد، ١٩٨٧، ص ص ٩-١٦.

هەڵپەسێردراوەکان دەشێت جارێکیتر پەنا بۆ رێوشوێنە دیپلۆماسیەکان ببرێتەوە وەکو رێگە چارەیەکی ئاشتیانە، لەبەر رۆشنایی ئەو راستیەیە کەگوتراوە "کاتێك دیپلۆماسیەت بێ دەنگ دەبێت تۆپەکان دێنە گۆ.. وەجەنگ درێژەپێدەری یان تەواوکەری هەوڵی دیپلۆماتەکانە بەشێوازێکی تر"[1].

دیپلۆماسیەتیش وەکو ئاماژەیەك بۆ چەندین واتای جیاواز بەکاردەهێنرێت کەدانوستانو رێورەسمەکانی یەکێکیانە[2].

راستە دانوستان بوارێکی هەرە سەرەکی ئەركو چالاکی دیپلۆماسی پێکدەهێنێت[3]، لەگەڵ ئەوەشدا بەئەندازەیەك لەیەکەوە نزیکن کەهەندێك جار هەردوو زاراوەکە بەیەك واتا لێکدەدرێتەوە یان کاری دیپلۆماسی تەنها لەدانوستاندا چڕ دەکرێتەوە وەکو لەم پێناسەیەدا دەردەکەوێت،

---

[1] السفير عبدالفتاح شبانة، الدبلوماسية، ط١، الناشر مكتبة مدبولي، عربية للطباعة والنشر، القاهرة، ٢٠٠٢، ص ص ٧، ٩.

[2] د. فواد شباط، الدبلوماسية، ط٢، مطبعة جامعة دمشق، ١٩٩٨، ص ١٠.

(دانوستانی راستەوخۆ) یەکێکە لەرێوشوێنەکانی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی ململانێکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە: د. عصام جميل العسلي، دراسات الدوليه، ط١، مطبعة اتحاد الكتاب العربي، دمشق، ١٩٩٨، ص ص ٧٩-١١٦. د. جابر ابراهيم الراوي، المنازعات الدولية، ط١، شركة اياد للطباعة الفنية، بغداد، ١٩٨٧، ص ص ٧٣-١٠٩، د. عصام العطية، القانون الدولي العام، ط٥، بغداد، ١٩٩٣، ص ص ٤٢١-١٣٦.

[3] بڕوانە: السفير عبدالفتاح شبانة، س پ، ل ٢٦. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: د. كاظم هاشم نعمة، س پ، ل ل ٩-١٦.

"دیپلۆماسیەت بریتیە لەدانوستانی نێوان دوو دەوڵەت یان پتر بەمەبەستی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نێوانیان، یان زەمینە خۆشکردن بۆ گەیشتن بەرێککەوتنێکی نێودەوڵەتی"[٤].

لەپێناسەیەکی تردا هاتووە "دیپلۆماسیەت بەواتا باوەکەی بریتیە لەپرۆسەی نزیککردنەوەی نێوان دیدگا دژ بەیەکەکان لەرێگەی دانوستانەوە"[٥].

دیپلۆماسیەتو دانوستان وەکو دیاردە کۆنە[*]و تەنها ئەو لایەنانە ناگرێتەوە کە کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی تەواویان هەیە، بەڵکو قەوارەی تریش دەگرێتەوە کە کەسایەتی یاسایی نێودەوڵەتی تەواویشیان نیە، بەلام لەیەکە نێودەوڵەتیە کاراکانی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان دەژمێردرێنو نوێنەرایەتی گەلانو کۆمەڵەکانیان دەکەن، وەکو رێکخراوو بزووتنەوە رزگاریخوازیە نیشتمانیەکان[٦].

لێرەوە دەکرێت ئەو پرسیارە بخەینە روو، ئایا دەشێت دانوستانەکانی نێوان سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردی بێ دەوڵەتو حکومەتەکانی عیراق لەچوارچێوەی مێژوویی ئەم توێژینەوەیەدا بەدیپلۆماسیەت بژمێردرێت چ وەکو دیاردە یان وەکو سستمو رێکخستن؟

---

[٤] د. سموحی فوق العادة، الدبلوماسیة الحدیثة، ط١، ١٩٧٣، ص ص، ٢-٦.

[٥] لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە، د. زاید عبیدالله مصباح، الدبلوماسیە، ط١، دار الجیل، بیروت، ١٩٩٩، ص ٢٥.

[*] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، د. شوقی ناجي جواد واخرون، التفاوض مهارة واستراتیج، ط١، مطبعة الفنون، بغداد، ١٩٩١، ص ٣١.

[٦] بۆ زانیاری پتر بڕوانە، د. زاید عبیدالله مصباح، س پ، ل ٢٥.

بەبۆچوونی ئێمە دەشێت وەڵامی ئەو پرسیارە بەئەرێ بدەینەوە بەپشت بەستن بەدوو بەڵگە:

یەکەمیان ئەوەیە کەگەلی کورد هەرچەندە لەوماوەیەدا خاوەنی دەوڵەت نەبووە، بەڵام کەسایەتی یاسایی نێونەتەوەیی هەیە[٧]، دووەمیان بۆچوونی هەندێك لەتوێژەران لەم بارەیەوەو ئێمەش بەپەسەندی دەزانین کەپێیان وایە دەشێت وێڕای دەوڵەت ئەو دانوستانانەی کەئەو یەکە کارا نێودەوڵەتیانەی لەخوار ئاستی دەوڵەتەوە ئەنجامی دەدەن وەکو رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان، کۆمپانیاکان، پارتە رامیاریەکانو... هتد، بەرواڵەتی دیپلۆماسیەت وەکو دیاردەو سستمو رێکخستن بژمێردرێت،[٨] بەتایبەتی ئەگەر ئەو راستیە رەچاو بکەین کەگەلی کورد جگە لەپارتی رامیاریو پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی بزووتنەوەکەی، خاوەنی قەوارەی نیمچە سەربەخۆ بووە لەفۆرمی شانشینیدا، بۆنمونە لەسەردەمی شای کوردستان شێخ مەحمودی حەفیددا.

پشت بەست بەو خاڵانەی ئاماژەیان پێکرا دوو پرسیاری سەرەکی دەخەینە روو تاوەکو لەبەر رۆشناییاندا دواتر لایەنێکی بنچینەیی بابەتەکە شی بکەینەوە، ئەوانیش بریتین لە:

١-جۆری ئەو بابەتو کێشانە چیبوون کەهەردوو لایەن (سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لەباشوری کوردستانو حکومەتەکانی عیراق) دانوستانیان لەسەر دەکرد؟

---

[٧] د. مارف عومەر گوڵ، کێشەی کەسایەتی یاسایی نێونەتەوەیی گەلی کورد، چ١، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ل ١١٤-١١٧.

[٨] د. زاید عبیداللە مصباح، س پ، ل ٢٩.

**٢-تا چ رادەیەك ئامانجە راگەیاندراوەكانیان ئامانجـە راسـتەقینەكانیان بووە بۆ چوونە ناو پرۆسەی دانوستانەكانی نێوانیانەوە؟**

**لەبــەر رۆشـــنایی چـــەمكو پێناســـەكانی دانوســـتانەوە دەردەكـــەوێت كەكۆمـــەڵێك تـــوخمو مـــەرجی دیـــاریكراو لـــەخۆ دەگرێـــت كـــەتێكرا چوارچێوەیەكی گشتی بۆ پرۆسەی دانوستان پێكـدەهێنێت[9] و گرنگترینیـان بریتین لە:**

**-لەڕووی لایەنە دانوستكارەكانەوە قەوارەو ئاستی جیاجیا لەخۆ دەگرێت وەكو تاكەكان، پارتو گروپو رێكخراوی رامیـاریو كۆمپانیـاو دەوڵـەتو رێكخراوە نێودەوڵەتیەكان بەهەموو جۆرەكانیانەوە[10]، ئەم وێـڕای بزووتنـەوە رزگاریخوازیـە نیشـتمانیەكان. لەلایـەكی تـرەوە دانوسـتان پرۆسـەیەكی دوورودرێژو ئاڵۆزەو چەندین هەنگاو لـەخۆ دەگرێـتو بەچـەندین قۆناغـدا تێپەر دەبێت[11].**

**لەبەر رۆشـنایی ئـەو زانیاریانـەدا لـەوە دەكۆڵینـەوە كـە لەمیانـەی پرۆسیسی دانوستانی نێوان سەركردایەتی رامیاری كـوردو حكومەتـەكانی عیراقدا تا چەند ئەو قۆناغە پەیڕەو كراوە.**

---

**[9] بۆ زانیاری لەوبارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، د. شوقی ناجی جواد واخرون، س پ، ل ٤٥.**

**[10] بڕوانە، هـ س، ل ل ٤٦-٤٧.**

**[11] بۆ زانیاری پتر لەوبارەیـەوە بـۆ نمونـە بڕوانـە، د. اسماعیـل صبري مقلـد، العلاقـات السیاسیة الدولیة دراسة الاصول والنظریات، ط٣، مطبوعات جامعـة الكویـت، ١٩٨٤، ص ص ٤٣٨-٤٤٠. د. فاضل زكي، الدبلوماسـیة في عـالم مـتغیر، دار الحكمـة للطباعـة والنشر، بغداد، ١٩٩٢، ص ص ٤٧٦-٤٨١. د. شوقي ناجي جواد واخـرون، س پ، ٥٨-٦٤.**

لەڕوانگــەی دەستنیشــانکردنی مــەرج و شــەقڵەکانی دانوســتان و دانوســتکاری ســەرکەوتووەوە، دیــارە دیپلۆماســیەت و دانوســتان هاوکــات زانست و هونەریشە[12]، بەڕای پســپۆڕانی ئــەو بــوارە زانســتیە ســەرکەوتنی پرۆسەکان بەندە بەوەی تا چەند بەپێی کۆمەڵە پرنسیپێکی دروست بــەڕێوە دەچن تاوەکو ئامانجەکانی خۆیان بپێکن[13].

لەمیانــەی ئــەو بۆچــوونانەی خرانــە روو دەردەکــەوێت کەســەرکەوتنی دانوستان بەندە بەرەخســانی زەمینەیــەکی لــەبار کەهەلومــەرجی خــۆیی و بابەتی تایبەت بەخۆی هەیەو پێگەیاندنی ئەم جۆرە پسپۆرانەش پێویســتی بەکۆمەڵێك مەرج و ئامادەباشی هەمەچەشن هەیە، کەبەشێکیان خۆڕســك و ئەوانی تر خەسڵەت و کارامەیی بەدەستهاتوون.

لەبەر رۆشنایی ئەوانەی کەخرانە روو دەپرسین تا چ ئەندازەیەك پرۆسیسی دانوستانەکانی نێوان سەرکردەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردو حکومەتەکانی عیراق زەمینەو شەقڵەکانی دانوستانی سەرکەوتوویان تێدابووە؟ هەروەها تــا چ ئەندازەیــەك دانوســتانکاری مــەرج و شــەقڵەکانی دانوستاکاری سەرکەوتوویان تێدا بووە؟

---

[12] بڕوانە، د. سموحي فوق العادة، الدبلوماسية والبروتوكول، دمشق ١٩٦٠، ص١.

[13] لەوبارەیەوە بڕوانە، د. فاضل زکي، س پ، ل ل ٤٨١-٤٩٤. السفير عبدالفتاح شبانة، س پ، ل ل ٤١-٤٩. د. ضرغام عبدالله الدباغ، ثورة العمل الدبلوماسي في السياسة، ط١، دار افاق عربية للصحافة والنشر، بغداد، ١٩٨٥، ص ص ١٧، ١٩، ٩٠-٩٤. د. شوقي ناجي جواد واخرون، س پ، ل ل ٧١-١٠٤. د. فواد شباط، س پ، ل ل ١١٤-١٢٢. د. اسماعيل صبري مقلد، س پ، ٤٢٨-٤٣١. ص ص ٨٨-٩٧. د. عبدالعزيز محمد سرحان، قانون العلاقات الدبلوماسيه والقنصليه، ب م، ١٩٧٤، ص ص ٤-٧. د. سموحي فوق العادة، س پ، ل ل ١٤-١٩.

زۆرێـك لەڕابـەرانی كـورد ، لـەپێناوی رزگـاربوون لەسـتەمی هـەردوو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی بەهیوا بوون پشتیوانیی دەوڵەتانی وەكو روسـیاو بەریتانیا بەدەست بهێنن، لەبەر ئەوە پەیوەندیان لەگـەڵ دەكـردن، یـەكێك لەوانـە (شـێخ مـەحمودی حەفیـد) بـوو كـە(حكومـەتی كوردسـتان)ی لەسلێمانی لەسێ دەورانی پچڕ پچڕدا لـەنێوان سـاڵانی (١٩١٨-١٩٢٤)دا پێكهێنا[١٤].

[١٤] بڕوانە، صدیق صالح، حكومەتی كوردستان لەسلێمانی ١٩١٨-١٩٢٤، پوختەی پێشینەو مێژوو، هەفتەنامەی سلێمانی نوێ، زنجیرەی هەشت، سلێمانی ٢٠٠٣، ل ل ٧-٨. د. عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة، ط١، طبع ونشر مكتب التفسير، مطبعة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٣، ص ٢٩٠.

## باسی یەکەم
## چالاکیی سیاسیی و دیپلۆماسیی سەردەمی شێخ مەحمودی حەفید

(شێخ مەحمود) هەر لەپێش بەرپابوونی یەکەمین جەنگی جیهانو لەمیانی جەنگەکەشدا چەند جارێك پەیوەندیی لەگەڵ هەندەراندا دامەزراند[15]، سەرەتای نامەگۆڕینە لەگەڵ لێپرسراوانی روسیادا لەرێگەی (ئارلۆڤ)ی کونسوڵی گشتی روسیاوە لەبەغدادو (کیرسانۆڤ)ی کۆنسولیان لەشاری موسڵدا ئەنجامدراو[16] دواتریش لەگەڵ جەنەراڵ (بەرانۆڤ)دا[17].

هەروەها بەنامە پەیوەندیی بەئینگلیزەوە کردو ئەوانیش پاش گەیشتنی هێزەکانیان بۆ کفری راستەوخۆ نامەیان بۆ ناردو دواتر کاپتن (نوئێل) یان ناردە سلێمانی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیدا[18].

لەسەروبەندی کارکردن بۆ پێکهێنانی لیژنەی دیاریکردنی سنووری نێودەوڵەتیی نێوان ئێرانو تورکیا لەساڵی (١٩١٣)دا (شێخ مەحمود)

---

[15] بڕوانە: عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية التربية، جامعة المستنصرية، بغداد، ٢٠٠٤، ص ٥٣.

[16] بڕوانە: د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ت: محمد الملا عبدالكريم، ط٢، دار افاق عربية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٨٤، ل ل ٦٤، ١٠٧، ١٧٣.

[17] بۆ دەقی نامەکانو وەڵامی شێخ مەحمود بڕوانە: شێخ لەتیفی حەفید، یاداشت، ساغکردنەوەی کەمال نوری معروف، چ١، ب ش، ١٩٩٥، ل ل ٢٨-٣٢.

[18] بڕوانە: د. كمال مظهر احمد، س پ، ل ٢٠١، شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ٣١.

یاداشتێکی پێشکەش بەلیژنەکە کردو بۆ چەند جارێك سەردانی کردن[19].
هەر بەمەبەستی بەدەسهێنانی هاوکاری‌و پشتیوانی دەوڵەتان‌و لایەنە نەیارەکانی دەوڵەتی عوسمانی، هەر لەوساڵەدا پەیوەندی بە بەدرخانیەکانەوە کردو هەولێدا لەگەڵ هەردوو کوڕی بەدرخان پاشادا (کامل بەگ‌و حسێن بەگ) رێککەون بۆ خەباتکردن لەپێناوی رزگاریی کوردستاندا[20].

هەر لەسالانی ئەو جەنگەدا پەیوەندی بە (حسێن) شەریفی مەککەو کوڕەکانیەوە کردو لەنامەکانیدا پێشنیازی هاوکاریکردنی یەکتری بۆ کردن لەخەباتیاندا دژ بەدەسەلاتی (یەکێتی‌و پێشکەوتن)ی تورکەکان کەدژایەتی سەرسەختی گەلانی ژێر دەسەلاتی تورکیان دەکرد، بەلام ئەم پەیوەندیکردنە ئاکامێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوە[21].

(شێخ مەحمود) پاش ئەوەی کەیەکەمین حکومەتی کوردستانی لە(١٩١٨/١١/١٧)دا بەسەرۆکایەتی خۆی پێکهێنا، دوو نامەی بەناوی حکومەتەکەوە بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز: کۆلۆنێل ئارنۆڵد (ویلسن)ی بریکاری حاکمی گشتی لەعیراقدا بە(سەید محسن ئاغا)دا لەکفری‌و (جەنەراڵ مارشاڵ)ی فەرماندەی هێزی ئینگلیز لەکەرکوك بەهۆی (عبدالله صافی یعقوب)ەوە ناردو داوای لێکردن کە یان ناوچەکەی بدەنە دەست یان خۆی وەك نوێنەری ئەوان حوکمی بکات[22]. دواتر (شێخ مەحمود) نامەیەکی

---

[19] بڕوانە: شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ٢٢-٢٣، ٣٥.

[20] بڕوانە: د.کمال مظهر احمد، س پ، ل ١٠٧.

[21] بڕوانە: هـ س، ل ٢٠٨-٢٠٩.

[22] بڕوانە: صدیق صالح، س پ، ل ل ٢٧-٢٨. رەفیق حیلمی، یادداشت، چ٣. دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٥٤، احمد خواجە، چیم دی، ب١، ب١، چاپخانەی شەفیق بەغداد، ١٩٦٨، ل ١٨.

لەرێگەی شاندێکەوە بەسەرۆکایەتی (احمد فائق توفیق) ناسراو بە(فایەقی تاپۆ)و ئەندامێتی (عیزەتی تۆپچی) واتا (عیزەتی فاتە)و (تایەرەفەندی) ناردە لای کاربەدەستانی ئینگلیز لەکفریو داوای یارمەتیدانی گەلی کوردی لێکردنو دواتر لەئاکامی گفتوگۆکردندا لەسەر حەوت خاڵ رێککەوتنو شێخیش بەڵێنی هاوکاریکردنی پێدان[٢٣]. ئەگەر خاڵەکانی رێککەوتنەکە جێبەجێ بکرایە رەنگدانەوەی باشی لەسەر باری رامیاریی باشوورو رۆژهەلاتی کوردستان دەبوو جیاواز لەوەی کەڕوویدا.

هەر لەدرێژەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەرپرسانی ئینگلیزدا، (شێخ مەحمود) لەناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨)دا پێشوازی لە(مێجەر نوئێل)ی نێردراوی حکومەتی بەریتانی کرد لەسەردانەکەیدا بۆ شاری سلێمانیو نوئێل رایگەیاند:

"لەسەر فەرمایشتی حاکمی گشتی لەبەغدا شێخ مەحمود حوکمداری کوردستانە"[٢٤]، (شێخ مەحمود) هەر لەسەرەتای پەیوەندیەکانی بەئینگلیزەوە داوای لێکردن کەناوی کوردستان لەلیستی گەلانی ئازادیخواز نەسڕنەوە[٢٥].

لەبەرامبەردا ئینگلیز دەیانویست کەڵك لەپێگەو دەسەلاتی (شێخ مەحمود) وەربگرنو هێزی سەربازی خۆیان لەهەرێمەکەدا جێگیر بکەنو

---

[٢٣] بڕوانە: شێخ لەتیف حەفید، س پ، ل ل ٣٦-٣٧، رەفیق حیلمی، س پ. ل ٤٥. لەسەرچاوەکانی بەردەستدا ئاماژە بەدەقی خاڵەکان نەدراوە.

[٢٤] رەفیق حیلمی، س پ، ل ٤٦، احمد خواجە، س پ، ل ل ٢٠-٢٢، شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ٣٩، دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ابوبکر خۆشناو، چاپخانەی روون، ب١، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ٣٢١. جرجیس فتح الله، س پ، ل ١٢٦.

[٢٥] بڕوانە: دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٢١.

بــەهۆی ئــەوەوە سیاســەتی ولاتەکــەیان بەڕێوەببــەن. لــەم بارەیــەوە چــەند هەنگاوێکیان نا[٢٦]، وە لەئاکامی سەردانەکەی (ولسن)دا بــۆ ســلێمانی لــە (١/١٢/١٩١٨)داو گفتوگۆکردنی لەگەڵ (شێخ مەحمود)و شەست کــەس لەســەرەك هۆزەکــانی باشــووری کوردســتان، رێککەوتننامەیــەکی زارەکــی مۆرکرد بۆ دیاریکردنی چــارەنووسو جــۆری پەیوەنــدیان لەگــەڵ دەوڵــەتی بەریتانیاو عیراقی داهاتودا[٢٧]، بەڵام بەپێی ئەوەی حکومەتی بەریتانیا جۆرە مافو پلەو پایەو دەسەلاتێکی بە(شێخ مەحمود)و گەلی کــورد رەوا دەبینــی زۆر کەمتر لەوەی کەچــاوەڕوانی بــوو، بۆئــەم مەبەســتەش لــەئازاری ســاڵی (١٩١٩)دا (نۆئیل) لابراو بــۆ کزکردنــی دەســترۆییو دەســەلاتی (شــێخ)، (مێجەرسۆن) وەك حاکمی رامیاری لەشــوێنی دانــرا[٢٨] لەراســتیدا نــاردنی (سۆن) بــۆ ســلێمانی لــەو هەلومەرجــەدا نیشــانەی گــۆڕانی هەڵوێســتی ئینگلیزبوو بەرامبەر بە(شێخ مەحمود) بەتایبەتیو پرسی کورد لەباشووردا بەگشتی. لەبەر ئەوە شێخ لەگەڵیاندا ناکۆك بوو و رێکنەدەکــەوتو بــڕوای پێنەدەکردنو هیوای پێیان کزبوو[٢٩]، ئەوەش هۆکارێکی هانــدەری ســەرەکی بوو بۆی، تاوەکو دواتر مشوری هاوپەیمانێتی تــر بخــوات بــۆ نمونــە لەگــەڵ

---

[٢٦] بڕوانــە: رەفیــق حیلمــی، س پ، ل ٤٧. د. احمــد عثمــان ابــوبکر، کردســتان في عهــد السلام، ط١، مطبعة اوفسیت اربیل، اربیل، ٢٠٠٢، ل ل ٣٧٤-٣٧٦.

[٢٧] بڕوانە: دیڤید ماکداول، س پ، ل ل ٣٢١-٣٢٢.

[٢٨] بڕوانە: صدیق صــالح، س پ، ل ل ٣٠-٣٤. جــرجیس فــتح الله، یقظــة الکــرد تــاریخ سیاســي ١٩٠٠-١٩٢٥، ط١، مطبعــة وزارة التربیــة، اربیــل، ٢٠٠٢، ل ل ٢١٨-٢٢٤. دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٣١. د. عثمان علی، س پ، ل ٣٧٤.

[٢٩] بڕوانە: رەفیــق حیلمــی، س پ، ل ل ٥٣-٧٥. جــرجیس فــتح الله، س پ، ل ل ٢٢٤-٢٢٥. د. عثمان علی. س پ، ل ٢٧٨.

روسەکان، کەمالیەکان، و ئەمریکا[٣٠]، دیارە لەهەلومەرجێکی وادا گەڕان بەدوای ئەلتەرناتیڤی تردا وەکو پێویستیەکی قۆناغەکە خۆی دەسەپێنێت.

ئینگلیزەکان داواکاریەکانی (شێخ مەحمود)یان بەزیادەڕۆیی‌و دەرچوون لەو چوارچێوەی کەبۆی دیاریکرابوو لێکدەدایەوەو لەگەڵ ئەو ڕێبازەی کە لەگەڵێدا لەسەری ڕێککەوتن یەکناگرێتەوە[٣١].

(شێخ مەحمود) پاش ئەوەی لە (٢٢/٥/١٩١٩)دا بەفەرمانێك دەستەیەکی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەتی کوردستان دەستنیشانکرد، نامەی بۆ سەرخێڵانی سۆران‌و بادینان نووسی‌و داوای پشتگیری‌و هاوکاری لێکردن[٣٢]، هەروەها لە (١٨/٦/١٩١٩)دا نامەی بە(اسماعیل حقی علی ئەفەندی) ناسراو بە(اسماعیل شاوەیس)دا نارد کەنوێنەری شێخ مەحمودو حکومەتەکەی بوو بۆ ئەو گفتوگۆیانە بۆ (جەنەراڵ فرایزەر) لەکەرکوك تا لەنیازیان تێبگات‌و داوای جێبەجێکردنی بەڵێنەکانیان لێبکات، دواتر لەتەلگرافێکدا بۆ (ولسن) هەمان داخوازیەکانی دووپاتکردەوە، بەڵام بێ ئەنجام بوو نوێنەرەکەش بەرپرسیارێتی بەرپابوونی جەنگ‌و ئاکامەکانی خستە ئەستۆی ئینگلیز[٣٣].

---

[٣٠] بڕوانە: د. کمال مظهر احمد، س پ، ل ل ٣٢٣-٣٥٤. جرجیس فتح الله، س پ، ل ٢٢٣.

[٣١] بڕوانە: عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، س پ، ل ل ٩٤-١٠٠. عزیز الحاج، القضیة الکردیة في العشرینات، ط٢، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٠٠.

[٣٢] بڕوانە: احمد خواجە، س پ، ل ل ٣٩-٤٠، صدیق صالح، س پ، ل ٣٧. د. عثمان علی، س پ، ل ٢٧٥.

[٣٣] بڕوانە: احمد خواجە س پ، ل ٣٩، صدیق صالح، س پ، ل ٣٧. شێخ لەتیفی حەفید س پ، ل ٥٧ محمد عبدالله کاکە سور، س پ، ل ل ٣٨-٣٩.

هــەر بەمەبەســتی گەیانــدنی بیروبۆچــوونەکانی بــە (ودرۆ ولســن)ی سەرۆکی ئەمریکا، (تۆفیق فکرت)ی وەك نوێنەری خۆی نارده لای بـاڵیۆزی ئەمریکا لەتاران تاوەکو لەرێگەیەوە ئەو بیروبۆچــوونانە بگەیــەنێت، بــەڵام باڵیۆزەکە ئەنجامدانی دیدارەکەی رەتکردەوە[٣٤].

لە (٢٠/٣/١٩١٩)دا وەکو سەرۆکی حکومەتی کوردستان نامەیــەکی لەرێگەی نوێنەرانی تایبەتی خۆیەوە: (سەید ئەحمــەدی بــەرزنجی)و (ســەید رەشید زەکی کابان)ەوە بۆ سەرۆکایەتی کۆنگرەی ئاشتی جیهــانی لــەپاریس نــاردو تێیــدا داواکاریــەکانی گــەلی کــوردی روونکــردەوەو داوای کۆمــەكو پشتگیری لێکــردن، نامەکــە بــۆ (جەنــەراڵ شــەریف پاشــا) بــوو، تــاوەکو لەرێگەیەوە وەکو نوێنەری کورد لەکۆنگرەکــەدا پێشکەشــی بکــات، بــەڵام نوێنەرەکان نەگەیشتنە جێ، چونکە لەحەلــەب لەلایــەن فەرەنســییەکانەوە رێگەنەدران برۆن بۆ پاریس وەدەستگیر کرانو هێنرانەوە بۆ موســڵو حــوکم دران[٣٥].

هەرچــەندە پەیوەندیــەکانی نێــوان (شــێخ مــەحمود)و دەســەڵاتدارانی ئینگلیــز گەیشــتە بنبەســتو دواتــر رووبەڕووبونــەوەی ســـەربازیو دەستگیرکردنو دوورخستنەوەی (شێخ)ی بۆ هیندستان[٣٦] لێکەوتــەوە، بــەڵام

---

[٣٤] بڕوانە د، کمال مظهر احمد، س پ، ل ٣٢٣.

[٣٥] بڕوانە: رەفیق حیلمی، س پ، ل ٤٩. احمد خواجە، س پ، ل ٢٢. د. کمال مظهر احمد، س پ، ل ل ٣٣٠-٣٣١. شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ٤١-٤٢. صدیق صالح، س پ، ل ٣٢. جرجیس فــتح اللە، س پ، ل ٢٦٠، د. بلــەچ شــێرکۆ، کێشــەی کــورد مێژینــەو ئێستای کورد، و: محەمەد حەمەباقی، ط١، چــاپخانەی شــەهید جەعفــەر، ١٩٨٦، ل ل ١٣٦-١٣٧.

[٣٦] بڕوانە: علی کمال عبدالرحمن، مذکرات، تقدیم وتحقیــق: جمــال بابــان، شــرکة الخنســاء للطباعة، بغداد، ٢٠٠١، ص ص ٥٧-٥٨.

لەبەر چەندین هۆکار بەریتانیا نەیتوانی بەیەکجاری پێگەو رۆڵی لەباشووری کوردستانو عیراقدا فەرامۆش بکات، لەبەر ئەوە لەسەر راسپێری (گۆڵد سمیث) بۆ هێنانەوەی بۆ کوردستان، لە( ١٢-١٣/٩/١٩٢٢) دا هێنرایەوە بەغدادو بۆ ماوەی چەند رۆژێك گفتوگۆی لەگەڵ (سیرپیرسی کۆکس)و (وشا فەیسەڵ) دا کرد[37].

(شێخ) لەرێگەی گەڕانەوەیدا لەشاری سلێمانی، مەزبەتەی بەچەندین شێخو سەرۆك خێڵ مۆرکرد، تاوەکو ببێتە بەڵگەنامەی داواکردنی دامەزراندنی (دەوڵەت) ێکی کوردی بەپێشەوایەتی خۆی[38]، بەڵام لەپاش گەڕانەوەکەی سەرەتا کرا بەسەرۆکی (جمعیەی کوردستان)[39]، بەڵام لەبەرئەوەی جیاوازیەکی ریشەیی لەنێوان تێڕوانینو سیاسەتەکانی ئەو کۆمەڵەیەو شێخ لەلایەكو ئینگلیزو حکومەتی عیراق لەلایەکی ترەوە هەبوو، بەئەندازەیەك کەجگە لەپێکهاتنی نیوەچڵی لەسەر پرسەکانی نێوانیان، ئومێدی چارەسەرێکی ریشەییو دادپەروەرانە بۆ دۆزی نەتەوەیی کورد لەلایەن ئینگلیزەوە تا دەهات کزتر دەبوو، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی شکستهێنانی هەوڵە دیپلۆماسیەکانی نێوانیان بوو کە ئۆباڵی سەرەکی ئەوەش لەئەستۆی ئینگلیزدا بوو. لەبەرئەوە (شێخ مەحمود) لە(٩/١٠/١٩٢٢)دا دووەمین "حکومەتی کوردستانی" پێکهێناو لەدواتردا ناوی ئەندامەکانی کابینەکەی راگەیاند وەدامو دەزگا

---

[37] بڕوانە: احمد خواجە، ل ل ٩٥-٩٧، ٩٩-١٠٠. دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٣٤، صدیق صالح، س پ، ل ٥٣. جرجیس فتح الله، س پ، ل ٢٥٥، د. عثمان علی، س پ ل ٣٩٧.

[38] بڕوانە: صدیق صالح، س پ، ل ٥٩. شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ٨٥-٨٨.

[39] بڕوانە: صدیق صالح، س پ، ل ٦١. دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٣٩.

کارگێڕیەکانی دامەزراندو ئاڵای کوردستانی لەچەند ناوچەیەکی جیاجیادا هەڵکرد[40]و لەمانگی تشرینی دووەمدا خۆی "بەمەلیکی کوردستان" دانا[41].

(شێخ) لەدرێژەی هەنگاوەکانی بەو ئاڕاستەیەی هەنگاوی بۆ نابوو، هەر لەمانگی تشرینی یەکەمی (١٩٢٢)دا دیداری لەگەڵ نێردراوی (ئۆزدەمیر)دا کردو بێ بڕوایی خۆی بەئینگلیزو بەڵێنەکانی پێ ڕاگەیاندو ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاریکردنی تورك لەدژی ئینگلیزو دوورخستەوەیان تا چیای حەمرین دەربڕی[42]. دواتر ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر نامەکانی نێوانیاندا گرتو پەیوەندیەکانیان بۆ ئاشکرا بوو، لەبەر ئەوە هەڵوێستیان لەدژی (شێخ) توندتر کرد[43]. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان (شێخ مەحمودو ئینگلیزەکانو حکومەتی عیراقی) بەیەکجاری دەرگایان لەڕووی هەوڵە دیپلۆماسیەکان دانەخست، بەتایبەتی ئەم دوو لایەنەی دواییان مەبەستیان بو کارێکی ئەوتۆ بکەن پەیوەندیەکانی نێوان (شێخ)و تورکەکان تێکدەنو دەسەڵاتیان لەکوردستاندا نەهێڵن، لەم چوارچێوەیەدا لە (٢/١١/١٩٢٢) شاندێکی

---

[40] بڕوانە: علائەدین سەجادی، مێژووی ڕاپەڕینی کورد، ب ش، ١٩٩٦، ل ل ٦٤-٦٥. احمد خواجە، س پ، ل ل ١١٦-١٢٦. شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ٨٩-٩١. ئەحمەد باوەڕ، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی هاوچەرخی کورد، چ١، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤ ل ٢٣. صدیق صالح، س پ، ل ل ٢٤-٦١. جرجیس فتح الله، س پ، ل ٢٥٧. د. عثمان علی، س پ ، ل ٣٩٧.

[41] بڕوانە: دیڤید ماکداول، س پ ل ٣٣٩.

[42] بڕوانە: صدیق صالح، س پ، ل ٦٤.

[43] بڕوانە: جرجیس فتح الله، س پ، ل ل ٢٥٩-٢٦٠. دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٤١.

کوردی لەگەڵ کۆمیسەری باڵادا لەبەغداد کۆبونـەوەو ئـەم داواکاریانـەیان خستەڕوو[٤٤]:

١-بەڕەسمی ناساندنی سەربەخۆیی‌ی باشووری کوردستان.

٢-دەبێت هەموو ئەو ناوچانەی کەزۆربەی دانیشتوانیان کوردن بەشـێك بێت لەباشووری کوردستان.

٣-پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ دیـاریکردنی سـنووری نێـوان کوردسـتان‌و عێراق.

٤-(شێخ مەحمود) بەپلەی (حوکمدار)ی کوردستان بناسرێ.

٥-ئەو کەسانەی لەخولی دووەمی هەڵبژاردنی ئێستادا هەڵدەبـژێردرێن، کرۆکی ئەنجومەنی نەتەوەیی کوردستان پێکبهێنن.

لەبەرامبـەردا نوێنـەری بـاڵا داوای لەشـاندەکە کـرد کەدەسـتکاری داواکاریەکانیان بکەن، هاوکـات هـەردوو حکومـەتی بـەریتانی‌و عیراقـی بەجۆرێك هەڵوێستیان نواند کەدۆخەکە هێمن بکەنەوە، سەرەتا (نوئێل) لە (١٥/١١/١٩٢٢) نامەیەکی بۆ (شێخ مەحمود) نارد، لەسەرەتای مـانگی کـانوونی یەکەمـدا (نوئێـل)و شـاندی سـلێمانی لەگـەڵ نوێنـەری بـاڵای بەریتانی‌و شا (فەیسەڵ) دا کۆبوونەوە[٤٥]، دواتر هـەردوو حکومەتەکـە لـە

---

[44] بڕوانە: دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٥٣.

[45] بڕوانە: سی جی، ادموندز، کـرد وتـرك وعـرب سیاسـة ورحـلات وبحـوث عـن الشـمال الشرقي في العراق ١٩١٩-١٩٢٥، ترجمة: جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ل ل ٢٧٦.

دیڤید ماکداول، س پ، ل ل ٣٥٣، ٣٥٤. شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ٩٩-١٠٠، عبدالرزاق الحسني، تاريخ الـوزارات العراقيـة، ج١، ط٧، دار الشـؤون الثقافيـة العامـة، بغداد، ١٩٨٨، ص ٢٧٤. د. مـارف عومـەر گـوڵ، پەیوەنـدی..، س پ، ل ل ١٠٧-١٠٨. جـرجيس فـتح الله، س پ، ل ل ٢٦٠-٢٦١. واسـیلی نیکـتین، کـوردو کوردسـتان، و:

(٢١/١٢/١٩٢٢) دا رايانگەياند كەئەوان قايلن كورد لەچوارچێوەی عیراقدا حكومەتێكی كوردی پێكبهێنێتو بۆ ئەو مەبەستەش شاندێكیان سەردانی بەغداد بكات بۆ گفتوگۆكردن لەسەر وردەكاریەكانی، بەلاّم بەكردەوە هیچ هەنگاوێكیان بۆ نەناو بەم شێوەیە سنووری قەلّەمڕەوی حكومەتی كوردستان لەچوارچێوەیەكی بەرتەسكدا مایەوە[٤٦]. هەرچەندە ناوەڕۆكی راگەیاندنە هاوبەشەكەی هەردوو حكومەتەكە بایەخی رامیاریو مەعنەوی خۆی هەبوو، بەلاّم هێشتا لەخواستەكانی ( شێخ مەحمود ) كەمتر بوو، لەبەرئەوەی لە (٢٢/١٢/١٩٢٢)دا شاندێكی ناردە كەركوك بۆ داواكردن لەدەسەلاّتدارانی ئینگلیز تاوەكو بەیاننامەیەك دەربكەن تێیدا سەربەخۆیی كوردستان لەسایەی فەرمانڕانی ئەودا بسەلمێنن[٤٧]، هەرچەندە شاندەكە هەلّوێستی توندو یەكلاكەرەوەبوو، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هاتوچۆی نوێنەرانی (شێخ) بۆ لای دەسەلاّتدارانی ئینگلیز لەكەركوكو بەغداد درێژەی هەبوو[٤٨]، لەكاتێكدا ئەوان هەمیشە جەختیان لەسەر پێویستی ی

---

خالیدی حسامی، (هێدی)، چ١، چاپخانەی زانكۆی صلاح الدین، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٥٨١.

[46] بڕوانە: سی چی. ادموندز، س پ، ل ٢٨١، محمد عبداللە كاكە سور، الدور السیاسي والثقافي للضباط الكرد في الحركة الكردیة في كردستان الجنوبیة ١٩٢١-١٩٤٥. اطروحة ماجستیر غیر منشورة، كلیة الاداب، قسم التاریخ، جامعة صلاح الدین/ اربیل، اربیل ١٩٩٨، ل ٥٢. صدیق صالح، س پ، ل ٢٥. د. مارف عومەر گوڵ، س پ، ل ١٠٨. د. كمال مظهر احمد، كركوك وتوابعها حكم التاریخ والضمیر، ج١، مطبعة رینوین، السلیمانیة، ب س، ص ص ١٤٩-١٥٠.

[47] بڕوانە: عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، س پ، ل ٩٤.

[48] بڕوانە: صدیق صالح، س پ، ل ٧١.

چوونی (شێخ) بۆ بەغداد دەکردەوە[٤٩]، بەڵام ئەم لەنیازیان بەگومان بوو، لەبەرئەوە ملی بۆ داخوازیەکانیان نەداو پاساوی بۆ دەهێنایەوە کەئەو دەسەڵاتی تەواوی بەنوێنەرانی خۆی داوە کەچارەسەری پرسە هەڵپەسێردراوەکان بکەن[٥٠].

تا دەهات (شێخ) ئومێدی بەئینگلیزەکان کزتر دەبوو، وەلەبەرامبەردا پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تورك لەناوچەکەدا پتەوتر دەبوو[٥١]، لەلایەکی ترەوە، لە (١٩٢٣/١/٣٠) دا بەهۆی کونسولی سۆڤێتەوە لەتەوریز لەرێگەی (ئەحمەد خواجە)ەوە، نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی دەوڵەتی سۆڤێتی کردو تێیدا داوای دامەزراندنی پەیوەندیی هەمەلایەنەیی‌و هاوکاریکردنی گەلی کوردی کرد بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی، بەڵام لەدوای مردنی (لینین) نامەکە فەرامۆش کرا[٥٢].

---

49 بڕوانە: س. جی، ادموندز، س پ، ل ٢٨٣-٢٨٥. جرجيس فتح الله، س پ، ل ٢٦٦.

50 بڕوانە: د. وليد حمدي الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، لندن، ١٩٩١، ص ص ١٦٣-١٦٤. جرجيس فتح الله، س پ، ل ٢٦٧. ديڤيد ماكداول، س پ ل ٣٤٠.

51 بڕوانە: احمد تەقی، خەباتی گەلی کورد لەیاداشتەکانی احمد تەقیدا، ئـ: جلال تەقی، چاپخانەی العربیە، بغداد، ١٩٧٠، ل ل ٦٨-٦٩. ناوبراو ئاماژە بەوە دەکات کەئەوان بە (شێخ مەحمود)و دەوروبەرەکەشیەوە لەوبارەیەوە دووربین نەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی بێ ئەندازە لەرەفتاری ئینگلیزەکان بێزاربوون، بەباشیان زانی پەیوەندی بەکەمالیەکان‌و (ئۆزدەمیر)ەوە بکەن. بڕوانە: هـ.س، ل ٦٨. رەفیق حیلمی، س پ، ل ل ٣٥٦-٣٥٧. شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١٣٤-١٣٥.

52 بڕوانە: شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١١٢-١١٣. لەراستیدا نامەکە هەر نەگەیشتە دەست کۆنسۆلی سۆڤێتی تا لەدوای مردنی (لینین) فەرامۆش بکرێت!.

لەسەر ئاستی نێوخۆیشدا شێخ لەمەزبەتەیەکدا بە(سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی کوردستانی باشوور) ناسێنراو لە (١٩٢٣/٢/٢١)دا شاندێکی کوردی بەرەو رەواندوز بەرێ کەوتن[53]، بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ (ئۆزدەمیر)دا.

(شێخ مەحمود) لەژینگەیەکی یەکجار دژوارو نالەباردا کاری دەکرد، لەلایەك ئینگلیز سیاسەتێکی تەمو مژاوی‌و دووفاقی لەبەرامبەر گەلی کوردو مافەکانی پیادە دەکردو بەرژەوەندیەکانی پتر ئاوێتەی بەرژەوەندیەکانی حکومەتی عیراقی‌و گەلی عەرەبی سەردەست بوو، بە بەراورد لەگەڵ گەلی کورددا، لەلایەکی ترەوە ئەو دەوڵەتانەی کەکوردستانیان داگیر کردووە لایەنێکی سەرەکی هاوکێشەی پەیوەندی‌و کێشەکانی ناوچەکەیان پێکدەهێنا، لەبەرئەوە (شێخ) لەنیازیان دڵنیابوو نەیدەویست بەبێ هیچ گرەنتیەك بەیەکجاری خۆی لەسەر هیچ لایەنێکیان ساغ بکاتەوە، بەڵکو هەوڵیدا جۆرێك لەمانۆڕی رامیاری پیادە بکات‌و پەیوەندیەکی هاوسەنگ لەگەڵ هەردوو لایەندا رابگرێت‌و ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت بێلایەن بمێنێتەوە لەململانێی نێوان ئینگلیزو تورکیادا[54].

هەر لەچوارچێوەی کارکردنیدا بۆ بەدەستهێنانی دۆستایەتی‌و هاوکاری پترو ئەنجامدانی جۆرێك لەفشاری ناڕاستەوخۆ لەسەر ئینگلیزو دەسەڵاتدارانی عەرەبی سوننەی عیراقی، شێخ جۆرێك لەپەیوەندی لەگەڵ (شێخ مهدي خالصي) پێشەوای ئایینی شیعەدا لەبەغدا بەست[55].

---

[53] بڕوانە: رەفیق حیلمی، س پ، ل ل ٣٥٨-٣٥٩.

[54] بڕوانە: رەفیق حیلمی، س پ، ل ل ٣٥٨-٣٥٩. د. عثمان علی، س پ، ل ٣٥٣.

[55] بڕوانە: د. ولید حمدي، س پ، ل ١٦٣.

هەرچەندە (شێخ) بەردەوام بوو لەسەر هەڵوێستی (خۆبەدەستەوەنەدان)و نەچوون بۆ بەغداد، لەگەڵ ئەوەشدا بەمەبەستی خاوکردنەوەی گرژییەکان ئامادەیی ناردنی شاندێکی تری دەربڕی، بەکردەوەش شاندەکەی (شێخ قادر)و (مصطفی پاشا) لە (٣/٣/١٩٢٣) دا ناردە کەرکوك بۆ لای دەسەڵاتدارانی ئینگلیز، بەڵام بێ ئاکام بوو[٥٦]، بەهەمان شێوەی ئاکامی سەردانەکانی شاندی کورد بۆ لای دەسەڵاتدارانی تورك[٥٧]، لە (١٠/٥/١٩٢٣)دا نامەی تری بۆ ناردن، ئەوان هەر سووربوون لەسەر هەڵوێستی پێشوویان[٥٨]، وە لە (١٥/٥/١٩٢٣)دا بروسکەیەکی ئاگادارکردنەوەو نارەزایی دەربڕینی لەدژی سیاسەتەکانی ئینگلیز لەکوردستان گەیاندە باڵیۆزانی بیانی لەتاران و داوای پشتیوانی لێکردن[٥٩]. هەر لەکۆتایی ئەو مانگەدا (هنری دۆبس)ی نوێنەری باڵاو (عبدالمحسن السعدون)ی سەرۆك وەزیرانی عێراق لەسلێمانی کۆبوونەوەو گفتوگۆیان لەگەڵ ژمارەیەك لەسەرۆك خێڵ و کەسایەتیەکانی سلێمانیدا ئەنجام دا، بەڵام بەهۆی هەڵوێستی توندی (السعدون)ەوە لەدژی مافەکانی کورد، کۆبوونەوەکە هیچ ئاکامێکی لێنەکەوتەوە[٦٠]. لەبەر ئەوە (شێخ) لەمانگی حوزەیراندا بەناردنی نامەو مەزبەتە پەیوەندی بەحکومەتی روسیاوە کرد بۆ هاوکاریکردنی[٦١]. پاش ئەوەی هەوڵەکانی ئینگلیز سەریان نەگرت تاوەکو

---

[56] بڕوانە: سی، جی، ادموندز، س پ، ٢٨٥.

[57] بڕوانە: رەفیق حیلمی، س پ، ل ٤٢١، ٤٢٤-٤٢٦.

[58] بڕوانە: د. ولید حمدی، س پ، ل ل ١٧٠-١٧١.

[59] بڕوانە: شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١٣٦-١٣٨. د. ولید حمدی، س پ، ل ١٧٥.

[60] بڕوانە: جرجیس فتح الله، س پ، ل ٢٧٠-٢٧١.

[61] بڕوانە: د. جەلیلی جەلیل واخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: عبدی حاجی، بیروت، ١٩٩٥، ل ١٣٥.

سلێمانی بخرێته سەر عیراق، شێخ (مەحمود) لەهەنگاوێکی تریدا لەمانگی (تەمموزی ١٩٢٣)دا سێیەمین پێکهاتەی حکومەتی کوردستانی بەناوی (ئەنجومەنی میللیی گشتی)یەوە دامەزراند، هەرچەندە قەوارەو قەڵەمڕەوی ئەم حکومەتە لەوانەی پێشووتر سنووردارتر بوو[62]. بەم شێوەیە بارودۆخەکە پتر بەئاراستەی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی دەچوو، لەناوەڕاستی مانگی (ئابی ١٩٢٣)داو لەئاکامی بۆردومانکردنی شاری سلێمانیدا لەلایەن فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە[63]، (شێخ) یاداشتێکی نارەزایی بۆ نوێنەری باڵا نارد. وەدواتریش لەمانگەکانی (تشرینی یەکەمو دووەم)ی (١٩٢٣)و (٢٣-٢٧/٥/١٩٢٤)دا نامە گۆڕینەوەی نێوان (شێخ)و بەرپرسانی ئینگلیز درێژەی هەبوو[64]، بەڵام بەهۆی چۆڵکردنی شاری سلێمانیەوە لەلایەن شێخەوەو داگیرکردنەوەی لەلایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە لە(١٩/٧/١٩٢٤)داو بوونی (چاپمان) بەسەرپەرشتیی کارگێڕیی شارەکە کۆتایی بەسێیەم (حکومەتی کوردستان)ی سەردەمی (شێخ مەحمود) هات[65]. لەگەڵ ئەوەشدا (شێخ) لەسەر هەوڵە دیپلۆماسیەکانی بەردەوام بوو، لەسەرەتای مانگی ئازاری (١٩٢٥)دا (ماجد مصطفی)ی بەسەرۆکایەتی شاندێك ناردە لای بەرپرسانی ئێرانو داوای هاوکاری لێکردن

---

[62] بڕوانە: صدیق صالح، س پ، ل ل ٨٣-٨٥.

[63] بڕوانە: سی جی، ادموندز، س پ، ل ٣١٣.

[64] بڕوانە: شێخ لەتیفی حەفید. س پ، ١١٤-١١٦. د. ولید حمدی، س پ، ل ل ١٧٧-١٧٨.

[65] بڕوانە: عبدالعزیز یاملكي، كشف القناع عن بعض الوقائع العراقية (مذكرات)، ج١، مطبعة دار المعروفة، بغداد، ١٩٥٧، ص ص ١٢، ٢٠، جرجيس فتح الله، س پ، ل ٢٧٤. على كمال عبدالرحمن، س پ، ل ل ٥٧-٥٨.

لەدژی ئینگلیزو لەو کارەدا بەئەنجام گەیشتن[٦٦] و پاشان لەئەنجامی وتوویژکردن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تورکیاو ئێران گەیشتنە جۆرە ڕێکەوتنێکی سێ قۆڵی نێوانیان[٦٧].

لەسەرەتای بەهاری ساڵی (١٩٢٦)دا لەگەڵ ئینگلیزدا گەیشتنە ئاگر بەستێكو (شێخ مەحمود) سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی لەپێنجوێن کردو تێیدا بڕیاریاندا کەپەیوەندی لەگەڵ تورکیادا ببڕن[٦٨]، دیارە لەبەرامبەر بەڵێنی ئینگلیزو حکومەتی عیراقی بەرەچاوکردنی داخوازیەکانی کورد. هەر لەچوارچێوەی زەمینە سازیەکاندا بۆ دامەزراندنەوەی پەیوەندیەکان لەگەڵ ئینگلیزدا، شێخ (سەید ئەحمەدی بەرزنجی) بەنوێنەرایەتی خۆی ناردە لای دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لەبەغداد، بەڵام هەڵوێستی ئینگلیزەکان بەپێچەوانەی خواستەکانی کوردەوە بوو ئەو هەڵوێستەی کە لەنامەی نوسراوو راسپاردەی زارەکیدا بەو نوێنەرەدا نێردرابوو، تێیدا داوا لە (شێخ) کرا دەستەبەرداری کاری رامیاری بێت، لەبەرامبەردا هەڵوێستی (شێخ مەحمود) بریتیبوو لەسزادانی نوێنەرەکەی خۆیو هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەگەڵ ئینگلیزدا[٦٩].

ئینگلیزەکان هەوڵیاندا کاربکەنە سەر دەسەڵاتدارانی ئێران تاوەکو تەنگ بە (شێخ)و هێزەکەی هەڵبچنن، لەم بارەیەوە (عەبدوڵڵاخانی

---

[66] بڕوانە، شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١٣٠-١٣١. هیچ وردەکارییەکمان لەوبارەیەوە دەست نەکەوت.

[67] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٣٤-١٣٨. هیچ وردەکارییەکی ئەو ڕێککەوتنەمان دەست نەکەوت.

[68] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٤٢-١٤٣.

[69] بڕوانە، شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١٤٣-١٤٥.

تەهماسب)ی وەزیری جەنگی ئێـران نامەیـەکی بەنێردراوێکیـدا بـۆ نـاردو داوای خۆبەدەستەوەدانی لێکرد بـەڵام (شـێخ) بەمەبەسـتی بەدەسـتهێنانی کـاتو کۆکردنـەوەی هێـز، لـە (١٢/٥/١٩٢٦)دا بەنامەیـەکی نیمچـە هەڕەشە ئامێزەوە داواکارییەکەی ناوبراوی ڕەتکردەوە[٧٠].

لەساڵی (١٩٢٧)دا ئینگلیزەکان لەڕێگـەی (کـابتن شـۆك)و دواتـریش (کۆرنوالیس)ەوە گفتوگۆیـان لەگـەڵ شـێخدا لـەخورماڵ ئـەنجام دا، بـەڵام ئاکامێکی ئەوتۆی بۆ کورد لێنەکەوتەوە.[٧١]

هەروەها لەوکاتەی کەئینگلیزەکان لـەدژی (ڕەزا شـا)ی ئێـران کاریـان دەکردو لەنێو بنەماڵەی قاجارەکاندا پشتگیری (سالار الدولە) یـان دەکـرد، ئەمیش نامەیەکی بۆ (شێخ) ناردو داوای کۆمەکی لێکرد لەدژی (ڕەزاشا)، بەڵام شێخ، (ئەحمەد خواجە)ی نارده دیدەنیو کارکردن بـۆ دوورخسـتنەوەی سەرکردە کوردەکان لەهێزەکەیدا، ئەم کـارەی (ئەحمـەد خواجـە) ئـەنجامی باشی هەبوو، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتییش بێت، و دواتریش نامەگۆڕینـەوەو دیداری نێوان (شێخ مەحمود)و بەرپرسـانی ئینگلیـزو حکومـەتی عێراقـی درێژەی هەبوو، (شێخ) لە (٣١/١٢/١٩٢٧)دا نامەی بە (سـەید ئەحمـەد مەرەخەس)دا بۆ (کۆرنـوالیس) نێـردراوی بـاڵای بـەریتانیا نـاردو ئـەویش وەڵامــی نامەکـەی دایـەوەو، هاوکـات نامەیـەکی بـۆ (کـاپتن هۆڵـت)ی ڕاوێژکاری ڕۆژهەڵات ناردو ئەویش لە (٢٥/١/١٩٢٨)دا بەنامـە وەڵامـی دایەوە[٧٢].

---

[70] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٤٥-١٥٦.

[71] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٤٧-١٥٣.

[72] بڕوانە: هـ س، ل ل ١٥٢-١٥٣، ١٦٧-١٦٨، ١٨٠-١٨٢، ئەحمەد بـاوەڕ، س پ، ل ل ٢٥-٢٦.

هەروەها لە (٢٧/١/١٩٢٧)دا نامەیەکی بۆ (کۆلۆنیل وانت)ی سەرۆکی ئەرکانی جەنگو بەڕێوەبەری هەواڵگری نارد، لە (١٢/٣/١٩٢٧) دا نامەیەکی لە (زیان براین)ەوە پێگەیشت کە لەوەڵامی نامەیەکی پێشووتری شێخدابوو[٧٣]. تێکڕای ئەو نامانە ئاکامێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوە کەشایانی ئاماژەپێدان بێت.

لە (١٩/٥/١٩٢٧)دا (شێخ) نامەیەکی لە (ئەحمەد عثمان)ی موتەسەریفی سلێمانیەوە پێگەیشتو پاشان لە (١٩/٨/١٩٢٧)دا وتوێژێکی نهێنی لەنێوانیاندا لەپێنجوێن ئەنجام دراو ڕێککەوتنێکیان مۆرکرد کەجۆرێك بوو لەملکەچ بوونو تێیدا (شێخ) پابەند دەکات بەدوورکەوتنەوە لەکوردستانو هەڵپەساردنی چالاکی رامیاری خۆی بۆ ماوەی چوار ساڵو دژایەتی سیاسەتەکانی حکومەتی عیراقی نەکات، بەمەرجێك دوای ئەو ماوەیە ڕێگە بەگەلی کورد بدرێت لەڕێگەی دیپلۆماسی داوای مافەکانی بکات[٧٤]. ئەمە وێڕای چەند خاڵێکی تایبەت بەگێڕانەوەی موڵکەکانی شێخ مەحمودو خزمەکانی، ئەمەش ئەو راستیە دەسەلمێنێت کەتا دەهات تای تەرازووی هێزەکان لەو کێشمە کێشە درێژخایەنو هەمەلایەنەدا بەقازانجی نەیارەکانی گەلی کوردو رابەرەکەی دەشکایەوە، ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتنە باری لەنگی لایەنی کوردیو باڵادەستی لایەنی بەریتانیو عیراقی لەو قۆناغەدا دەردەخات.

---

[73] بڕوانە: هـ س، ل ل ١٦٩-١٧٢.

[74] بڕوانە: شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١٦٤-١٦٦، ١٧٤. محمد عبدالله کاکەسور، س پ، ل ٧١. عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ج٣، ص٢٨٩. شورش حسن عمر، حقوق الشعب الكوردي في الدساتير العراقية دراسة تحليلية مقارنة، اطروحة ماجستير غير منشورة، كلية القانون، جامعة السليمانية، ٢٠٠٤، ص ٦٠.

لەدوای دوو مانگ لەرۆیشتنی بۆ ناوچەی (پیران)، (شێخ مەحمود) لەسەر داوای نوێنەری بەریتانیی شای عیراق، لەبەغداد سەردانی کردن، بەلاّم دیدارەکە ئاکامێکی رونی نەبوو، شێخیش گەڕایەوە شوێنی پێشووی[٧٥].

(شێخ) لەماوەی سێ ساڵی نیشتەجێبوونیدا لە(پیران)، هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عیراق لێیان دووپات دەکردەوە کەنابێت چالاکی رامیاری ئەنجام بدات، لەگەڵ ئەوەشدا (شێخ) لە(کۆتایی‌ی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٢٧ تا ١٩٢٩) درێژەیدا بەنامەگۆڕینەوەو دیدار لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیزو عیراق، لەوانە بۆ نمونە: (کاپتن هۆڵت، کۆلۆنیل لاین، ئەحمەد عوسمانی موتەسەریفی سلێمانی)[٧٦] هەر لەساڵی (١٩٢٧) دا لەرێگەی (فهمی سعید)ەوە دووجار پەیوەندیکردن لەنێوان (شا فیصل) و (شێخ مەحمود)دا بەبێ ئاگاداری ئینگلیزەکان ئەنجام درا[٧٧]، بەلاّم بێ ئاگا بوو.

لەبەهاری ساڵی (١٩٢٩)دا چەندین سکالاّنامەی مۆرکراو لەلایەن ژمارەیەك لەسەرۆك هۆزەکانی باشووری کوردستانەوە پێشکەش بەرێکخراوی نێودەوڵەتی (کۆمەڵەی گەلان) لەجنێفو نووسینگەی نوێنەری بالاّ لەبەغداد کران کەتێیدا داواکاری ئۆتۆنۆمی نێوخۆیی‌و هەتا سەربەخۆییش لەژێر پاریزگاریی بەریتانیادا بوون، بەلاّم لەلایەن بەریتانیاو حکومەتی عیراقەوە پشتگوێ خران[٧٨]، کەهۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ

---

[75] بڕوانە، شێخ لەتیفی حەفید، س پ، ل ل ١٧٧-١٧٨.

[76] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٧٩- ١٨٥.

[77] بڕوانە، محمد عبدالله کاکەسور، س پ، ل ٧٣

[78] بڕوانە، دیڤید ماکداول، س پ، ل ل٣٦١-٣٦٢. شایانی ئاماژەپێدانە کەخەباتی پەرلەمانی نوێنەرانی کورد لەپەرلەمانی عیراقدا شێوازێکی تری خەباتی رامیاری گەلی

توندوتۆڵیی بەرژەوەندیەکانی نێوان هەردوو حکومەت‌و بێدەربەستبوونیان لەهەر جۆرە کاردانەوەیەکی گەلی کوردو رابەرانی‌و. هەروەها دەسەڵات‌و رۆڵی کاریگەری بەریتانیا لەناو ئەو رێکخراوە نێودەوڵەتیەدا بەئەندازەیەك بوو کەئاستەم بوو لەو رێگەیەوە کارێك ئەنجام بدرێت بەپێچەوانەی بەرژەوەندی‌و ویستی ئەو وڵاتەوە بێت*.

لەپێش پێکدادانی چەکداری نێوان (شێخ مەحمود)و حکومەتی عیراقی لەساڵی (١٩٣٠)دا، وتووێژێك لەنێوانیاندا ئەنجام درا، کەئەفسەر (جەمال عارف) نوێنەرایەتی شێخی کردو هەردوو ئەفسەری کورد (بەکر صدقی)و (بهاءالدین نوری) نوێنەرایەتی حکومەتیان کرد، سەرەنجام هیچ ئاکامێکی پۆزەتیفی بەئاراستەی رێککەوتن لێنەکەوتەوە[٧٩].

---

کوردە کە لەبەرامبەر سیاسەتەکانی هەردوو حکومەتی بەریتانی‌و عیراقیدا گرتیەبەر، بەشێوەی پێشکەش کردنی یاداشت‌و گفتوگۆی پەرلەمانی‌و پرسیارکردن لەسەر پرسە چارەنووسسازەکانی پەیوەندیدار بەکوردەوە، بۆ وردەکاریەکانی ئەم بوارە، بۆ نمونە بڕوانە، محمد عبدالله کاکەسور، س پ، ل ل٧٦-٨٨. بۆ دەقی هەردوو نامەکەی ناوبراو بڕوانە، محەمەد ئەمین زەکی، (دوو تەقەلای بێ سوود)، توێژینەوەو رێکخستنی، سەباحی غالب، چاپخانەی هەلۆێست، لەندەن، ١٩٨٤، ل ل٦٤-٩٤، ٩٥-١١٤. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارت العراقية، ط٧، ج٣، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص ص٦٤-٦٧.

* بۆ زانیاری پتر لەبارەی پێگەو دەسەڵاتی بەریتانیا لەنێو رێکخراوی نێودەوڵەتی (کۆمەڵەی گەلان)دا، بۆ نمونە، بڕوانە خليل اسماعيل الحديثي، الوسيط في التنظيم الدولي، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٩١، بەشی تایبەت بەو رێکخراوە نێودەوڵەتیەوە.

79 بڕوانە: محمد عبدالله کاکەسور، س پ، ل ل ٧٨-٧٩.

بەم شێوەیە جموجۆڵی چەکداریو چالاکیە رامیاریو دیپلۆماسیەکانی (شێخ) لە(١٧/٩/١٩٣٠-١٤/٥/١٩٣١)دا کەرۆژی خۆبەدەستەوەدانی بەهێزەکانی ئینگلیزبوو درێژەی هەبوو[*]، کەدەکرێت گرنگترین ئامانجەکانی (شێخ) لەو هەولانەدا لەچەند خاڵێکدا چڕ بکەینەوە:

١-سازدانی هەڵمەتێکی چڕی پڕوپاگەندەی رامیاری بەمەبەستی سازدانی گەلی کورد بۆ پشتیوانیکردنی جموجۆڵە چەکداریەکەی.

٢-بەدەستهێنانی هاوسۆزی رێکخراوی کۆمەڵەی گەلان.

٣-بەدەستهێنانی هاوسۆزی بەریتانیا، بۆ گەلی کوردو دابینکردنی بەشێك لەمافەکانی.

لەو پێناوەشدا چەند رێگەیەکی گرتە بەر لەوانە: پەیوەندیکردن بەژمارەیەك لەسەرۆك خێلو کەسایەتیەکانی کوردستانو ناردنی یاداشتنامە بۆ رێکخراوی کۆمەڵەی گەلان لەلایەن ژمارەیەکی زۆری سەرۆك خێڵەکان وەك هی رۆژهەلاتی کوردستانیشی تێدابوو، هەروەها نامە ناردن بۆ دەسەلاتدارانی ئینگلیزو عیراقو داواکردن لەئینگلیزەکان کەنوێنەریان بنێرن بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیدا.

---

[*] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە: بڕوانە، ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-سیاسیيە، چ١، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢. شایانی ئاماژەپێدانە کە (شێخ مەحمود* رووداوەکەی (٦/٩/١٩٣٠)ی بەهەلێکی گونجاو زانی بۆ دەستپێکردنی جموجۆڵێکی تر، لەبەرئەوە لەنووسراوێکیدا بۆ نوێنەری بالای بەریتانی لەبەغداد، داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کرد کە لەژێر ماندێتی بەریتانیادا بێتو سنوورەکەی لەزاخۆوە تا خانەقین بێت، بەلام ئەم داواکاریە جێگەی بایەخی ئینگلیز نەبوو. لەم بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە: محمد عبدالله کاکە سور، س پ، ل ٧٨.

(شێخ مەحمود) لەبواری یەکەمدا تا ئەندازەیەکی بەرچاو سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەفراوانکردنی بنکەی میللی چالاکیەکانیو بەدەستهێنانی جۆرێك لەڕەوایی بۆ جولانەوەکەی. ئاکامی هەولەکانی لەبواری دووەمدا سنووردار بوو، چونکە ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان وەکو پێویست بەدەم یاداشتو داخوازیەکانی گەلی کوردەوە نەهات، بەلام کاریگەریەکی مەعنەوی زۆر کەمی لەسەر سیاسەتی حکومەتی بەریتانیو عیراقی بەرامبەر بەو مافو داخوازیانە بەجێهێشت*. لەبواری سێیەمیشدا هەولەکانی بەشێوەیەکی گشتی سەرکەوتوو نەبوون، هەرچەندە بەدەرنەبوون لەکەلك، چونکە گەر نەتوانرابێت بەریتانیا لەو هاوکێشەیەدا بێلایەن بکرێت، ئەوا هیچ نەبێت توانرا کار بکرێتە سەریان بەجۆرێك رێگە بەدەسەلاتدارانی حکومەتی عیراقی نەدەن کەرێگەی بەکارهێنانی سیاسەتی هێزی رەهاو سەرکوتکردنو سزادانی بەکۆمەڵ بگرنەبەر بەو شێوەیەی کە نیازیان بوو، (شێخ مەحمود) لەمیانەی ئەنجام دانی چالاکیە سیاسیو دیپلۆماسیەکاندا ئەم رێوشوێنانەی گرتەبەر:

١-نامەگۆڕینەوەو پڕکردنەوەو رەوانەکردنی مەزبەتە.

٢-ناردنی نوێنەری تایبەتی خۆی بەشێوەی تاكو بەشێوەی شاند کە لەسەرۆكو ئەندامان پێکهاتبێت.

٣-سەردانی کردنو پێشوازیکردنو وتووێژکردن لەگەڵ دەسەلاتدارانی ولات لەئاستی جیاجیادا وەکو: (شا، سەرۆك وەزیران، نێردراوی بالا، بەرپرسانی رامیاریو سەربازی، موتەسەریفو.. هتد)

---

* بۆ دەقی نامەکانی (شێخ مەحمود)و لایەنگرانی بۆ حکومەتەکانی عیراقو بەریتانیاو رێکخراوی کۆمەڵەی گەلانو وردەکاریەکانی ئەو هەلە دیپلۆماسیانە، بڕوانە: احمد خواجە، س پ، ل ل٥٠-٩٩. د.عثمان علی، س پ، ل ل ٥٦٢-٥٧٥.

٤-پرسو راوێژکردن بەژمارەیەکی دیاریکراو کەسانی دەوروبەری خۆی پێش ئەنجامدانی هەنگاوەکانی، کەزرۆبەیان لەئاستی ئەو جۆرە ئەرکانەدا نەبوونو کەسانی لەوان شیاوتر هەبوو بەڵام پرسو راوێژیان پێنەدەکرا.

٥-ئەوەی جێگەی تێبینیە کە لەپێکهاتەی هەرسێ حکومەتەکانی (شێخ مەحمود) هیچ جۆرە دامودەزگایەك یان لیژنەیەك لەهەر ئاستێکی کارگێڕیدا بێت پێکنەهێنراوە کەتایبەت بێت بەڕاپەڕاندنی کاروباری رامیاریو دیپلۆماسی نێوخۆییو نێودەوڵەتی ئەو حکومەتانە، لەچەشنی ئەوەی کە لەپێکهاتەی دامودەزگاکانی حکومەتەکان لەجیهاندا هەیە، پێمان وایە کەپێکهێنانی دەزگایەکی تایبەت بەو بوارە کارێکی زۆر پێویست بوو، بەهەمان شێوەش لەتوانادابوو تەنانەت ئەگەر لەئاستێکی زۆر سەرەتاییو سنورداریشدا بێت، بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی کە لەوڵاتانی جیهاندا هەیە، لەگەڵ رەچاوکردنی بارودۆخی تایبەتی ئەو سەردەمەی باشووری کوردستان.

٦-پشت نەبەستنی (شێخ مەحمود) وەکو پێویست بەتوێژی رووناکبیرانی کورد بەگشتیو ئەفسەرە کوردەکانی نێو سوپای پێشووی عوسمانیو دواتری عیراقی بەتایبەتی، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر هەموو بوارەکانی بزووتنەوەو حکومەتەکانی (شێخ) بەجێهێشت، بەگوتەی (دیڤید ماکداوڵ)، "لەو ماوەیەدا شێخ مەحمودیش بێ توانایی خۆی لەکاری دیپلۆماتیك کەپێویستی ئەم کارەبوو، نیشان دەدا، ئەگەر کوردەکان لەبوونی شێخ مەحموددا لەڕووی سیاسییەوە ناشایستەییو بێتوانایی خۆیان دەردەخست، لەبەرامبەردا ئینگلیزەکانیش لەبوونی کۆکسدا وەك خائینو پەیمان شکێن دەردەکەوتن"[٨٠].

---

[80] دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٥٤. دیارە مەبەست لە (هنری کۆکس)ە.

لەپاش یەکلاکردنەوەی کێشەی باشووری کوردستان بەقازانجی هەردوو دەوڵەتی بەریتانیو عیراقی، پرسی سەربەخۆیی عیراقو بەئەندامبوونی لەرێکخراوی کۆمەڵەی گەلاندا بوو بەتەوەرەی سەرەکی پەیوەندیەکانی نێوانیان، کەسەرەنجام لەساڵی (١٩٣٢)دا بەقازانجی دەوڵەتی عیراق شکایەوە، لەبەرامبەر کۆمەڵێك مەرجو پابەندێتی کەدەکەوێتە ئەستۆی عیراق، لەبارەی رەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەعیراقداو پەیماننامەکانی نێوانیانو مافەکانی گەلی کوردو کەمینەکانی لەعیراقدا[٨١]. لەراستیدا ئەم بەئەندام بوونە، وێڕای لکاندنەکەی باشووری کوردستان "بوو بەگورزێكو لەهیواکانی کورد درا، چونکە (کۆمەڵەی گەلان) نەیتوانی هیچ شێوازو ئامرازێکی وەها بدۆزێتەوە کەحکومەتی عیراق ناچار بکات دوای سەربەخۆبوون، مامەڵەیەکی باشی کورد بکات لەعیراقدا"[٨٢]. دەوڵەتی عیراق لەپاش سەربەخۆبوونی پەیمانو پابەندێتیەکانی خۆی بەرامبەر بەگەلی کوردو کەمینەکانی عیراق جێبەجێ نەکرد، رێکخراوی کۆمەڵەی گەلانیش داوای جێبەجێکردنی لێنەکردو سزای نەدا لەئاکامی

---

[81] بۆ وردەکاریەکانی ئەو مەرجانەی کەبەریتانیاو کۆمەڵەی گەلان سەپاندویانە بەسەر عیراقدا لەبەرامبەر قایلبوونیان بەسەربەخۆیی عیراقو بەئەندامبوونی لەو رێکخراوەدا، بۆ نمونە بڕوانە: شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ل٣٥-٣٦. د. مارف عومەر گوڵ، س پ، ل ل١١٣-١١٥.

-History.www.Findarticles.com
-Faisal،www.infoplease.com
-Iraq History.www.infoplease.com

[82] د.عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، وثائق عن الحركة القومیة الكوردیة التحرریة ملاحظات تاریخیة ودراسات اولیة ط١، مطبعة وزارة التربیة، الناشر: مؤسسة موكریاني للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠١، ل ٣٣.

پابەندنەبوونی عیراق لەو بارەیەوە، هەرچەندە کورد زۆرجار بۆ ئەو مەبەستە داواکاریان پێشکەش کرد[83]، هەروەها لەرێگەی پەرلەمانتارە کوردەکانەوە کەیاداشتیان لەو بارەیەوە پێشکەش بەسەرۆك وەزیرانی عیراقو نوێنەری بالاّی بەریتانیا لەعیراقدا دەکرد، بەلاّم داواکەیان پشتگوێ دەخرا[84].

---

83 بڕوانە: شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٣٦.

84 بڕوانە: عبدالرزاق الحسنی، س پ، ل ل ٦٤، ٦٥-٦٦.

## باسی دووەم
## باری دەستوریی گەلی کوردو مافەکانی لەیاسای بنەڕەتیی ساڵی ١٩٢٥ی عیراقدا

پرۆژەی یەکەم دەستوری عیراق لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئینگلیزەوە لە (١٠/٧/١٩٢٤)دا دارێژراو لەلایەن ئەنجومەنی دامەزرێنەری عیراقەوە پەسەند کراو لە (٢١/٣/١٩٢٥)دا بڵاوکرایەوە، بێ ئەوەی لایەنی عیراقی یان نوێنەرانی کورد بەشداریەکی کاریگەرانە لەتێکڕای قۆناغەکانی دانانی ئەو دەستورە بکەن، شایانی ئاماژە پێدانە کە لەتێکڕای هەر (١٢٥) بەندەکەیدا هیچ ئاماژەیەکی بۆ گەلی کوردو مافەکانی تێدا نیە[85].

وە ئەم بارە گۆڕانی بەسەردا نەهات تەنانەت پاش دەرچوونی بڕیاری ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان لە (١٦ك١/١٩٢٥)ی تایبەت بەلکاندنی (ولایەتی موسڵ) بەعیراقەوە، کەتێیدا عیراق پابەند دەکات بەدامەزراندنی کارگێڕیەکی کوردی تایبەت لەناوچە کوردیەکاندا[86].

لەقۆناغی دواتردا، حکومەتی عیراقی لەژێر فشاری داواکاریەکانی گەلی کوردو زەمینە خۆشکردن بۆ بەئەندامبوونی وڵاتەکە لەڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلاندا، (یاسای زمانە خۆجێیەکانی) ژمارە (٧٤)ی ساڵی ١٩٣١ی لە (٢٣/٥/١٩٣١)دا دەرکرد[87].

---

85 بڕوانە: شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ل ٥٤-٥٥. بۆ دەقی دەستورەکە وە بڕوانە: د. رعد الجدة، التشريعات الدستورية في العراق، السلسلة الوثائقية رقم (١)، بيت الحكمة قسم الدراسات التاريخية، مطبعة دار الشؤون الثقافية العامة، بغدا، ١٩٩٨، ل ل ٢٩-٥٥.

86 بڕوانە: شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٥٤.

87 بڕوانە: ه س، ل ٥٥.

لەم بارەیەوە ئەو لێکدانەوەیە بەدروست دەزانین کەپێی وایە ئەو یاسایە سیمای دانپێدانانی بەکوردو هەبونیان لەعیراقدا تێدایەو دەشێت بەسستمێکی ناناوەندێتی کارگێڕی لەشێوازێکی پێشکەوتوودا دابنرێت، بەڵام بەشێوەیەکی نیوەچڵی جێبەجێ کرا[88].

هەڵوێستی دەستورەکە وەکو خۆی مایەوە، تەنانەت پاش بەڵێنەکانی حکومەتی عیراق لەبەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلاندا لەبارەی دابینکردنی مافی کەمینە نەتەوەیی‌و ئایینیەکانی گەلانی عیراقدا، لەپێشی هەموویاندا گەلی کورد، هەر بەو شێوەیەش لەپاش راگەیاندنەکەی حکومەت کە لە (٥/٥/١٩٣٢)دا بۆ بوون بەئەندامی لەرێکخراوەکەدا دەریبڕی، هەروەها لەپاش دووەمین هەمواركردنی دەستورەکە لەساڵی (١٩٤٣)دا هیچی لەوبارەیەوە تێدانەبوو. دەستورەکە دوای هەمواركردنی هەر وەکو خۆی مایەوەو هیچی لەبارەی گەلی کوردو نەتەوە ناعەرەبەکانی ناو عیراق‌و مافەکانیان لەخۆنەگرت‌و لەبەندی دووەمی دەستورەکەدا کەبۆ دەستنیشانکردنی باری نەتەوەیی لەعیراقدا تەرخانکراوە، هیچ ئاماژەیەکی روونی بۆ باری راستەقینەی فرەیی‌و هەمەچەشنی پێکهاتەی ئیتنۆگرافی گەلانی ناو عیراق ناکات، وەکو ئەوەی کەهەر خۆی لەیەك نەتەوەو ئایین‌و ئاینزا پێکهاتبێت‌و پرسێکی بەڵگەنەویست بێت‌و پێویست بەئاماژەپێکردنی لەدەستورەکەدا نەکات[89].

لەبەندی (١٦)دا بەناڕاستەوخۆ ئاماژە بەچەند مافێکی گشتیی هاووڵاتیان دراوەو، لەبەندەکانی (٦، ١٨) ئاماژە بەچەند مافێك دراوە لەچەشنی یەکسانی لەبەردەم یاسادا لەئەرك‌و مافەکاندا، هەرچەندە

---

[88] بڕوانە: هـ س، ل ل ٥٦-٥٧

[89] بڕوانە: شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٥٦-٥٧.

هێمایەکی ناراستەوخۆی بۆ بوونی فرەنەتەوەیی‌و ئایینی عیراق تێدایە، بەڵام بەبێ ئەوەی ناویان بهێنێت[٩٠].

حکومەتی عیراقی‌و دەسەڵاتدارانی بەریتانی لەبری سەلماندنی مافە دەستوریەکانی گەلی کورد، بەپێچەوانەوە کاریان دەکردو مافی بەرپەرچدانەوەو سەرکوتکردنی هەر بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانەی گەلی کوردیان لەدەستورەکەدا جێگیر کرد، بۆ نمونە بەندی (١٢٠)ی دەستورەکە کەتایبەت بوو بەدەسەڵاتی حکومەت بۆ راگەیاندنی حوکمی عورفی‌و باری نائاسایی، ئەوەش پتر تایبەت بوو بە (باشوری کوردستان‌و لەوبارەیەوە دەستی حکومەت‌و ئینگلیزی لەکاتی (پێویستدا!) بۆ سەرکوتکردنی گەلی کوردو راپەڕینەکانی والآتر کردبوو[٩١]، بەو شێوەیەش هەر هەنگاوێکی سەرکوتکەرانە رەوایی دەستوریی پێدەدرێت!.

بەم شێوەیە گەلی کورد لەسایەی یاسای بنچینەیی‌ی ساڵی (١٩٢٥)داو بەدرێژایی فەرمانڕەوایی پاشایەتی لەعیراقدا لەڕووی دەستوری‌و کردارەکیشەوە لەهەموو مافەکانیان بێبەش کران[٩٢].

---

90 بڕوانە: هـ س، ل ٥٨.

91 بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە، بڕوانە، هـ س، ل ل ٥٨-٦٠.

92 بۆ وردەکاریی پتر لەو بارەیەوە، بڕوانە، هـ س ، ل٦١.

## باسی سێیەم
## هەڵوێستی شێخ مەحمود حەفید
## لەسەروبەندی یەکلاکردنەوەی کێشەی ولایەتی موسڵ دا

پاش کۆتاییهاتنی یەکەمین جەنگی جیهانو لەبەر یەکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی، دۆزی نەتەوەیی گەلی کوردو گەلی ئەرمەن وەکو دوو لەکێشە هەرە ئالۆزەکانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەریهەڵداو رەهەندی ناوچەییو نێودەوڵەتیان بەخۆوە بینی.

زیادبوونی بایەخی بەریتانیا بەعیراق بەگشتیو باشووری کوردستان بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك هۆکار، لەوانە، دۆزینەوەی نەوت تێیدا بەبڕێکی زۆرو، هەروەها بەکارهێنانی وەکو بنکەیەکی گرنگ بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتو قەڵەمڕەویان لەرۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕاستدا[93]. هەر لەم بارەیەوە بەریتانیا پێکهاتەی ئیتنۆگرافی لەناوچەکەدا رەچاوکرد، لەرێگەی بەهەند وەرگرتنی رۆڵی فاکتەری ئاینزایی گەلی کورد کەزۆرینەیان سوننەن لەو پێکهاتەیەدا، لەبەرامبەر زۆرینەی شیعەی عەرەبی عیراق کەهەر لەسەرەتاوە بەهەڵوێستی توندیان لەڕووی داگیرکاری بەریتانیەکان بۆ عیراق ناسران[94]. ئەوە وێڕای رەچاوکردنی کۆمەڵێك

---

[93] بڕوانە: عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، س پ، ل ٤٨.

[94] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە، بڕوانە، جزا توفیق طالب، اقلیم کردستان العراق ((دراسة في الجغرافیة السیاسیة))، اطروحة دکتوراه غیر منشورة، کلیة العلوم الانسانیة، جامعة السلیمانیة، ٢٠٠٤، ص ص٢٥٦-٢٥٧. بۆ زانیاری پتر لەبارەی باری ئیتنۆگرافی گەلانی عیراقەوە بۆ نموونە بڕوانە، حنا بطاطو، العراق الطبقات الاجتماعیة والحرکات

هۆكاری رامیاریو سەربازیو ئـابووری لەسـەر ئاسـتی نیشـتمانی عـیراقو نێوچەییدا[٩٥].

پرسی یەكلاكردنەوەی كێشەی باشووری كوردستان (ویلایـەتی موسـڵ) بەشـێوەی هێشـتنەوەی لـەژێر بـاری داگیركـاری توركیـادا یـان لكانـدنی بەدەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراقەوە، تەوەرەیـەكی سـەرەكی سیاسـەتەكانی بـەریتانیای لەنێوچـەكەدا پێكـدەهێنا، سـەبارەت بەهەڵوێسـتی (شـێخ مەحمودی حەفیـد) لـەو بارەیـەوەو بـە بۆچـونی ئێمـە كاریگـەری لەسـەر سیاسەتەكانی بەریتانیا لەڕوانگەی ئەوەی هەڵوێستی بـەریتانیا لەكێشـەی ولایەتی موسڵ، بەهەڵوێسـت لـەدۆزی نەتـەوەیی كـورد لەقەڵـەم دراوە[٩٦]، بەهـەمان شـێوە دەكرێـت هەڵوێسـتی (شـێخ مـەحمود) لەوبارەیـەوە لێكبدەینەوە.

شایانی ئاماژەپێدانە كەحكومەتی عیراق هەر لەسەرەتاوە بەرچاوی روون بوو سیاسەتێكی ئاشكراو نەگۆڕی لەبارەی ئەو كێشەیەوە گرتەبەر، كە نەك هەر لەگەڵ سیاسەتی بـەریتانیا لـەو بارەیـەوە یەكدەگرێتـەوە، بـەڵكو زۆر توندتربوو، بۆ نمونە (شـا فەیسـەڵ) كـە لـە (٢١/٥/١٩٢٣) سـەردانی موسڵو سلێمانی كرد، بەمەبەستی بەدەسـتهێنانی پشـتگیری میللـی لـەو

---

الثورية في العهد العثماني حتى قيام الجمهورية، الكتاب الاول، ت: عفيف الرزاز، ط١، مؤسسة الابحاث العربية، بيروت، ١٩٩٠، ص ص ٥٧-٥٨.

-Peter Sluglett and Marion Farouk-Sluglett، the times guide to the Middle East، the Arab world and it's neighbors، times books. London. 1993، pp 86–87.

-Kurd، www.infoplease.com

[95] بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە، بڕوانە، عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، س پ، ل ٨١.

[96] بڕوانە، عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، س پ، ل ٣٠٠.

ناوچەیەدا، لەو بارەیەوە رایگەیاند کەهیچ پرسێك نیە ناوی پرسی موسڵ بێت، چونکە موسڵ بەشێکی دانەبڕاوە لەعیراق، پرسەکە بریتیە لەکێشەی سنوری نێوان تورکیاو عیراق[97].

هەمان هەڵوێستوئەنجام لەسەردانەکەی (١١/٧/١٩٢٣)ی سەرۆك وەزیران (عبدالمحسن السعدون) بۆشاری سلێمانی بەدیدەکرێت، کاتێك لەراگەیاندنەکەیدا دەیویست دانیشتوانەکەی دڵنیا بکاتەوە، بەوەی حکومەت رەچاوی مافە کارگێڕیو زمانەوانیو ئاینیو شارستانیەکانیان دەکات[98]، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەبوونی کێشەیەکی رامیاری گەورە لەو ئاستەدا بکات. لەئاکامی سەرنەگرتنی هەوڵە رامیاریو دیپلۆماسیەکانی بەریتانیاو تورکیا بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی گونجاو بۆ کێشەی ولایەتی موسڵ لەنێوانیاندا، کێشەکە رەوانەی رێکخراوی کۆمەڵەی گەلان کرا[99].

پاش ئەوەی رێکخراوەکە لیژنەیەکی پێکهێنا بەمەبەستی ئامادەکردنی راپۆرتێك لەبارەی باری راستەقینەی سەر سنوورەکانی عیراق-تورکیاو و گەیشتنیان بۆ بەغداد لە (١٦ك٢/١٩٢٥)، لیژنەکە لەمیانی کارەکانیدا سەردانی سلێمانی کرد، کەبەلای ئینگلیزەوە وەکو شەرێکی یەکلاکەرەوە دەبێت لەگەڵ (شێخ مەحمود)دا[100]، بەهەمان شێوەش لەگەڵ تورکیادا، هەرچەندە دەیزانی کەبارودۆخی رامیاری لەسلێمانیدا لەڕووی کردارەکیەوە

---

[97] لەوبارەیەوە بڕوانە، ھ س، ل ٣٠٢،

[98] بڕوانە، ھ س، ل ٣٠٢.

[99] بڕوانە، ھ س، ل ٣٠٢، بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە، بڕوانە، د. فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی موسڵ، و: محمد شاکەلی، چاپو بلاوکراوەی خاك، سلێمانی ١٩٩٩، ل ٧٧.

[100] بڕوانە، عبدالرحمن ادریس صالح البیاتي، س پ، ل ٣٠٥.

لەقازانجی تورکیادا نیە[١٠١]، لیژنەکە لەکاتی سەردانەکەیدا بۆ سلێمانی، بەگوتەی (ئەدمۆندز) بۆی دەرکەوت کەوەلآمی خەڵکەکە بەدڵی ئینگلیزبوو[١٠٢]. هەروەها داوای لە(شێخ مەحمود) نەکرد کەبێتە بەردەمی و رای خۆی دەربڕێت، لەبەرامبەردا (شێخ) لەوکاتەدا هیچ جموجوڵێکی لەدژی ئینگلیزەکان ئەنجام نەدا[١٠٣]، بەگوتەی ئەدموندز "شێخ مەحمود لەوە زیرەکترو دوربینتربوو کە لەکاتی سەردانی لیژنەکە خۆی دەربخات، وەخۆی دوورگرت، لیژنەکە لەخۆوە بڕیاریدا کەجوان نیە کەشۆڕشگێڕێکی ئاشکرا بهێنرێتە بەردەم لیژنەکە بۆشایەتیدان، شێخ چاوەڕوانبوو تا گەڕانەوەو درێژەی بەتەکتیکی جەنگی خۆیدا"[١٠٤]. لیژنەکە لە (١٦/٧/١٩٢٥)دا راپۆرتەکەی پێشکەش بەئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان کرد[١٠٥]، راپۆرتەکە لەبەر رۆشنایی چەند فاکتەرێکی دیموگرافیو ئیتنۆگرافیو ئابوریو رامیاری رەچاوی دابەش نەکردنی ولایەتەکەی کرد، لیژنەکەو دواتر کۆمەڵەی گەلان راسپاردەی لکاندنی ولایەتەکەی بەعیراقەوە کرد، لەبەرامبەر مانەوەی عیراق بۆ ماوەی بیستو پێنج ساڵ لەژێر ماندێتی بەریتانیاو هەندێك لەمافە کەلتوریو کارگێڕیەکانی کورد[١٠٦]، هەروەها

---

[101] بڕوانە، عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، س پ، ل ٣٠٦.

[102] بڕوانە، ئاکۆ عبدالکریم شوانی، س پ، ل ٢١٥.

[103] بڕوانە، عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، س پ، ل ٣٠٧.

[104] سی، جی، ادموندز، س پ، ل ٣٧٦.

[105] بڕوانە، جرجیس فتح الله، س پ، ل ٦٧٤.

[106] بڕوانە، لونکریك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر خياط، ط١، بغداد، ١٩٤١، ل ٢٥٤. Who are the Kurds? www.culturalorientation.net، محمد عبدالله کاکە سور، س پ، ل ٦٦، ئاکۆ عبدالکریم شوانی، س پ، ل٢١٦

**جەختکردنـــەوەی لیژنەکــە لەســـەر ڕێوشـــوێنەکانی دابینکردنـــی ئاشـــتی لـــەنێوخۆداو، پاراســـتنی کەمینـــە ناموســـڵمانەکانو گرتنەبـــەری چـــەند ڕێوشوێنێکی بازرگانی[107].**

**لەساڵی (١٩٢٦)دا تورکیا دانی نا بەلکاندنی ولایەتەکـە بەعیراقــەوە لەبەرامبەر ڕێژەیــەکی دیـاریکراو لەنــەوتی عــیراق وەکـو قەرەبووکردنــەوە بۆی[108].**

**بەم شێوەیە ئــەو ڕێبــازەی (شـێخ مــەحمود) لــەو ماوەیــەدا گرتیەبـەر، بەناڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو ئامانجەی کەبەریتانیا خوازیاری بوو یەکیگرتــەوە، ئەویش بەیەکلاکردنەوەی کێشەی ولایــەتی موســڵ لەبەرژەوەنـدی دەوڵــەتی عیراقیدا[109].**

**ئەگەر ڕەخنە ئاراستەی هەڵوێستەکانی (شێخ مــەحمود) بگــرین بــەوەی کە لەژێر کاریگەری هەستی ئایینیــدا، نــەیزانی خــۆی لەگــەڵ سیاســەتی ئینگلیزەکاندا بگونجێنێت. بەڵام خۆ ئەو هەڵوێســتەی کــە لــەکاتی هــاتنی لیژنەکــەی کۆمەڵــەی گەلانــدا نوانــدی لەگــەڵ ئامانجــەکانی سیاســەتی بەریتانیا لەوکاتەدا بەناڕاستەوخۆ دەگونجا، لەگەڵ ئەوەشدا نــەبووە مایــەی گۆڕانێکی ریشەیی پــۆزەتیڤ لەسیاســەتی بــەریتانیاو عیراقـدا بەرامبــەر بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، چونکە ئــەوە ئــەنجامی جووتباقــەبوونی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بوو لەگەڵ حکومەتی عیراقدا بەرامبەر بەگــەلی کوردو جوڵانەوەکەی.**

---

107 **بڕوانە، جرجیس فتح الله، س پ، ل ٦٧١.**

108 **بڕوانە، محمد عبدالله کاکەسور، س پ، ل ٦٦.**

109 **بڕوانە، عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، س پ، ل ٣٠٩.**

لەگـەڵ هـەموو ئەوانـەی کەخرانـە روو، بـەلای ئێمـەوە هێشـتا ئـەو هەڵوێستەی (شێخ مەحمود)و بۆچوونی ژمارەیەك لەمێژوونووس‌و توێـژەران لەبارەیـەوە جێگـەی تێبینیـە، چـونکە پێیـان وایـە هەڵوێسـتی کـوردو رۆژنامـەکانیان لـەدژی تـورك بـووەو پشـتگیریی لـە لکانـدنی باشـووری کوردسـتان بەعێراقـەوە کـردوە، گوایـە بەرژەوەنـدی کـوردیش لـەو هەڵوێستەدابوو[110]. تێبینیەکەمان لەبەر رۆشنایی ئـەم پرسـیارەیە کـەئایا باشـتر نـەبوو لـەو هەلومەرجـە چارەنووسسـازەو لەبـەردەم لیژنەیـەکی نێودەوڵەتی وەهادا ئامادەی بەردەم لیژنەکـە بووایـەو داخوازیـەکانی گـەلی کـوردی بـەڕوونی بخسـتایە روو، بـەڵام بەچەشـنێك کەتێیـدا رەچـاوی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیاو زۆرترین بڕی مافەکانی گەلی کوردی لەسـنوری ئـەو هەلومەرجـەدا بکردایـە هـەروەها چەسـپاندنی لەهـەر بڕیـارو بەڵگەنامەیەکی نێوخـۆی‌و نێودەوڵەتیـدا کەلەوبارەیـەوە دەردەچـێت؟ یـان بەپێچەوانەوە، ئایا باشـتر نـەبوو کەلەوکاتـەدا درێـژەی بەرووبەڕووبونـەوەی چەکداری لەدژی ئینگلیزو عێراق بدایە تاوەکو گوشـاریان لەسـەر دروسـت بکات‌و کاریگەری لەسەریان هەبێت بەئاراسـتەی سـەلماندنی ئەندازەیـەکی زیاتر لەمافەکانی گەلی کورددا؟

بەبۆچوونی ئێمە ئەو هەڵوێستەی (شێخ مەحمود)، بەنەگرتنەبەری هـیچ کام لەو دووریگەیە پتر لەبەرژەوەنـدی سیاسـەتەکانی عـێراق‌و بـەریتانیادا شکایەوە نەك گەلی کورد، چـونکە سـەرەنجام چارەسـەرەکان جگـە لەچـەند راسپاردەیەکی تایبەت بەهەندێك لەمافە لاوەکیەکانی گەلی کورد، هیچـی لەبارەی مافی چارەنووسەوە بەشێوەی دەوڵەتی سەربەخۆ، یان ئۆتۆنۆمی یان تەنانـەت ناناوەنـدێتی کـارگێڕی لەخۆنـەگرتبوو، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی

---

[110] بڕوانە، ئاکۆ عبدالکریم شوانی، س پ، ل ل ٢١٠-٢١١.

کەلکاندنی ولایەتی موسڵ بەدەوڵەتی عیراقەوە، بووە مایەی پتر پارچە پارچەبوونی گەلی کوردو نیشتمانەکەی بەشێوەیەکی یاسایی‌و سیاسی‌و جوگرافی‌و ئابووری، کەچی مانەوەی باشووری کوردستان لەچوارچێوەی داگیرکاری دەوڵەتی تورکیادا بەهەموو ئەگەرە خراپەکانیەوە، ئەو دوو بەشەی کوردستانی بەیەکگرتوویی دەهێشتەوەو مێژووی سیاسیی گەلی کورد ئاراستەیەکی جیا لەوەی کەڕوویدا وەردەگرت.

## باسی چوارەم
## چالاکییە دیپلۆماسییەکانی رابەرانی را پەڕینەکانی بارزان

بـــارزان وەکـــو یـــەکێك لەمەڵبەنـــدەکانی بزووتنـــەوەی رزگـــاریخوازی نیشـــتمانیو نەتـــەوەیی کوردســـتان بەتایبـــەتی لـــەدوای یەکـــەمین جـــەنگی جیهانیو لکاندنی باشووری کوردستان بەعیراقەوە، پێگەو رۆڵێکی بەرچاوی لەنێو ئەو بزووتنەوەیەدا هەبووە، وەکو لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت.

دەکرێت گرنگترین هەوڵە دیپلۆماسـیەکانی ئـەم بـوارە لەسـەرەتاوە تـا لەسێدارەدانی (شێخ عبدالسلامی دووەم) لە (١٤/١٢/١٩١٤)دا لەچەند خاڵێکدا چڕبکەینەوە:

١-کارکردن لەپێناو چارەسەرکردنی کێشە نێوچـەییەکانی دەوروبـەریو یەکخستنی ریزو هەڵوێستی هۆزو تیرە کوردیەکانی ناوچەکە[111].

٢-هەوڵـدان بـۆ دامەزرانـدنی پەیوەنـدی لەگـەڵ پـارتو کۆمەڵـە کوردیەکانی وەکو (تەعالیو تەرەقی کـورد، کۆمەڵـەی هیڤـی، کۆمەڵـەی سەربەخۆییی کورد کە لەدوای ئاگربەستی مۆدرۆس لە نێوان هاوپەیمانانو عوسمـانی لـەکۆتایی تشرینی یەکـەمی (١٩١٨)دا دامـەزرا، بـەڵام ئـەم

---

111 بڕوانـە، د. کـاوس قفطـان، الانتفاضـات البارزانیـة صـفحات مـن الحرکـة القومیـة التحرریـة الکردیـة في النصـف الاول مـن القـرن العشـرین، ط١، مطبعـة سـرکوتن، السلیمانیة، ٢٠٠٢ ل ل ١٨-٢٠. مسـعود بـارزانی، بـارزانیو بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٥٨، و: سعید ناکام، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨، ل ل، ١٨-٢٠.

**هەولانە نەبوونە مایەی دامەزراندنی پەیوەندیەکی تۆکمە لەنێوانیاندا، بەرپرسێتی ئەوەش خراوەتە ئەستۆی ئەو رێکخراوانە[١١٢].**

**٣-هەوڵدان بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەك لەو کەسایەتیە کوردانەی کەدواتر رابەرایەتی راپەرینە چەکداریەکانی کوردیان کرد وەکو: (شێخ مەحمودی حەفید)، (شێخ عەبدولقادری نەهری)، و(سمایل ئاغای شکاك)[١١٣].**

**٤-ناردنی بروسکە بۆ (دەروازەی بالا) لەئەستەمبوڵ، هەرچەندە داخوازی نێوچەیی لەخۆگرتبوو، بەلام بەدەر نەبوون لەرەهەندو ئاکامی نیشتمانیو نەتەوەیی، وێنەی لێنارد بۆ کەسایەتیە ناودارەکانی کوردستان، لەوانە (شێخ عەبدولقادری نەهری)، (جەنەراڵ شەریف پاشای خەندان)، و(ئەمین عالی بەدرخان)[١١٤].**

**٥-کارکردن لەپێناو پتەوکردنی پەیوەندی دۆستایەتی کورد لەگەڵ کەمینە نەتەوەییو ئاینییو ئاینزایەکانی ناوچەکەدا[١١٥].**

**٦-ووتووێژکردن لەگەڵ بەرپرسانی تورکدا وەکو (نازم پاشا)و (سلێمانی نەزیف) کەلەسەر داوای ئەمان بوو، وەلەئەنجامیدا چەند دەسکەوتێکی کاتی بەدەستهێنا[١١٦].**

---

112 د. کاوس قفطان، س پ، ل ل ٣٤-٣٥. مسعود بارزانی، س پ، ل ١٨.

113 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ٣١، مسعود بارزانی، س پ، ل ١٨.

114 بڕوانە، د.کاوس قفطان، س پ، ل ٢٢، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٨-١٩.

115 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ل(١٨-١٩، ٢٣، ٢٦-٢٨). مسعود البارزانی، س پ، ل١٩.

116 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ٢٦. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٩-٢٠. احمد خواجە، س پ، ل ل ١٠٧-١٠٨.

٧-ئەنجامدانی چاوپێکەوتن بەیاوەری (سمایل ئاغای شکاك) لەگەڵ نێردراوی قەیسەری روسیا لەتفلیس، بەمەبەستی بەدەستهێنانی پشتیوانیو هاوکاری بۆسەرخستنی راپەڕینەکەیو گەیشتن بەئامانجەکانی. لەو دیدارەدا بەڵێنی یارمەتیان پێدرا، بەڵام ئاکامێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوە[١١٧].

## تەوەری یەکەم: سەردەمی (شێخ ئەحمەد بارزانی)

بەرچاوترین کارەکانی (شێخ ئەحمەدی بارزانی) لەم بوارەدا بریتیبوو لە:

١-ئەنجام دانی دیدارو بیروراگۆڕینەوە لەگەڵ سەرکردەکانی تری وەکو (شێخ عەبدولقادری نەهری)و (شێخ سەعیدی پیران)دا[١١٨].

٢-کارکردن بۆ یەکخستنی هەڵوێستی لەگەڵ (شێخ مەحمودی حەفید) لەساڵی ١٩١٩دا بۆ رووبەڕووبونەوەی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بەمافەکانی گەلی کورد[١١٩] لەرێگەی داواکردنی هاوکاریو هەماهەنگی کردنەوە، شایانی ئاماژەپێدانە کەشێخ (ئەحمەد) خۆی دواتر لەساڵی (١٩٣٠)دل داوایەکی لەم چەشنەی (شێخ مەحمود)ی رەتکردەوە.

٣-لەساڵی (١٩٢٨)دا نوێنەری خۆی ناردە لای سەرکردەکانی ناوچەی بادینانو هەر لەو ساڵەدا (شەریف ئاغای بارزانی)ناردە شەمدینان بۆ لای دەسەڵاتدارانی تورکیا بۆ داواکردنی یارمەتی چەكو تەقەمەنی، بەگوێرەی هەندێك سەرچاوە لەو بارەیەوە بەڵێنیان پێداوە[١٢٠].

---

117 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ل ٣٠-٣٢. مسعود بارزانی، س پ، ل ٢٠.

118 بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٢٠-٢١.

119 بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٢٠، ٢٢، دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٧٢. د. عثمان علي، س پ ، ل ل ٥٨٣-٥٨٤.

120 بڕوانە، د. عثمان علي، س پ، ل ل٥٨٢-٥٨٣.

**٤-هەوڵــدان بــۆ پتــەوکردنی پەیوەندیــەکانی لەگــەڵ ئاشــووری‌و ئەرمەنیەکانداو بەهاناوە هاتنیان بۆ رزگاربوون لەستەمی تورکەکان[١٢١].**

**٥-ناردنی (مصطفی بارزانی) وەکو نوێنەری خۆی بـۆلای موتەسـەریفی موسڵ بۆ گفتوگۆکردن لەسـەر بابـەتێکی سـەربازی-رامیـاری دیـاریکراو بەتایبــەتی پرســی بــوونی چــەکداریی حکومــەت لەناوچــەی بــارزان‌و دەوروبەریدا، ئامانجی (شێخ) لەو بوارەدا بەشێوەیەکی کاتیی بەدیهات[١٢٢].**

**٦-پاش بەرپابوونی راپەڕینی بـارزان‌و پەرەسـەندنەکانی، ئـەنجام دانـی رێککەوتنێکی کاتی لە (٣/١٢/١٩٣١)دا لەنێوان نوێنـەری حکومـەتی عیراق (قایمقـامی زێبـار (بلـە)و نوێنـەری (شـێخ ئەحمـەد) کـە(محەمـەد صدیق)ی برای بوو[١٢٣].**

**٧-ئەنجام دانی رێککەوتنێکی ئاگربەست بۆ ماوەی دوو هەفتە لـە (٣-٥/٥/١٩٣٢)دا لەگــەڵ بەرپرســانی ئینگلیــزدا بەمەبەســتی دیــل گۆڕینەوە[١٢٤].**

**لە (١٣/١/١٩٣٢) دا شاندێکی ناردە لای (شێخ رەشیدی لـولان) بـۆ پێکهاتنەوە[١٢٥].**

**٨-دووجار پێشوازیکردن‌و وتووێـژکردن لەگـەڵ نوێنـەری ئینگلیزەکـان (شـێخ نورالـدین بریفکـانی)، بــەڵام وتووێــژەکان هــیچ ئاکامێکیــان لێنەکەوتەوە[١٢٦].**

---

[١٢١] **بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ٢٤، د. عثمان علی، س پ، ل ٥٧٩.**

[١٢٢] **بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ٢٥.**

[١٢٣] **بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ٢٦.**

[١٢٤] **بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٣٥-٣٦. احمد خواجە، س پ، ل١١٢.**

[١٢٥] **بڕوانە، هـ س، ل ٥٨١.**

٩-(شێخ ئەحمەد) لە(٢٠/٦/١٩٣٢)دا نوێنەرانی خۆی (محەمەد صدیق بارزانی)و (حاجی تەها ئامێدی) ناردە لای دەسەڵاتدارانی تورکیا بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەسەر رێوشوێنی بەدەستهێنانی پەنابەرێتی بارزانیەکان لەتورکیا، پاش ئەوەی کەحکومەتی عیراقی تینی بۆ هێنان، بەم شێوەیە لەوێ مانەوە تا بەهاری ساڵی (١٩٣٣) کاتێك حکومەتی تورکیا (شێخ ئەحمەد)ی دایەوە دەست حکومەتی عیراق[١٢٧].

١٠-(شێخ ئەحمەد) ئەوکاتەی لەئەشکی شار لەتورکیا زیندانی بوو، (محەمەد صدیق)و (مصطفی بارزانی) راسپارد کەمەرجەکانی حکومەتی عیراق پەسەند بکەن، لەپاش گەڕانەوەیان بۆ عیراق سەرەتا بۆ موسڵو دواتر بۆ ناسریەو دواتریش بۆ سلێمانی دوورخرانەوە، چونکە پەیوەندیو نامەگۆڕینەوەی لەگەڵ (خلیل خۆشەوی)دا ئاشکرابوو، کە تا ئەو کاتەش لەدژی حکومەت دەجەنگا[١٢٨].

### تەوەری دووەم: مصطفی بارزانی (١٩٤٣-١٩٥٨)

بەرپابوونی دووەمین راپەڕینی بارزان لەساڵی (١٩٤٣)دا کە لەئاکامی نەسەلماندنی مافەکانی گەلی کوردو درێژەدانی حکومەتی عیراقو دەسەڵاتدارانی ئینگلیزەوە بوو بەسیاسەتی سەرکوتکردنو دواخستنی گەلی کوردو ناوچەکەیەوە هاتە کایەوە، زنجیرە چالاکیەکی چەکداریو رامیاری دیپلۆماسی لەباشووری کوردستاندا هێنایە کایەوە. ئەو راپەڕینە

---

126 بڕوانە، د. عثمان علی، س پ، ل ل ٥٨٩-٥٩٠. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٣٧-٣٨.

127 بڕوانە، احمد خواجە، س پ، ل ل ١١٣-١١٤. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٤٠، ٤٤. دیڤید ماکداول، س پ، ل ٣٧٥. هەر لەبارەی ئەو راپەڕینەی بارزانەوە بۆ نمونە بڕوانە، -
Who are the Kurds? www.Culturalorientation.net

128 بڕوانە، دیڤید ماکداول، س پ، ل ل ٣٧٦-٣٧٧.

گۆڕانکاریەکی چۆنایەتی لەئاست راپەڕینە چەکداریەکانی باشووری کوردستاندا هێنایە کایەوە کەئەوەش پتر لەنێوەڕۆکی بەرنامەو ئامانجەکانی راپەڕینەکەو پێگەو رۆڵی رووناکبیرانی کورد تێیداو پەیوەندیکردنی رابەرانیەوە بەحیزبو هێزە رامیاریەکانی کوردەوە وەکو هیواو لیژنەی ئازادی.

لەم بارەیەوە گرنگترین هەوڵە رامیاریو دیپلۆماسیەکان لەچەند خاڵێکدا پوخت دەکەینەوە:

١-حکومەتی عیراق لەرێگەی وەهاب حەمەعەلی ئاغای جندیانی، (مصطفی بارزانی) بۆ وتووێژکردن ئاگادارکردەوەو دواتریش (بارزانی) لە (٢٩/١١/١٩٤٣)دا لەبارەگای خۆی لەگوندی بیستری چاوی بەنێردراوی حکومەت (نوری باویل ئاغای رواندوزی) کەوتو بیروڕاو داخوازیەکانی پێدا نارد بۆ حکومەتو ناوبراو پاش یەك هەفتە دیسانەوە گەڕایەوە لای (بارزانی)و بۆچوونو داخوازیەکانی حکومەتی گەیاندە (بارزانی)، بەلأم سەرەنجام هەردوولایەن داخوازیەکانی یەکتریان نەسەلماند[١٢٩].

(مصطفی بارزانی) لە(پایزی ١٩٤٣) دا زنجیرەیەك وتووێژی لەبارەی مافەکانی گەلی کوردەوە لەگەڵ حکومەتی عیراقدا ئەنجام دا بەنوێنەرایەتی (محمد سعید تکریتی) فەرمانەدەی ئەو هێزە چەکدارانەی عیراق کە لەکوردستاندا مۆڵدرابوو[١٣٠]، بەلأم بەبێ ئەنجام بوو.

---

[129] بڕوانە، د. عثمان علی، س پ، ل ل ٦٠٨-٦١٧. مسعود بارزانی، س پ، ل ٩٨.
هەر دەربارەی راپەڕینەکەی بارزان لەساڵی (١٩٤٣)دا بۆ نمونە بڕوانە Who are the- Kurds? www.Culturalorientation.net

[130] بڕوانە، د. عثمان علی، س پ، ل ٦٢٩.

٢-لەپاش گەڕانەوەی (مصطفی بارزانی) بۆ ناوچەی بارزان. حکومەت لە (٧/١/١٩٤٤)ەوە چەند جارێك نوێنەری خۆی (ماجد مصطفی)ی وەزیری دەوڵەتی رەوانەی لای (بارزانی) كرد تاوەكو ئاگربەست بكرێت‌و وتووێژ ئەنجام بدەن. لەئەنجامی وتوێژەكانی نێوانیان گەیشتنە رێككەوتنێك‌و لەسەر ئەو بنەمایەش حكومەتەكەی (نوری سعید) كە لە(٢٥/١٢/١٩٤٣) دا پێكهاتبوو. بڕیاریدا لەسەر ئازادكردنی (شێخ ئەحمەد)و هەموو دوورخراوەكانی بارزان‌و جێبەجێكردنی بەشێكی داخوازییەكانی بارزانی كە لەچەند خاڵێك پێكهاتبوو، بەڵام دواتر خاڵەكانی رێككەوتنەكە جێبەجێ نەكران، چونكە (نوری سعید) لەژێر فشاری كەسانی توندڕەودا كەپڕۆژەكەیان رەت دەكردەوە لە (٣/٦/١٩٤٤)دا دەست لەكاركێشانەوەی راگەیاندو كابینەی نوێی (حەمدی پاچەچی)ش نابەرپرسیارێتی‌و ناپابەندێتی خۆی بەرامبەر بەو كارەی كابینەكەی پێش خۆی راگەیاند[131]. ئەمەش لەلایەك نیشانەی بڕوانەبوونی بەرپرسانی عێراق بوو بەمافەكانی گەلی كوردو ئامادەبونیان بۆ پێشێلكردن‌و خۆدزینەوە لەهەر بەڵێن‌و رێككەوتنێك تەنانەت ئەگەر لانی كەمی ماف‌و داخوازیەكانی گەلی كوردی لەخۆگرتبێت.

پاش ئەوە (بارزانی)و رێكخراوە كوردیەكان كەوتنە سازدانی بەرەی نێوخۆیی‌و پێكهێنانی (لیژنەی ئازادی)و ناردنی نوێنەر بۆ لای كۆمەڵە كوردیەكانی رۆژهەڵات‌و رۆژئاوای كوردستان، بەمەبەستی یەكخستنی ریزەكان‌و بەدەستهێنانی پشتیوانییان لەكاتی راپەڕیندا[132].

---

[131] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٥١-٥٢، ١٠٤-١٠٦. احمد خواجە، س پ، ل ١١٦. د.عثمان علی، س پ، ل ل ٦٠٨-٦١٠، ٦٢٧، ٦٣١.

[132] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٠٨-١٤٤.

**٣-لەساڵی (١٩٤٤)دا (مصطفی بارزانی) پاش ئـەوەی لەگەشـتێکیدا چەند هۆزێکی باشـووری کوردسـتانی بەسـەرکردەوە، سـەردانی (سـەعید قەزاز)و موتەسەریفی هەولێری کردو هەر لەکۆتاییەکانی مانگی تشـرینی یەکەمی ئەو ساڵەدا نامەیەکی بۆ وەزیری نێوخۆی عیراق نارد، بـەڵام هـیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە[١٣٣]. لەپاش بروسـکەکەی موتەسـەریفی هـەولێر بـۆ (بـارزانی) لـە (١٩٤٥/٣/٢٤)دا لـەدواتردا کۆبوونەوەیـەك لـەنێوان (بارزانی)و (کاپتن سـتۆکس)ی نوێنـەری باڵیۆزخانـەی بـەریتانیا لـەماڵی (مەلا یوسف شاوراوی) ئەنجام درا، بەڵام بـەبێ ئاکـام بـوو، چـەند رۆژێـك پاشتر، دیدارێك لەنێوان (بارزانی)و (قەزاز)و موتەسەریفی هـەولێر ئـەنجام درا کە لەسەر داوای (قەزاز)بـوو، بـەڵام ئـەو دیـدارەش هـەمان نـاوەڕۆك و ئاکامی دیدارەکەی پێشووی (بارزانی-سترۆکس)ی هەبوو[١٣٤].**

**٤-لە (١٩٤٥/٤/٢٠)دا (شێخ ئەحمەد بارزانی) بەبروسکە لەرێگـەی موتەسەریفی هەولێرەوە ئاگادارکرایەوە بۆئەوەی چاوی بە (مێجەر مـۆر) ی نوێنـەری باڵیۆزخانـەی بـەریتانیا بکـەوێت، لەسـەر ئـەو بنەمایـە لـە (١٩٤٥/٤/٢٥)دا گفتوگۆیەك لەنێوانیاندا لەمێرگەسور ئەنجام درا، بەڵام لەبەر نەسەلماندنی نوێنەرەکەی ئینگلیز بۆ داخوازیەکانی کوردو سـووربونی (شێخ ئەحمەد) یش لەسـەر ئـەو داخوازیانـە، گفتوگۆکـەیان بـەبێ ئـەنجام کۆتایی هات[١٣٥].**

**٥-(بارزانی) پـاش ئـەوەی کـە لەهـەنگاوی داهـاتووی دڵنیـابوو، لـە (١٩٤٥/٥/٧)دا نوێنـەرانی خـۆی (مامەنـد مەسـیحی)و (میرحـاج)و (مصـطفی خۆشـناو)ی نـارد بـۆ رۆژهـەڵاتی کوردسـتان بۆئـەوەی لەگـەڵ**

---

133 بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١١٠. د. عثمان علی، س پ، ل ٦٣٢.

134 مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١١٨-١١٩. د. عثمان علي، س پ، ل ٦٣٢.

135 بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٢٠-١٢١.

نوێنەری سۆڤێتیەکاندا گفتوگۆ بکەن، پاش چەند کۆبوونەوەیەك گەیشتنە ڕێککەوتنێك کەتێیدا سۆڤێتیەکان بەڵێنیاندا کەیارمەتیان بدەن دژی هەر دوژمنکاریەك، وەدواتریش (بارزانی) چاوی بە (جەنەراڵ سیامەندۆڤ)کەوت[136]. دیارە ئەم هەڵوێستەی بەرپرسانی سۆڤێتی لەچوارچێوەی ئاکامەکانی دووەمین جەنگی جیهانیو ململانێی نێوان هەردوو بلۆکی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو هاوپەیمانە ناوچەییەکانیانو ئامانجە لەمێژینەکانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤێت لەناوچەکەدا لێکدەدرێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەو هەڵوێستانەیان لەبارەی کوردەوە لەمانۆڕێکی تاکتیکی سنووردارو کورتخایەن تێپەڕی نەکردوە. لەبەرئەوە کاریگەری بنەڕەتی لەتەرازووی هێزەکان لەنێوان گەلی کوردو نەیارەکانی بەجێ نەهێشت.

٦-لە (١٧/٦/١٩٤٥)دا دیدارێکیتر لەنێوان (بارزانی)و (قەزاز) ئەنجام درا، بەڵام بەهۆی هەڵوێستی توندی نوێنەرانی حکومەتی عیراقەوە، نەك هەر ڕێکنەکەوتن، بەڵکو بەجۆرێك کۆتاییهات کەزەمینەی بۆ گرژیو ئاڵۆزی لەنێوانیاندا پتر خۆشکرد[137].

٧-لە (٢٠/٦/١٩٤٥)دا (بارزانی) یاداشتێکی پێشکەش بەباڵیۆزی بەریتانیا لەعیراق کردو تێیدا ناڕەزایی خۆی دەربڕی لەدژی ئەو

---

[136] بڕوانە، ه س، ل١٢٢. د. عثمان علي، س پ، ل ٦٢٦.

[137] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٢٢-١٢٣. د. عثمان علي، س پ، ل ٦٣٣. لەبارەی هەڵوێستی پارتو ڕێکخراوە رامیارییە عیراقیەکان بەرامبەر بەدۆزی نەتەوەیی کورد، بۆ نمونە بڕوانە، مهدی محمد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عیراق، ١٩٤٥-١٩٥٨، چ١ك، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ل ١٦٦-٢٢١.

**پێشـێلكاريانەی کەحکومـەتی عـيراق ئـەنجامی دەدات لـەو رێككـەوتنی ئاگربەستەی کەلەگەڵ حکومەتی (نوری سعيد)دا بەستبوويان[١٣٨].**

**٨-هـەر بەمەبەسـتی رەواندنـەوەی گـرژیو ئـاڵۆزیو بۆخۆپاراسـتن لەپێکدادان لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا، (بارزانی) پاش گەيشـتنەوەی بـۆ بارزان لە(١٨/٨/١٩٤٥)داو دوای پـرسو راوێـژکردن لەگـەڵ ئەنـدامانی ليژنەی ئازادیو (شێخ ئەحمەد)دا، نامەيەکی دە خاڵی بۆ حکومەتی عيراقو باڵيۆزی بەريتانی ناردو وێنەی درايـە باڵيۆزخانـەکانی تـر، بـەلاَم بـەهۆی هەڵوێستی توندی حکومەت بەپشتگيری کردنـی حکومـەتی بـەريتانياوە، ئەم هەوڵەش بەبێ ئاکام بوو[١٣٩].**

**٩- مصـطفی بـارزانی کـە لەسـەر داوای (پێشـەوا قـازی محەمـەد) بانگهێشـت کرابـوو، لـە (٢٢/١/١٩٤٦)دا بەشـداری کـرد لـەرێورەسمی جـاردانی کۆمـاری کوردسـتان لەشـاری مـەهابادا[١٤٠]، هـەروەها دواتـر بەسيفەتی ليپرسراوی هێزی بارزانيـان لـەکارەکانی کۆمارەکـەدا بەشـداری کرد[١٤١].**

---

[138] **بڕوانە، د. عثمان علي، س پ، ل ل ٦٣٤-٦٣٥.**

[139] **بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٢٤-١٢٥.**

[140] **بڕوانە، احمد خواجە، س پ، ل ١١٧، مسعود بارزانی، س پ، ل ١٤٩**

-Barbara Harff. Ted Robert Gurr، op، cit، P49.

-Kurds History، Kurdish History timeline، www.infoplease.com.

[141] **بڕوانە، احمد خواجە، س پ، ل ١٥٤، مسـعود بـارزانی، س پ، ل ١٤٩، د. عثمـان علي، س پ، ل ل ٧٠١-٧٠٢.**

-Who are the Kurds? www.culturalorientation. net

١٠-(بـــارزانی) بەســـەرۆکی پـــارتی دیمـــوکراتی کوردســـتان کـــەتازە دامەزرابوو هەڵبژێردراو یەکـەمین کـۆنگرەی خـۆی لـە(١٦/٨/١٩٤٦)دا لەشاری بەغداد بەست[١٤٢].

١١-لەپاش هەرەسهێنانی کۆماری کوردستان لەمەهاباد، (بارزانی) لە (٣١/١٢/١٩٤٦)دا بەیاوەریی شـاندێك دیـداری لەگـەڵ شـاو سـەرۆكو وەزیرانو سەرۆکی سوپاو بەرپرسانی تـری ئێرانـی ئـەنجام دا، بەمەبەسـتی گفتوگۆکردن لەسەر پرسی چارەنووسیان لەئێراندا لەوەودوا[١٤٣]. بەڵام بەهۆی سەرنەگرتنی گفتوگۆکانو رێکنەکەوتنیان لەسەر رێوشوێنێکی گونجـاو بـۆ هەردوولایان پێکدادانی سەربازی تووندوتیژ لەنێوانیانـدا روویـداو بـەهۆی نابەرامبەریی لەنێوان هێزەکانیـان کەشـیاوی بـەراوردکردن نـەبوو، وێـڕای بەرگریکردنی بوێرانەی هێزەکانی (بارزانی)، بـەڵام سـەرەنجام بەپـەڕەوازەیی لەوڵاتی یەکێتی سۆڤێت وەکو پەناهەندە گیرسانەوە[١٤٤].

١٢-(بارزانی) لەنێوان ساڵانی (١٩٥٤-١٩٥٨)دا سەردانی تاشـقەندو کۆمـاری ئـەرمینیاو رۆمانیـاو چیکوسـلۆفاکیاو میسـری کـردو دیـدارو

---

[142] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٥٨-١٦٠. د. عثمان علي، س پ، ل ٧٣٥.

[143] بڕوانە، د. عثمان علي، س پ، ل ٧٧١. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٧٠-١٧٢.

[144] بۆ وردەکارییەکانی ئەو قۆناغەو پەڕینەوەی بارزانیو یاوەرانی لەئاوی ئاراسو چوونە ناو وڵاتی یەکێتی سـۆڤێتەوە، بـۆ نمونـە بڕوانـە، نەجـەف قـولی پسـیان، علـی حسـن تەفرشیان، مورتەزا زەربـەخت، بـارزانی لەمـەهابادەوە بـۆ ئـاراس، و: شـەوکەت شـێخ یەزدین، چـ٢، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هـەولێر، چ١، ٢٠٠١، ل ل ٢٣١-٢٣٢. کریس کۆچێرا، بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردو هیوای سەربەخۆیی، و: ئەکرەمی میهـرداد، ب١، سەنتەری چاپو پەخشی تەما، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ٣٣. Christiane Bird op.cit ، pp 186–87

گفتوگۆی لەگەڵ ژمارەیەك لەبەرپرسانی پایەبەرزی ئەو وڵاتانـەدا كـرد[١٤٥].
بەگەڕانەوەی (بارزانی) بـۆ عـیراق لـەپاش رووخـانی سـستمی پاشـایەتیو راگەیاندنی سستمی كۆماری لەوڵاتدا لەساڵی (١٩٥٨)، قۆناغێكی نـوێی خـەباتی رامیـاریو دیپلۆماسـیو چـەكداری گـەلی كـورد لەباشـووری كوردستاندا دەستپێدەكات.

بەلێكدانـەوەی سیاسـەتو هەڵوێسـتی ئـەو سـەركردانە دەردەكـەوێت كەبڕوایان بەرێگەچارەی ئاشتیانەی كێشەكان هەبووەو بایـەخی رێوشـوێنی رامیاریو دیپلۆماسیان بۆ گەیشتن بەئامانجەكان زانیوەو كاریان پێكـردووەو هەمـوو ئەو رێوشوێنو ئامرازانەیان بـەكارهێناوە كەهەلومـەرجی تایبـەتی ئەو سەردەمەی كوردستانو عـیراقو ناوچـەكە دەیڕەخسـاند، بەشـێوەیەكی پێشكەوتووتر لەسەركردە كوردەكانی تری پێش خۆیان بەشێوەیەكی گشتی، لەچەشـنی نامەگۆڕینـەوەو پێشكەشـكردنی یاداشـتنامەو رەوانـەكردنی نێردراوی تایبەتیو پێشوازی كـردن لـەنێردراوانی لایەنـەكانی بەرامبـەرو گفتوگـۆكردن لەگەڵیانـداو دامەزرانـدنی حـزبو رێكخـراوی رامیـاریو كەلتوری نەتەوەییو پێكەوە گرێدانی خەباتی چەكداریو مـەدەنیو تێكـەڵ بوونی پتری روناكبیرانی كورد لەگەڵ بزووتنەوەكەداو كەڵك وەرگرتن لەتوانا فرە لایەنەكانیانو... هتد، هەروەها پەیوەندی كـردن بەكەسـایەتیو لایەنـە كوردیو ناكوردیەكانی باشوورو هەندێك جار پارچەكانی تری كوردستانەوە، بەمەبەسـتی یەكخسـتنی هەڵوێسـتو هاوكـاری كردنـی یـەكتری، بـەڵام ئاستەنگە سەرەكیەكانی بەردەمیان بریتیبوو لەباری دواكـەوتوویی گشـتی لەكوردستاندا لەڕووی بنەمای ئابووریو پێكهاتـەی كۆمەڵایـەتیو ئاسـتی روناكبیریـەوە، دیـارە ئـەو رابەرانـەش هـەڵقوڵاوی ئـەو كۆمەڵگەیـەنو

---

[145] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٢١٢-٢١٤.

کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەو بارودۆخە سەپاوەوە، ئەمە وێڕای باڵادەستی هەردوو دەوڵەتی بەریتانیاو عیراقو هەماهەنگیان لەسەرکوت کردنی گەلی کوردو داخوازیەکانیانداو هەڵوێستی نێگەتیڤی زۆرێك لەولاتانی جیهان کەپشتیوانیان لەسیاسەتەکانی بەریتانیاو عیراق لەوبارەیەوە دەکرد، بەتایبەتی ولاتانی داگیرکەری کوردستان*.

* سەرکردە کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانیی نێودەولەتی بۆ دۆزی نەتەوەیی کورد نەیانتوانی ئامانجو خواستە نەتەوەییە رەواکانیان لەگەڵ بەرژەوەندیە هەمەچەشنەکانی ولاتانی زلهیزدا بگونجێنن، کەهۆکاری سەرەکیشی دەگەرێتەوە بۆ جوتباقەبوونی بەرژەوەندیەکانی ئەو ولاتانە لەگەڵ ولاتانی داگیرکەری کوردستاندا بە بەراوردی بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ کورددا بەم شێوەیە بزوتنەوەی کوردی لەو قۆناغەدا بێ بەشبوو لەپشتیوانی راستەقینەی نێودەولەتی، ئەمە وێڕای هاریکاریو هەماهەنگی ولاتانی داگیرکەری کوردستان لەگەڵ یەکتریدا لەدژی بزوتنەوەکانی کورد. بۆ زانیاریی پتر لەوبارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە: عزيز حسن عزيز البارزاني، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية (العراق) ١٩٣٩-١٩٤٥. اطروحة ماجستير غير منشورة كلية الاداب جامعة صلاح الدين، اربيل ٢٠٠٢، ص ص ٣٩-٤٥.

## باسی یەکەم

# کودەتای ساڵی ١٩٥٨ و سیاسەتی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لەبارەی مەسەلەی کوردەوە

لەبەر رۆشنایی‌ی ماك‌و سروشتی تایبەتی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد بەگشتی‌و بەردەوامبونی کێشەکەی بەچارەسەرنەکراوی، بزووتنەوەکەی درێژەی هەبوو، شکستهێنانی راپەڕینەکانی کۆتایی بەهەوڵەکانی گەلی کورد بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی بەشێوازە جۆراوجۆرەکانی خەباتی چەکداری‌و رامیاری‌و دیپلۆماسی‌و رووناکبیری نەهێنا. سەبارەت بەباشووری کوردستانیش، لەپاش هەرەسهێنانی حکومەتەکانی (شێخ مەحمود)و راپەرینەکانی بارزانەوە، لەدوا ساڵەکانی فەرمانڕانی پاشایەتیدا لەعیراق، گەلی کورد وەکو بەشێك لەلایەنە نەیارەکانی حکومەت لەو سەردەمەدا، زۆربەیان لەنێو ریزەکانی پارتی‌و کەمینەیان لەنێو پارتی کۆمۆنیستی عیراقدا گیرسابوونەوە.

پاش ئەوەی کە (بەرەی نیشتمانی یەکگرتووی ساڵی (١٩٥٤) لەکارکەوت، لەمانگی شوباتی (١٩٥٧)دا بەرەی یەکێتی‌ی نیشتمانی کەچوار پارتی لەخۆگرتبوو پێکهات*، پارتی هەرچەندە بەشدار نەبوو

---

* پارتەکان بریتیبوون لەپارتی کۆمۆنیستی عیراق، پارتی سەربەخۆیی، پارتی نیشتمانی دیموکراسی، پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی، بڕوانە: منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق "البعث والاكراد" ط١ دار المختار، دمشق، ٢٠٠٠، ص ١٠٤، د. محمود الدرة، القضية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦، ص ٢٦٨. حامد الحمداني، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ وعودة الزعيم البارزاني،www.sotaliraq.com .

تێیدا[1]، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی لەگەڵدا بەست، بەتایبەتی لەڕێگەی پارتی کۆمۆنیستی عیراقەوە[2]. دیارە ئەو بەرەیە هەماهەنگی لەگەڵ (لیژنەی باڵای ئەفسەرە ئازادەکان) هەبوو کە لەناویدا ژمارەیەك ئەفسەری کوردی تێدابوو، لەوانە (عقید عبداللە سعید، عقید عبدالفتاح شالی، رائدی روکن مصطفی عزیز)[3].

لەشەوی (١٣-١٤/٧/١٩٥٨)دا ئەو هێزە سەربازیەی کە بەسەرکردایەتی زەعیم (عبدالکریم قاسم) رووەو ئوردن بەرێ کەوت، ئاراستەی خۆی بەرەو بەغداد گۆڕیو چووە نێو کۆشکی شاهانەوەو حکومەتی پاشایەتی رووخاندو حکومەتی کۆماری راگەیاند[4].

---

[1] بڕوانە: شازین هێرش، بەڵگەنامە، پارتی دیموکراتی کوردستان-عیراق لەچەندین بەڵگەنامەی مێژوویيدا، ١٩٥٨-١٩٦٣، ب١، چ١، چاپخانەو ئۆفسێتی ژیر، سلێمانی، ٢٠٠٣ ل١٥. حامد الحمداني، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ وعودة الزعيم البارزاني، (في):www.sotaliraq.com. بەپێی سەرچاوەی ئاماژەپێکراو لەسەرەتادا رێگە بەپارتی نەدرا بێتە نێو ئەو بەرەیەوە، دواتریش خۆی بەباشی نەزانی بەشدار بێت بەبێ پرس کردن بەسەرۆك (جمال عبدالناصر).

[2] بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانیو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٥٨-١٩٦١، و: سعید ناکام، چ١ ك، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٨٨ ، ل ل ٢٠-٢١، ٣٤. منذر الموصلي، س پ، ل ١٠٤. د. شیرکو فتح الله عمر، الحزب الديمقراطي الكوردستاني وحركة التحرر القومي الكردية في العراق ١٩٤٦-١٩٧٥، ط١، مطبعة رون، السليمانية، ٢٠٠٤، ص ص ١٢٤-١٢٥. شایانی ئاماژەپێدانە کەپارتی لەئازاری ١٩٥٩دا چووە ناو ئەو بەرەیەوە، بۆ زانیاریی پتر لەوبارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، ه س، ل ١٣٦.

[3] بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ٢١.

[4] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٠٥-١٠٦.

لەو قۆناغەدا مێژوی سیاسیی عیراق چەند ڕووداوێکی بەخۆوە بینیو سەرەنجام کۆمەڵێك گۆڕانکاری ڕواڵەتی لەسەر هەموو ئاستەکانی نێوخۆیی عیراقو نێوچەییو نێودەوڵەتی هێنایە کایەوە. لەچەشنی گۆڕانی جۆری سستمی فەرمانڕانی عیراقو تۆڕی پەیوەندیە نێوچەییو نێودەوڵەتیەکانی، وە لەسەر ئاستی دۆزی گەلی کوردیش لەباشووری کوردستاندا، سەرەتای قۆناغێکی نوێی خەبات لەبزوتنەوەی نەتەوەیی کورددا دەستپێکرد، کە لەسەرەتاوە بەهیواو گەشبینیەوە پێشوازی لێکردو بەشداری لەڕووداوەکانیدا کرد، بەڵام لەئاکامدا سیاسەتەکانی حکومەتەکەی (قاسم) بەپێچەوانەی خواستو ئامانجو بەرژەوەندیەکانی ئەم گەلە شکایەوە، لەبەر چەندین هۆی نێوخۆییو دەرەکی.

لەسەرەتاوە سەرکەوتنی کودەتاکە بووە مایەی شادمانیو جێگەی ئومێدی گەلانی عیراق، بەگەلی کوردیشەوە، کە بەچەندین شێواز گوزارشتیان لێکرد[5]، فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی نیشتمانی یەکەمین بەیاننامەی لەو ڕۆژەدا دەرکرد، ئاماژەی بەپێکهێنانی (ئەنجومەنی سەروەریی) کرد کەپێکهاتبوو لە (محمد نجیب ربیعی)

---

-Peter Slug let، op،cit،o88.

-History of Iraq، New internationalist. Sept. 1999، www. Findarticlea.com.

-Kurds. www.bartleby.com/History.www.Findarticles.com.

-Barbara Harff،Ted Robert Gurr.op.cit.P51.

-Kassem، Abdul karim، www.infoplease.com.

-Iraq.History.www.infoplease.com.

[5] بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ٢٣. شازین هێرش، س پ، ل ٧.

عەرەبی سوننیو (محمد مهدی کوبه)ی عەرەبی شیعیو (عەقید خالد نەقشبەندی) کورد[٦].

هەروەها لەپێکهاتەی یەکەمین حکومەتیشدا کەسیازدە شالیاری لەخۆگرتبوو، دووانیان کورد بوون، ئەوانیش، (بابەعلی شێخ محمود)و (دکتۆر محمد صالح) بوون، بەڵام هەردووکیان کەسایەتی سەربەخۆ بوون[٧].

---

[6] بۆ دەقی بەیاننامەی ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٥٨، بڕوانە: محمود الدرة، القضية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦، ل ل ٢٦٩-٢٧٠. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٢٤-٢٥. منذر الموصلي، س پ، ل ١٠٨. شایانی ئاماژەپێدانە کە عبدالسلام عارف پاڵاوتنی خالید نەقشبەندی (١٩١٥-١٩٦١) بەگوتەی خۆی بۆ ئەوە گێڕایەوە کەیەکێك بووە لەهاوڕێ نزیکەکانیو هەستی ئیسلامی هەبووەو پشتگیری لەعیراقو یەکێتی عەرەبی کردووە، وەلێی نەزانراوە کەهەڵگری هەستێکی کوردانەی بەهێز بێت کەرۆژێك لەرۆژان ببێتە مایەی مەترسی بۆ سەر سستمی فەرمانڕانیو هەروەها هیچ پابەندێتییەکی رامیاری بەهیچ پارتێکەوە نەبووە، وێڕای ئەوەی کەلەسەرخۆو رەوشت بەرزە. بڕوانە: کریم مراد عاتي، مجلس السيادة العراقي والقضايا الوطنية والقومية في العراق للمدة ١٩٥٨-١٩٦٣، اطروحة ماجستير غير منشورة، المعهد العالي للدراسات السياسية والدولية، جامعة المستنصرية، بغداد، ٢٠٠٣، ص ٤٤. (رشاد عارف محمود ١٩١٠-١٩٩٩) جێگەی خالد نەقشبەندی گرتەوە کە لەتشرینی یەکەمی ١٩٦١دا کۆچیدوایی کرد. بڕوانە هـ س، ل ١٢٢.

هەروەها بۆ زانیاری پتر لەبارەی (ئەنجومەنی سەروەریی)و (ئەنجومەن وەزیران)ەوە بۆ نمونە بڕوانە: علي جاسم العبيدي، رئيس الدولة في العراق (٢٣اب ١٩٢١-١٦تموز ١٩٦٨)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية القانون والسياسية، جامعة بغداد، ١٩٨٣، ص ٢٤٨. مؤيد ابراهيم الونداوي، وثائق ثورة تموز ١٩٥٨ في ملفات الحكومة البريطانية، ط١، بغداد، ١٩٩٠، ص ص ٣٣٣-٣٣٧. حامد الحمداني، س پ، www.sotaliraq.com.

[7] بڕوانە: نوري العاني واخرون، تاريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري، ج١، بغداد، ٢٠٠٠، ص ٣٦، مسعود بارزانی، س پ، ل ٢٥.

سەبارەت بە هەڵوێستی گەلی کوردو پارتی لەکودەتاکەیساڵی (١٩٥٨)، پێویستە ئاماژە بەو راستیە بکەین کەزۆربەیان لەسەرەتاوە بەشداری لەبزوتنەوەی دیموکراتیخوازی نیشتمانی عیراقدا بەگشتی کردووە، وەپارتی ئەوەندەی بۆی رەخسابێت هاوشانی پارتو هێزە نیشتمانیەکانی تری عیراق هاوکارو هەماهەنگ بووەو هەروەك چۆن بڕوای بەخەباتی چەکداری هەبوو بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی گەلانی تری عیراق، بەو شێوەیەش بایەخی خەباتی رامیاریو دیپلۆماسی زانیوە، بەپێچەوانەی هەندێك پارتەکانی تری عیراق، هەر لەسەر ئەو بنەمایە پشتیوانی بۆ کودەتاکەی سوپای عیراق دەربڕیو بەشداری کرد لەو هەوڵانەی کەدەدران لەپێناو گۆڕینی بەرەو شۆڕشێکی نیشتمانیو دیموکراتی راستەقینە[٨].

بەم شێوەیە دەشێت پشتگیری کردنی کورد لەکودەتای ساڵی (١٩٥٨) بۆ ئەم هۆکارانە بگێڕینەوە:

١-جۆری سیاسەتەکانی بەریتانیاو عیراق لەمەڕ دۆزی نەتەوەیی کورد، بەدرێژایی ساڵانی حوکمڕانێتی پاشایەتی لەعیراقدا.

٢-هەبوونی پەیوەندی هاوکاریو رێککاری لەنێوان سەرکردایەتی کوردو پارتو لایەنە نەیارەکانی ناو عیراق لەدژی سیاسەتەکانی بەریتانیاو حکومەتی پاشایەتی عیراقدا لەچالاکی بەردەوامدابوون، واتا هاوئامانجیو هاوخەباتی لەو قۆناغەدا.

٣-دروشمو هەڵوێستە بەراییەکانی رابەرانی کودەتاکەی ساڵی (١٩٥٨) بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ بەشێك لەدروشمو ئامانجە گشتیەکانی پارتیدا یەکیدەگرتەوەو لەو رووەوە هیوابەخش بوون بۆ دیموکراتیخوازانی عیراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی.

---

[8] بڕوانە: جلال الطالباني، کوردستان والحركة القومية الكردية، مطبعة الجمهورية، بغداد، ١٩٦٩، ص ١٧٦.

٤-هەڵوێستی پۆزەتیڤی وڵاتانی وەکو یەکێتی سۆڤیەتو میسر بەرامبەر بەکودەتاکەو ڕێنمایی کردنیان بۆ دەسەڵاتدارانی نوێی عیراق کە لەسنورێکی دیاری کراودا ڕەچاوی مافەکانی گەلی کورد بکەن.

٥-مەترسی کورد لەئاکامە خراپەکانی کاردانەوەی ئەو دەوڵەتانەی کەکودەتاکە زیانی بەدەسەڵاتو بەرژەوەندیان لەعیراقو ناوچەکەدا گەیاند، بۆ نمونە وەکو بەریتانیاو ئەمریکاو تورکیاو ئێران، کاردانەوەیەك لەچەشنی ڕوخاندنی سستمی کۆماری یان داگیرکردنو دابەش کردنی باشووری کوردستان لەنێوان وڵاتانی وەکو تورکیاو ئێراندا، بەتایبەتی ئەگەر ڕەزامەندی وڵاتانی وەکو ئەمریکاو بەریتانیای لەسەربوایە.

لەم ڕوانگەیەشەوە کورد بەرژەوەندیی خۆی لەسەرخستنی کودەتاکەو چەسپاندنی کۆڵەکەکانی سستمی کۆماریو دوورخستنەوەی هەبوونو دەسەڵاتی ئەو وڵاتە نەیارانە لەناوچەکەدا دەبینیەوە.

بەبۆچوونی ئێمە کاتێك سەرکردایەتی کوردی، بەڕەچاوکردنی هەلومەرجەکانو پێشبینی کردنی ئەگەرەکان ڕێگەی پشتیوانی کردنی لەپرۆسەکەو ئەنجام دانی گۆڕانکاری ڕامیاری هەڵبژارد، لەبری هەڵوێستی دوورەپەرێزی یان لەدژ وەستان، هەنگاوێکی دروستی نا.

لەوبارەیەوە (ابراهیم احمد) دەڵێت "پاش ڕاگەیاندنی شۆڕش بەکەمتر لەکاژێرێك، سەرکردەکانی حزب لەکەرکوکەوە بروسکەیان بۆ سەرکردایەتی هێزە چەکدارە نیشتمانیەکان لێداو پشتگیریان لەشۆڕشی پیرۆز ڕاگەیاندو هیوایان خواست کەسەرەتای سەردەمێکی نوێ بێت لەدامەزراندنی پەیوەندی بەتینی عەرەبی-کوردی کەچاکەو پێشکەوتنی هەردوو گەلی تێدابێت"[9].

---

[9] هـ س، ل ١٧٦. د. سعد ناجی جواد، المسألة الكردية في العراق ١٩٥٨-١٩٧٠، دار اللام، لندن، ١٩٩٠، ص ٣٦. مسعود بارزانی، س پ، ل ٣٤.

له (١٦/٧/١٩٥٨)دا پارتی بەیانێکی بۆ گەلی کورد بڵاوکردەوە، کەلیژنەی ناوەندیی بەکۆی دەنگ پەسەندی کردبوو، تێیدا جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کەپارتی پێی وایە هەلومەرجی نوێی عیراق زەمینە بۆ ژیانێکی پڕ لەئازادیو یەکسانی نێوان هەردوو گەلی عەرەبو کورد دەرەخسێت لەبەرئەوە بەهەموو توانایەوە بەرگری لەکۆماری عیراقو چەسپاندنو گەشەسەندنی دەکاتو هەموو تواناکانی دەخاتە ژێر دەسەڵاتی سەرکردایەتیەکەیەوە وەئامادەیە هەموو ئەندامو لایەنگرانی خۆی وەکو گیانبەخش سازبدات بۆ ئەو ئامانجە[10].

بارزانیش سەرۆکی پارتی دوای گەڕانەوەی لەیەکێتیی سۆڤیێت چەند جار ئەوەی دەربڕی کەئەو سەربازێکە لەسەربازەکانی کۆماری عیراق وەدەچێتە ژێر فەرمانی سەرکردایەتی (عبدالکریم قاسم)ەوە[11]. هەر بەو ئاراستەیەدا، پارتی دەستە نێردراوی خۆی بەسەرۆکایەتی ابراهیم احمدو ئەندامێتی (علی عبدالله)و (نوری احمد طه) ڕەوانەی بەغداد کردو لە (٢٧/٧/١٩٥٨)دا سەردانی دەسەڵاتدارانی حکومەتی نوێیان کردو سکرتێری پارتی لێدوانێکی گرنگی داو تێیدا دۆزی کوردو ئامانجو خواستەکانیو هەڵوێستیان لەمەڕ حکومەتی نوێی عیراقو پەیوەندیەکانی نێوان کوردو عەرەب خستە ڕوو[12].

---

[10] بۆ دەقی بەیانەکە بڕوانە: جلال الطالباني، س پ، ل ١٧٦. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، ط١، بغداد، ١٩٨٩، ص ١٩١. مسعود بازانی، س پ، ل ل ٣٤-٣٥.

[11] بڕوانە: جلال الطالباني، س پ، ل ١٧٧. مسعود بارزانی، س پ، ل ٣٥.

[12] بۆ دەقی لێدوانەکەی (ابراهيم احمد)، بڕوانە: جلال الطالباني، س پ، ل ل ١٧٧-١٨١، ١٩٥. مسعود بارزانی س پ، ل ل ٣٥-٣٨.

(قاسم) لەو دیدارەی کەلەگەڵ شاندە کوردیەکەدا ئەنجامی دا، جەختی لەسەر برایەتی هەردوو نەتەوە کردەوەو بەشێوەیەکی سەرپێیی‌و تەم‌و مژاوی ئاماژەی بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد کردو بانگهێشتی گەڕانەوەی (بارزانی) بۆ وڵات دووپات کردەوە، وەئاماژەی بەوەدا کە"بارزانیەکان لەتاراوگەداو لەسایەی حکومەتی پێشووتردا دووچاری کێشەو نا ئاسودەیی زۆر بوون، پێویستە ئێمە نەرمتر بین لەگەڵیاندا"[13]، جێگەی سەرنجە کەئەم گوتەیە هیچ ئاماژەیەك بۆ سروشت‌و ناوەڕۆکی رامیاری دۆزی نەتەوەیی گەلی کوردو خواست‌و ئامانجەکانی تێدا نیە.

وێڕای ئەوەش سەرلەبەری دۆزەکەی لەئاوارەبوون‌و مەینەتیەکانی بارزانیەکاندا چڕکردەوەو چارەسەرەکەشی لەنواندنی ئەندازەیەك نەرمی لەگەڵیاندا خستەڕوو. لەهەلومەرجێکی لەو چەشنەدا، هەرجۆرە هاوکارییەك کەپێشکەش بەدەسەڵاتدارانی نوێی عیراق بکرێت بایەخی تایبەتی خۆی دەبێت، لەبەر ئەوە هەڵوێستی لایەنگیری‌و پشتیوانی پارتی‌و گەلی کورد بۆیان، کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر بەهێزکردنی پێگەو دەسەڵاتی ئەو حکومەتەو بێهێزکردنی نەیارەکانیدا.[14] شایانی ئاماژەپێدانە کەرۆڵی دیپلۆماسی سەرکردایەتی پارتی‌و خودی (ابراهیم احمد) کاریگەر بوو لەقایلکردنی (قاسم)دا بۆ رێگەدان بەگەڕانەوەی (بارزانی)و یاوەرانی بۆ عیراق، چونکە سەرکەوتنی هەوڵەکانی گەڕانەوەی (بارزانی) رێگەی بۆ سەرکەوتنی تر خۆشکرد لەچەشنی خستنە رووی دۆزی نەتەوەیی کوردو داخوازیەکانی‌و دواتر هەڵگیرساندنی بزووتنەوەی چەکداریی نەتەوەیی کورد لەباشووری کوردستان‌و...هتد.

---

[13] د. سعد ناجي جواد، س پ، ل ٣٧.

[14] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ١٨١. مسعود بارزانی، س پ، ل ٣٨.

شێخ احمد بارزانیش پێشتر هەر ئەو هەڵوێستەی نواند پاش ئەوەی کە لە(١٩٥٨/٧/٢١)دا دوای دوازدە ساڵ زیندانی سەردەمی پاشـایەتیدا، لەلایـەن دەسـەڵاتدارانی نوێـوە ئـازاد کـرا، کـە بـەلای بارزانیەکانـەوە بەتاییەتی بەهەنگاوێکی گەورە لێکدرایەوە، لەدواتردا سەردانی وەزارەتی بەرگری کردو (قاسم)ی بینیو بۆ بەکەمجار دڵسۆزی خۆی بـۆ حکومـەتی نوێو سەرکردەکەی دەربڕی.[15] (بارزانی) ئەوکاتەی کەهێشتا لەمۆسـکۆ بوو هەواڵی کودەتاکەی عیراقی بیستو بەپەلە کاری بۆ گەڕانـەوە کـرد، لە (١٩٥٨/٨/٢١)دا لەگەڵ (میر حـاج احمـد)و (اسـعد خۆشـەوی)دا لەمۆسکۆوە بـەرەو رۆمانیـا بەرێکـەوتنو سـەرۆکی رۆمانیایـان بینـی، لەبۆخارستەوەو لەرێگەی باڵیۆزخانـەی کۆمـاری عـەرەبی یـەکگرتووەوە بروسکەیەکی پیرۆزبـایی بـۆ (قاسـم) نـاردو تێیـدا داوای رێگەپێـدانی گەڕانەوەیانی لێکرد[16]، وەدواتر بۆ پراگ چوو سەرۆکی چیکۆسـلۆفاکیای بینیو لە (١٩٥٨/٨/٢٩) دا نامەیەکی بۆ هەمان مەبەستی پێشوو بۆ (قاسم) ناردو[17] ئەمیش لە (١٩٥٨/٩/٢)دا وەڵامی نامەو بروسکەکەی بەئـەرێی دایـەوە.[18] لـە (١٩٥٨/٩/١٠)دا دوا بروسـکەی پیرۆزبـاییو دەربڕینی پشتیوانی سوپاسگوزاری بـۆ نـارد.[19] لـە (١٩٥٨/١٠/٣)دا بـارزانیو شـەش کـوردی یـاوەری لەپراگـەوە گەیشـتنە قـاهیرەو لـە (١٩٥٨/١٠/٤)دا سـەرۆکی میسـر (جمـال عبدالناصـر)، پێشـوازی

---

[15] بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ٣٩.

[16] بڕوانە: د. مجید خدوری، العراق الجمهوری، ط١، مطبعة امیر، قم، ١٩٦٨، ص ٢٣٧.

[17] بۆ دەقی بروسکەکە بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٤٠-٤٢. منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٠٩-١١٠.

[18] بۆ دەقی وەڵامەکەی (عبدالکریم قاسم) بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ٤٢.

[19] بۆدەقی ئەو بروسکەیە بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٤٢-٤٣.

لێکردن و پێخۆشبوونی وڵاتەکەی بۆ گەڕانەوەیان دەربڕی. ئەمە هەڵوێستێکی هاوجووتە لەگەڵ هەڵوێستی یەکێتیی سۆڤێت و کامپی سۆشیالیستی.[20] لە (٦/١٠/١٩٥٨)دا (بارزانی) گەیشتەوە بەغدادو بۆ رۆژی دوایی سەردانی (قاسم)ی کردو سوپاسگوزاریو منەتباری خۆی پێشکەش کرد[21]، ئەوەشی دووپاتکردەوە کە "ئەو خۆی بەسەربازێکی شۆڕشی تەمموز دەزانیو لەژێر فەرمانی زەعیمدایە[22]، لەبەرامبەردا (قاسم) رێزی لەخۆیو بنەماڵەکەی گرت[23]. هەر لەشاری بەغداد ماڵەکەی (بارزانی) بووە جێگەی چالاکی رامیاری کوردەکانو لەدیدەنی دەستە نێردراوەکانی ژمارەیەك لەشارەکانی عیراق کەبۆ بەخێرهاتنەوەی هاتبوون، گوتارێکی کورتیدا کەناوەڕۆکەکەی دووپاتکردنەوەی هەڵوێستەکانی پێشووتری خۆیو هەڵوێستی پارتی لەمەڕ دۆزی کوردو حکومەتی کۆماری عیراق بوو[24].

---

[20] بڕوانە، هـ س، ل ل ٤٧-٤٨. منذر الموصلي، س پ، ل ١١٠، صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق قراءة في ملفات الحركات والاحزاب الكردية في العراق (١٩٤٦-٢٠٠١) بيروت، ٢٠٠١، ص ٧٣.

[21] بڕوانە: د. مجيد خدوری، س پ، ل ٢٣٧.

-Christiane Bird op، cit، pp20، 187.

-Who are the Kurds? www.culturalorientation.net.

[22] مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٤٣-٤٤.

[23] بڕوانە: د. مجيد خدوری، س پ، ل ٢٣٧. جلال الطالباني، س پ، ل ١٧٧. منذر الموصلي، س پ، ل ل ١١٠-١١١. محمود الدرة، ل ل ٢٨٠-٢٨٤.

[24] بۆدەقی وتارەکە بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ل٤٤-٤٥. منذر الموصلي، س پ، ل ١١١.

لەمانگی نیساندا (بارزانی) نامەیەکی سوپاسگوزاری بەبۆنەی گەڕانەوەی (٧٨٤)کەس لەیاوەرانی خۆی بۆ عیراق پێشکەش بە(قاسم) کردو بەڵێنەکانی پێشووی دووپاتکردەوە[٢٥]، هەروەها پارتی لەدرێژەی چالاکیە رامیاریەکانیدا، لەمانگی تشرینی دووەمی (١٩٥٨)دا بەشداری کرد لەدانانو مۆرکردنی پەیمانێکی هاوبەش لەگەڵ چوار پارتی تردا کەچوار خاڵی لەخۆگرتبوو[٢٦]، بەلاّم هاتنە پێشەوەی رووداوی نویۆ ئالۆزبوونی پەیوەندیەکانی نێوانیان، بووە مایەی سەرنەگرتنی پەیمانەکەو جێبەجێنەکردنی خاڵەکانی[٢٧]. لەم قۆناغە ناسکەدا پارتی یەکێك لەو سێ پارتەبوو کە (قاسم) لەسەرەتادا پشتی پێبەستن لەپێناو جێگیرکردنی دەسەلاّتی خۆی، پێش ئەوەی پەنا بەرێتەبەر سیاسەتی هاندانیان لەدژی یەکتریو کارکردن بۆ پەرتکردنیان[٢٨].

لەپاش کودەتاکە، یەکێك لەو بابەتانەی کەپارتەکانی عیراق نەیانتوانی هەڵوێستێکی یەکگرتووی لەبارەوە بنوێنن، پرسی یەکێتیو یەکگرتنی عەرەبی بوو، کە لەرووی جۆرو ئاستی یەکگرتنەکەو میکانیزمەکانی بەدیهێنانیەوە دیدو بۆچوونیان جیاوازبوو، ئەو پرسەش لەئایندەدا بەهەر بارێکدا بشکایەوە، کاریگەری خۆی لەسەر دۆزی کورد بەجێدەهێشت، لەبەر ئەوە پارتی لە (١١/٩/١٩٥٨)دا یاداشتێکی لەو

---

[25] بۆدەقی نامەکە بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ٥١.

[26] پارتەکان بریتیبوون لەپارتی نیشتمانی دیموکراتی، پارتی سەربەخۆیی، بەعس، کۆمۆنیست، بڕوانە: لیث عبدالحسین الزبیدي، ثورة ١٤ تموز في العراق، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٧٩، ص ٤٦٢.

[27] بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٥٦-٥٨.

[28] بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ٢٨٥.

بارەیەوە ئاراستەی سەرۆك وەزیران (قاسم)و جێگرەکەی (عبدالسلام عارف) کردو دیدو بۆچوونی خۆی تێدا روونکردەوە[٢٩].

یاداشتەکە بەجۆرێك دارێژراوە کە لەهەموو رووەکانیەوە گوزارشت لەئاستێکی بالای هۆشیاری رامیاریو یاسایی دەکات.

هەلومەرجی نوێی عیراق دەرفەتی بۆ پارتی رەخساند کەبۆ یەکەمین جار لەدوای دامەزراندنیەوە بەئاشکرا چالاکی رامیاری ئەنجام بداتو ببێتە جێگەی بایەخ، بەتایبەتی لەلایەن (قاسم)ەوە[٣٠].

پارتی لەچوارچێوەی هەولەکانیدا بۆ یەکخستنی هەلوێستی رامیاری لەمەر پرسەکانی عیراقو کارکردن بۆ جێبەجێکردنی مادەی سێیەمی دەستوری عیراقی سالی (١٩٥٨)، لە (١٨/١٠/١٩٥٨)دا نامەیەکی ئاراستەی (پارتی کۆمۆنیستی عیراقی) کردو دواتر وتوێژی نێوانیان دەستپێکردو لەرۆژی (١٠/١١/١٩٥٨)دا گەیشتنە بەستنی پەیمانێكو لیژنەیەکی بالای هاوکاری نیشتمانیان پێکهێناو لە (٢٤/٢/١٩٥٩)دا بەیاننامەیەکیان لەبارەی رێکخراوە دیموکراتیەکانەوە بلاوکردەوە[٣١].

پارتی لەچوارچێوەی سیاسەتی راگەیاندراویدا، بەشێوەیەکی کاریگەر پشتیوانی لەحکومەتی (قاسم) کرد بۆ زالبوونی بەسەر هەولە سەرنەکەوتووەکەی (عقید روکن عبدالوهاب شواف) بۆ کودەتا کە لە(٨/٣/١٩٥٩) ئەنجامی دا[٣٢].

---

29 بۆدەقی یاداشتەکە، بڕوانە، جلال الطالبانی، س پ، ل ل ٢٠٢-٢٠٣. مسعود البارزانی، س پ، ل ل ٧٩-٨١.

30 بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ٥٩.

31 بڕوانە: مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٦٨-٧٠. شازین هێرش، س پ، ل ل ٢١-٢٤، ٢٦-٢٨.

32 بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ل ٢٨٦-٢٨٧، منذر الموصلي، س پ، ل ١١٣، میڤان عارف عبدالرحمن البادي، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية

ئەو هەڵوێستەی پارتی‌و گەلی کورد بەگشتی بۆ ئەو رۆژگارە بەهەنگاوێکی دروست لێکدراوەتەوە*، لەوانەیە ئەمەش پتر بگەڕێتەوە بۆ ئەو هیوایەی کەگەلی کورد لەسەر سەقامگیربوونی حکومەتی کۆماریی ئەوسا هەڵیچنیبوو، وێڕای ئەو مەترسیەی کەگەلی کورد هەیبوو لەئەگەری هاتنە سەرکاری رەوتە شۆڤێنیەکانی تری عەرەبی عیراق.

هەر بەهەمان ئەو شێوەیە پارتی لەسەر داوای (قاسم)، رۆڵی کاریگەری بینی لەدامرکاندنەوەی جوڵانەوە چەکداریەکەی (شێخ رەشیدی لۆلان) کە لەساڵی (١٩٥٩)دا لەدژی حکومەت ئەنجامیدا بەهاندان‌و پشتیوانی تورکیاو ئێران[٣٣].

هەروەها پشتیوانیان لە(قاسم)و حکومەتەکەی کرد کاتێك کە لە(٧/١٠/١٩٥٩)دا هەوڵی تیرۆرکردنی لەلایەن بەعسیەکانەوەو بەهاندانی (جمال عبدالناصر)درا[٣٤].

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لەکۆتایی ساڵی (١٩٥٩)و سەرەتای ساڵی (١٩٦٠)ەوە ساردی کەوتە نێوان پارتی‌و (قاسم)ەوە رەوتی

---

(العراق) ١٤ تموز ١٩٥٨-٨ شباط ١٩٦٣، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين-اربيل، ٢٠٠٢، ص ٦٦. (شواف)، هەوڵیدا کەململانێی نێوان قاسم‌و عارف بقۆزێتەوە. بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە بڕوانە: کریم مراد عاتی، س پ، ل ١٣٨. حامد الحمدانی، س پ،www.sotaliraq.com.

* بۆ نمونە بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٨٣-٨٤.

[33] بڕوانە: ھ س، ل ل ٨٥-٢١١. دیڤید ادامسن وجرجيس فتح الله، الحرب الكردية وانشقاق عام ١٩٦٤، ط٢، دار ئاراس للطباعة والنشر، ١٩٩٩، ص ٢٠١. ماجد عبدالرضا، القضية الكردية في العراق ١٩٥٨-١٩٧٥، ط١، بغداد ١٩٧٨، ص ١٠٥.

[34] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل٨٩-٩٠. منذر الموصلي، س پ، ل ١١٩.

پەیوەندیەکانیان بەجۆرێك گۆڕا کە لەئاکامدا پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی شۆڤێنیزمانەی توندڕەوی لەلایەن (قاسم)ەوە دژ بەگەلی کورد لێکەوتەوە[٣٥]، بەڵام پێش ئەوەی پەیوەندیەکان بگاتە ئەو ئاستە، لە (ك٢/١٩٦٠)دا یاسای مۆڵەتی پارتەکان دەرچوو، (بارزانی)و(ابراهیم احمد)و ژمارەیەکیتر لە٩/١/١٩٦٠دا داواکاری مۆڵەتدانی پارتیان پێشکەش کردو پاش دەستکاریکردنی ناوو ناوەڕۆکی چەند بەندێکی پرۆگرام و پێڕەوی نێوخۆکەی، لەلایەن حکومەتەوە لە (٩/٢/١٩٦٠)دا مۆڵەتی پێدراو چالاکی ئاشکرای ئەنجام دراو رۆژنامەی (خەبات)ی دەرکرد[٣٦].

ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر سیاسەتی (قاسم)دا بەرامبەر بەکورد هات، وێڕای دیدو بۆچوونەکانی خۆی لەوبارەیەوە، کەوتبووە ژێر کاریگەری رەوتە شۆڤێنیزمەکانی عەرەبی عیراق و قۆستنەوەی چەند رووداوێکی نێوخۆیی بچووك لەلایەك و دەستێوەردانی ولاتانی وەکو تورکیاو ئێران و بەریتانیا لەکاروباری نێوخۆیی عیراق و هاندانی نەیارەکانی (قاسم) لەلایەکی ترەوە[٣٧].

---

[35] بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٥. net،www.culturalorientation .

Who are the Kurds?

[36] بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ٢١١. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ٧٤-٧٥. منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٠، محمود الدرة، س پ، ل ٢٨٩. اوريل دان، العراق في عهد قاسم تاريخ سياسي ١٩٥٨-١٩٦٣، ت: جرجيس فتح الله ج١، دار نبز للطباعة والنشر، السويد، ١٩٨٩، ص ص ٣٧٥-٣٧٦.

[37] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل٩١-٩٢.

لەبارەی هاندانی بەریتانیا بۆ کورد تاوەکو لەڕووی حکومەتی (قاسم) بوەستن و هەروەها هاندانی تورکیاو ئێران بۆ دەستێوەردان لەکاروباری باشووری کوردستان و تەنانەت

له (٢٩/١٠/١٩٦٠)دا (شێخ احمد بارزانیو مصطفی بارزانی)، بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەی (قاسم) لەهەوڵەکانی تێکدانی نێوانیان، لەبەغداد چاویان پێکەوتو داوایان لێکرد کەسنورێك بۆ ئەو هەوڵانە دابنێت، ئەویش بەڵێنی پێدان، بەڵام بەکردەوە هیچی نەکرد[٣٨].

تا دەهات رواڵەتەکانی شۆڤێنیزمی عەرەبی لەسیاسەتەکانی حکومەتی (قاسم)دا بەرەو ئاشکراکردنو بانگەشەبۆکردنی روونتر دەڕۆیشت، بەئەندازەیەك کەرۆژنامەی (الثورة) بانگەشەی تواندنەوەی نیشتمانیو نەتەوەیی کوردی لەبۆتەی نیشتمانو نەتەوەی عەرەبدا دەکرد[٣٩]، رۆژنامەی(خەبات)یش بەزنجیرەیەك گوتاری بابەتیانە راستییە مێژووییەکانی تایبەت بەگەلی کوردو نیشتمانەکەی خستەڕوو[٤٠]، بەجۆرێك کەئاستی باڵای هۆشیاری رامیاریو رەوتی ئاشتیخوازیو دیموکراتیخوازی گەلی کوردو پارتی دەنواندو هۆشداری بۆ دەسەڵاتدارانی حکومەت لەمەترسیەکانی درێژەدان بەو سیاسەتە تێدابوو، بەڵام دادوەری گشتی سەربازی، لەپای وتارەکەی رۆژنامەی (خەبات)ی رۆژی (١٩/١٠/١٩٦٠)دا سکرتێری پارتی (ابراهیم احمد)یدا بەدادگای

---

داگیرکردنو دابەشکردنی لەنێوانیاندا، ئەگەر نزیکبوونەوەیەکی گەورە لەنێوان عیراقو میسرو سۆڤێتو کورددا رووبدات بەشێوەیەك کەبەرژەوەندیە نەوتیەکانی بەریتانیا لەعیراقدا بخاتە مەترسییەوە، بۆنمونە بڕوانە، د. ولید حمدی، س پ، ل ٢٦٥. ولید محمد سعید الاعظمی، ثورة ١٤ تموز وعبدالكريم قاسم في الوثائق البريطانية، ط١، بغداد، ١٩٨٩، ص ٤٨.

38 بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ٩٣.

39 بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ل ١٨٣، ١٩٨. مسعود بارزانی، س پ، ل ٩٥.

40 بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ١٨٢.

عورفی سەربازی دووەم. بەڵام (قاسم) نەیتوانی حوکمێکی دادگا لەدژی ڕۆژنامەکەو نووسەری بابەتەکە دەربکات[٤١].

هەر لەسەرەتای ساڵی (١٩٦٠)ەوە کەپەیوەندیەکانیان بەرەو گرژی دەڕۆیشت، هاوکات لایەنی کوردی سوورتر دەبوو لەسەر داخوازیەکانیو لەبەرامبەریشدا هەڵوێستەکانی حکومەت توندتر دەبوو[٤٢]، سیاسەتی پەرتەکەو زاڵبەی پەیرەوکردو پەنای دەبردە بەر هاندانی خێڵە کوردیە نەیارەکانی (بارزانی)[٤٣].

لەکۆتایی ئەوساڵەدا سیاسەتی حکومەتی لەدژی گەلی کوردو فەرامۆش کردنی مافو داواکاریەکانی زیاتر کردو پاشگەوبوونەوە لەبەڵێنو بڕیارەکانی پێشووی‌و سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان تا دەهات پەرەی دەسەند.[٤٤] (بارزانی) لەسەردانەکەیدا بۆ یەکێتیی سۆڤێت لە (٥/١١/١٩٦٠)دا کە لەسەر بانگهێشتنی حکومەتی سۆڤێتیو قایلبوونی (قاسم) بوو[٤٥]، دیدارو بیروڕای لەگەڵ گەورە بەرپرسانی ئەو

---

[41] بۆدەقی یەکەمین دانیشتنی دادگاییکردنەکە لە(٢٧/١١/١٩٦٠)دا. بڕوانە، شازین هێرش، س پ، ل ل ٩، ٤٤-٤٨.

[42] بڕوانە، میثان عارف عبدالرحمن البادی، س پ، ل ٧٦.

[43] بڕوانە، طالب عبدالجبار حيدر، المسألة الكردية في الوثائق العراقية، المشكلة. الحل. النتيجة، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية القانون والسياسة، جامعة بغداد، ١٩٨٢، س ٢٣.

[44] بڕوانە، أ.د. كاوس قفطان، الحركة القومية التحررية الكردية في كردستان العراق، ١٩٥٨-١٩٦٤، ط١، المديرية العامة للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٤، ص ص ١٢٨-١٣٠.

-Who are the Kurds? www.culturalorientation.net.

[45] بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ٢٩٦.

وولاّتەدا ئەنجام داو داوای لێکردن فشار بخەنە سەر (قاسم) بۆ سەلماندنی بەشێك لەمافەکانی گەلی کورد، هاوکات نێوانگیریان بکەن بەمەبەستی ڕێگرتن لەئاڵۆزبوونی زیاتری دۆخەکەو ڕێکخستنەوەی پەیوەندیەکانی نێوانیان، بەلاّم ئەم هەنگاوە بەدگومانی پتری لەلای (قاسم) دروستکرد[٤٦]، بەبۆچونی ئێمە ئەو بەدگومانیە لەشوێنی خۆیدا نەبوو.

(بارزانی) لەپاش گەڕانەوەی بۆ بەغداد لە (١٣/١/١٩٦١)دا هەوڵیدا چاوی بە (قاسم) بکەوێتە، لەدوای هەفتەیەك چاوەڕوانی ئینجا دیدارەکە سازبوو، ئاکامێکی ئەوتۆشی بەئاراستەی ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکانیان لێنەکەوتەوە[٤٧]، لەبەرئەوە بەغدادی بەجێهێشتو دواتر لەسەرەتای مانگی ئازاری ئەو ساڵەدا بەیەکجاری گەڕایەو بارزان[٤٨].

لەکاتێکدا کەحکومەتەکەی (قاسم) هەنگاوی توونـدتری لەدژی پارتی نا، لەبەرامبەردا (بارزانی) کەوتە ئەنجامدانی چالاکیی رامیاری بۆ پەیوەندیکردن بەهێزە نیشتمانیو دیموکراتیخوازەکانی عیراقو دەرەوەیدا، بۆ ئەوەی حکومەت قایل بکەن بارودۆخەکە بەرەو ئاڵۆزیی پترو بەرپاکردنی جەنگ نەبات، لەم بارەیەوە هەوڵێکی (عزیز شریف) لەهاوینی ساڵی (١٩٦١)دا سەری نەگرت[٤٩]، دیارە "ئەو کاتەی

---

[46] بڕوانە، اوریل دان، س پ، ل ٤١٧، هەروەها (خدوری) لەبارەی ئەم سەردانەوە دەڵێت: "نازانرێت ئاخۆ مەلا مستەفا لەکاتی بوونی لەسۆڤیێتدا هیچ بەڵێنێکی پێدرابێت. بەلاّم لەگەڕانەوەیدا لێدوانێکی بۆ رۆژنامەداو تێیدا گوتی ئەو دەیەوێت ئاواتە رەواکانی کورد بهێنێتە دی بەبێ ئەوەی ئەوە کاربکاتە سەربوونو سەروەری کۆماری عیراق، بڕوانە، د. مجید خدوری، س پ، ل ٢٥٧، پەراوێزی ژمارە (٧٦).

[47] بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٢١. مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٠٣-١٠٤.

[48] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ١٠٤.

[49] بڕوانە، ه س، ل ١٠٤.

کەشاندێکی کوردی لەحوزەیرانی ١٩٦١دا ئامادەبوو بۆ پێشکەش کردنی چەند داواکاری‌و سکالآیەك بۆ عبدالکریم قاسم، ناوبراو لەخۆی بایی بوو وەپێشوازی شاندەکەی نەکرد"[50]، پارتی لە (١٢/٧/١٩٦١) دا بەبۆنەی سێیەمین ساڵیادی (شۆڕش)ەکەی ساڵی ١٩٥٨ەوە بەیاننامەیەکی ئاراستەی گەلی عیراق کردو بارودۆخی ولآتی تێدا چڕ کردەوەو لەئاکامدا داوای لەحکومەتی عیراق کرد کەکۆتایی بەقۆناغی گواستنەوە بهێنێت‌و حوکمی عورفی‌و بارودۆخی نائاسایی هەڵوەشێنێتەوەو ڕێگە بەئازادیە دیموکراسیەکان بدات‌و زیندانیەکان ئازاد بکات‌و هەڵمەتی ڕاوەدونانی پارت‌و ڕۆژنامە نیشتمانیەکان رابگرێت‌و ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردرێت، هەروەها ئاماژەی بۆ پێویستی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی هێزە نیشتمانیەکان کرد[51].

هەر لەدرێژەی چالاکیە دیپلۆماسیەکانیدا لەسەر ئاستی دەرەوە، لیژنەی ناوەندی پارتی بروسکەیەکی پیرۆزبایی ئاراستەی (نیکیتا خرۆشۆف) کرد بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە زانستییەی کەیەکێتی‌ی سۆڤێت لەڕێگەی گەشتە سەرکەوتووەکەی (یۆری گاگارین)ەوە بۆ ئاسمان بەدەستیهێنا. لەبەرامبەردا ناوبراو بروسکەی سوپاسگوزاری بۆ ناردنەوە[52].

هەر لەمانگی تەموزدا لەنێو پارتیدا گفتوگۆ لەسەر پرسی چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ پێشهاتەکاندا ئەنجام دراو لە(٣٠/٧/١٩٦١)دا یاداشتێکیان لەشێوەی نامەیەکی کراوەو ئاشکرا ئاراستەی (قاسم) کردو تێیدا داوایان لێکرد کەسنوورێك بۆ ئالۆزیەکان دابنێت‌و ڕێگەچارەی

---

[50] منذر الموصلي، س پ، ١٢٢. د. مجيد خدوري، س پ، ل ٢٤٠.

[51] شازین هێرش، س پ، ل ٨٥، بەڵگەنامەی ژمارە (١٧)ی سەرچاوەکە.

[52] هـ س، ل ٨٦، بەڵگەنامەی ژمارە (١٨)ی سەرچاوەکە.

ئاشتیانە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان بگرێتەبەر. یاداشتەکە هەڵوێستی پارتی لەحکومەتو چەند داخوازیەکی نیشتمانیو گشتگیری بۆ کوردو گەلانی عیراق لەخۆگرتبو، لەبەرئەوە بووە مایەی پەسەندیو پشتگیری زۆر لایەنی نێو عیراق، گرنگترین داخوازیەکانیش بریتیبوو لە[٥٣]:

-هەڵوەشاندنەوەی بارودۆخی نائاسایی لەوڵاتدا.

-دابین کردنی فراوانترین ئازادیە دیموکراتیەکان بۆ گەل.

-ئازادکردنی هەموو زیندانیە رامیاریەکان، لایەنگرانی حکومەتی پاشایەتی لێدەرچێت.

-دەستەبەرکردنی ئازادی چالاکی پارتایەتیو سەندیکایی.

-پێکهێنانی کۆمیتەیەکی هاوبەش لەرێکخراوە نیشتمانیەکانو حکومەت بۆ دانانی پرۆژەی دەستوری هەمیشەییو پرۆژەی یاسای هەڵبژاردن.

-رێنەگرتن لەمافە نەتەوەییو روناکبیریو کارگێڕیەکانی گەلی کورد.

-دەستبەرداربوونی حکومەت لەگرتنەخۆو چەکدارکردنی گروپە کۆنە پارێزەکانی نێو کۆمەڵی کوردی.

-ئەنجام دانی چاکسازیی کشتوکاڵیو دامەزراندنی بنەمای پیشەسازیو دەستهەڵگرتن لەراگواستنو دەستگیرکردنو دورخستنەوەی جوتیاران، کارکردن بۆ پەرەپێدانی یەکێتی جوتیاران.

هەرچەندە ناوەڕۆکی یاداشتەکە لەبەرژەوەندیی گشتیدا بوو، لەگەڵ پرنسیپو دروشمە سەرەکیەکانی حکومەتدا یەکیدەگرتەوە، بەڵام (قاسم) پشتگوێی خستو هەڵوێستی پێچەوانەی نواند[٥٤].

---

[53] بۆ دەقی یاداشتەکە، بڕوانە: جلال الطالباني، س پ، ل ل ١٨٣-١٨٩، منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٢١-١٢٢.

[54] بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ١٨٩.

هـەروەها لـە(٣/٨/١٩٦١)دا بـیرۆی رامیـاری پـارتی یاداشـتێکی پێشکەش بەوەزیری نێوخۆی عیراق کردو وێنەی نارد بۆ چەند ناوەندێکی فەرمی سەرەکی حکومەتی عیراق، تێیـدا ئـەو هۆکارانـەی روونکـردەوە کەبوونەتـە ئاسـتەنگ لەبـەردەم پارتیـدا کەنـەتوانێت لەسـایەی ئـەو هەلومەجەدا کۆنگرەی نیشتمانی خۆی بەشێوەیەکی یاسـایی ببەسـتێت، هەروەها داوای هەڵوەشاندنەوەی هەمو ئەو رێوشوێنە نایاساییانەی کـرد کە لـەدژی ئەنـدامانی پـارتیو رۆژنامەکـەی ئـەنجام دراوە، وەرێگـەیان پێبدرێت کە لەهەموو ئەو مافانەی دەسـتوری وڵاتو یاسـای پارتـەکان سەلماندویێتی بەهرەمەندبن، هـەروەها داوای دواخسـتنی کـاتی بەسـتنی کۆنگرەکـەیان کـرد تائـەو کاتـەی داخوازیـە یاسـاییەکەیان جێبـەجێ دەکرێت، یان تا ماوەی گواستنەوە کۆتایی دێت، وەکو پێشبینی دەکرا[٥٥].

هەڵوێستی حکومەت بەرامبەر بەیاداشتەکە لەوەی پێشـتریان باشـتر نەبوو، لەبەرئەوە رێگەیان بۆ گرژبوونی پەیوەندیەکان خۆشتر کرد، لەگەڵ ئەوەشدا پارتی بەباشی زانی نامەیەکی تری ئاراستە بکاتـەوە، کەتێیـدا ئاماژەی دەکرد بەجێبەجێ نەکردنی تەواوی بنەماکانی دەسـتوری کـاتیی عیراقو زیانەکانی پێشـێلکردنی مافـەکانی گـەلی کـوردو کەڵکـەکانی دابینکردنی ئەو مافانـە بـۆ یـەکێتیو سـەربەخۆیی کۆمـاری عـیراقو رێگرتن لەپیلانەکانی (ئیمپریالیزمو نۆکەرانی) نێوخـۆیی[٥٦]. (بـارزانی) ئەوەشـی راگەیانـد کەهـەموو رێوشـوێنێکی پێویسـت دەگرنەبـەر

[55] بۆدەقی یاداشتەکە بڕوانە، شازین هێرش، س پ، ل ل ٧٣-٧٤، بەڵگەنامـەی ژمـارە (١٥)ی سەرچاوەکە.

[56] منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٢.

کەبەرژەوەندیی کوردی تێدا بێت، ئەگەر سەرۆك بەڵێنەکانی خۆی نەهێنێتە دی[57].

بەڵام لەبری بەپیرەوەهاتنی ئەو داخوازیانە، کاردانەوەی حکومەت بریتیبوو لەئەنجام دانی چەند هەنگاوێکی توندوتیژ ئامێز، وەکو هێرش کردنی چەکداری بۆ سەر بارەگای پارتی لەبەغدادو دەرکردنی بڕیاری داخستنی بارەگاو لقەکانیو ڕێگەنەدان بەدەرکردنی ڕۆژنامەی (خەبات)و دەستگیرکردنی ژمارەیەك لەکادرانی پێشکەوتووی پارتیو[58]، ناردنی هێزی سەربازی پتر بۆکوردستان بەبیانوی ئەنجامدانی مانۆڕەوە، لەبەرامبەردا پارتی بۆ نارەزایی دەربڕین لەسەر ئەو هەنگاوە بانگەشەی بۆ ئەنجام دانی مانگرتنێکی گشتی لە (٦/٩/١٩٦١)دا کرد، حکومەت ئەوەی قۆستەوەو لە (١٠/٩/١٩٦١)دا بڕیاری دەست پێکردنی پرۆسە سەربازیەکانی خۆی لەکوردستاندا ڕاگەیاندو دوو لەسەر سێی سوپای عێراق تێیدا بەشداربوو[59]، لەلایەکی ترەوە (قاسم) لەمیانەی هەوڵێکیدا بۆ لەخشتەبردنی (بارزانی)و چەواشەکردنی ڕای گشتی، داوای گەڕانەوەی بۆ لای حکومەت لێکردو بەڵێنی لێبووردنی پێدا!، بەڵام (بارزانی) پێی ڕاگەیاند کەئەو خراپەکارو هەڵەیەو بۆی نیە لەم ببورێت[60]. لەبەرامبەر ئەو سیاسەتانە، پارتی لە

---

[57] بڕوانە، د. عادل تقی محمد البلداوی، نضال الشعب الکردي وموقع البارزاني في الوثائق العراقیة السریة. مطبعة المعارف، بغداد، ٢٠٠٣، ص ٣٧.

[58] بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ١٨٣. د. منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٢، محمود الدرة، س پ، ل ٢٩٦. مسعود بارزانی، س پ، ل ١٠٤، د، مجید خدوری، س پ، ل ٢٤٠.

[59] بڕوانە، جلال الطالباني،،س پ، ل ١٨٩. منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٣. محمود الدرة، س پ، ل ٣٠٤. شازین هێرش، س پ، ل ١٠٥، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٤)ی سەرچاوەکە.

[60] بڕوانە، دانا ادمز شمیدت، رحلة الی رجال شجعان في کردستان، ت: جرجیس فتح الله، ط٢، دار اراس للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ١٩٩٩، ص ٢٩٧.

(١١/٩/١٩٦١)دا بەناچـاری خـەباتی چـەکداری لـەدژی حکومـەت راگەیاند[٦١]، هەرچەندە پارتیو سەرکردایەتیەکەی ئامادەباشییان لەڕووی مادیو قایمکاریەوە بۆ بەرپاکردنی نەبوو، بۆیە بەو بارودۆخە تا ڕادەیـەك سەرسام بوون، هەرچەندە لەڕووی ئاراسـتەکردنی بیروبـاوەڕەوە لـەبارێکی باشتردا بـوو[٦٢]، لەراسـتیدا پـارتی نەیدەویسـت پەیوەندیـەکانی لەگـەڵ حکومەتدا بەیەکجاری تێکبداتو دەستپێشخەر بێت لەڕووبەڕووبونـەوەی چەکداریدا[٦٣]، بەڵام سیاسەتەکانی حکومـەت لـەدژی گـەلی کـورد ئـەو ڕێگەچـارەیەی سـەپاند. لـە (٢٣/٩/١٩٦١)دا (قاسـم) بەشـێوەیەکی فەرمی رایگەیاند کە "هێزە چەکدارە سەرکەوتووەکانمان توانیـان یـاخی بوونی باکور لەناوبەرن!"[٦٤]. سیاسـەتەکانی حکومـەتو کاردانـەوەکانی کورد، کۆتایی بەخولێکی پێکەوەژیانی رامیـاری نەئاشـتیو نەجـەنگی نێوانیـان هێنـاو دەرفـەتی بـەکارهێنانی ڕێگەچـارەی رامیـاریو دیپلۆماسیەکانی یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیانی کەمتر دەکـردەوەو دەرگای گرتنەبەری ڕێگەچارەی سەربازی خستە سەرپشتو بەسـەر گـەلی کوردیـدا سـەپاند، چـونکە حکومـەت وەکـو تاکـە ڕێگەیـەك بـۆ

---

[61] بڕوانە، مسعود بارزانی، س پ، ل ل ١٠٤-١٠٥.

-Kurds. www.bartleby.com

-Barbara Harff، Ted Robert Gurr، op، cit، P

-Kurds History، Kurdish History timeline.

www.infoplease.com/Encyclopedia.

[62] بڕوانە، میڤان عارف عبدالرحمن البادی، س پ، ل ٨٦.

[63] بڕوانە، د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل ١٠٣.

[64] بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ١٨٩. محمود الدرة، س پ، ل ٣٠٤، منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٣، شازین هێرش، س پ، ل ١٠٥، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٤)ی سەرچاوەکە.

سەرکوتکردنی گەلی کوردو مافەکانی گرەوی لەسەر دەکرد، بەلاّم ئاکامەکانی بەپێچەوانەی خواستەکانی شکایەوە.

ئەو هۆکارە سەرەکیانەی کەبوونە هۆی دەستپێکردنی خەباتی چەکداری درێژخایەن لەدژی حکومەتی (قاسم) بریتی بوو لە:

-شکستهێنانی رێوشوێنە رامیاریو دیپلۆماسیەکان لەچارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیانو بەدەستهێنانی مافەکانی گەلی کورد، لەبەرئەوەی بەهۆی سیاسەتەکانی حکومەتەوە لەدژی گەلی کوردو مافەکانی زەمینەی دانوستانی سەرکەوتوو نەڕەخسا.

-شکستهێنانی سیاسەتەکانی حکومەت لەچارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی کوردو فەرامۆشکردنی مافو داخوازیەکانیو پەیڕەوکردنی سیاسەتی سەرکوتکردنو دواخستنو پەراوێزخستن.

-جێبەجێ نەکردنی بەندەکانی دەستوری کاتیی عیراق، بەتایبەتی ئەوانەی کەپەیوەندیان بەمافەکانی گەلی کوردەوە هەبوو.

-بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی حکومەت لەمەڕ بەرپاکردنی جەنگو سوتماککردنی خاکو کۆمەڵکوژی کورد، وەکو بەشێك لەمافی چارەی خۆنووسینو مافی بەرگری کردنی رەوا لەخۆ کە لەزۆرێك لەبەڵگەنامە یاساییە نێودەوڵەتیو نێوخۆییەکانی پەیوەندیداردا سەلمێندراوە*.

-کاریگەری دەرکردنی یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵی لەسەرەتادا لەسەر دەرەبەگەکانی کوردو کاردانەوەیان لەدژی حکومەت کەئەوەش پەلەی

---

* بۆ نمونە بڕوانە، دەقی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ. دەستوری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. د. حميد الساعدی، مبادیء القانون الدستوري وتطور النظام السياسي في العراق، ط١، دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٠، ص ص ٨٦-٨٧.

لەزەمینەسازیو هاتنەپێشەوەی هەرچی زووتری رووبەڕووبونەوەی چەکداری گەلی کورد لەگەڵ ئەو حکومەتەدا کرد.

پارتی لە (١٦/١١/١٩٦١)دا بەیاننامەیەکی بۆ گەلی کورد بڵاوکردەوە، رەخنەکانی پێشووی لەحکومەتی (قاسم) دووبارە کردەوەو داوای جێبەجێ کردنی داخوازیەکانی (٦/٩/١٩٦١)ی کردو جەختی لەسەر یەکێتی ریزەکانی گەلو درێژەدان بەخەبات لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیەکاندا کردەوە[٦٥]. لەبەرامبەردا (زعیم محمود عبدالرزاق)ی سەرکردەی تیپی دووەم، بەیاننامەیەکی ئاراستەی گەلی کورد کرد. تێیدا هێزی پێشمەرگەی کوردستانی بەڕێگرو تاوانبار ناوبردو هەڕەشەی سزای قورسی لێکردنو داوای لەگەلی کورد کرد کەهاوکاری حکومەت بکەن بۆ لەناوبردنیان![٦٦]. لەدوای چلوپێنج رۆژ لەپرۆسە سەربازیەکانی سوپای عیراقی لەکوردستاندا، (لیژنەی سەرکردایەتی پێشمەرگە) بەیاننامەیەکی دەرکرد کەجگە لەکۆمەڵێك رێنمایی بۆ گەلی کورد تا درێژە بەخەبات بدەن، داوای دامەزراندنی بەرەیەکی نیشتمانی کرد لەپێناو روخاندنی حکومەتەکەی (قاسم)و دامەزراندنی کۆمارێکی دیموکراتی راستەقینە[٦٧]. لەبەرامبەردا (قاسم) کاری بۆ لەناوبردنی خودی (بارزانی) کردو بۆ ئەم مەبەستە لەسەر داوای یەکەمیان بڕیاربوو لەشەوی (١/١٢/١٩٦١)دا کۆبوونەوەیەك لەنێوان (بارزانی)و نێردراوی (قاسم)دا بەناوی (حسن عبود ابراهیم)ی فەرماندەی لیوای پێنجەم لەموسڵ ئەنجام بدرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی (بارزانی) هەستی بەپیلانێك کردبوو، شوێنی دیاری کراوی

---

[65] بڕوانە، شازین هێرش، س پ، ل ل ٩٥-٦٩، بەڵگەنامەی ژمارە (١٩)ی سەرچاوەکە.

[66] بڕوانە، ه س، ل ٩٧، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٠)ی سەرچاوەکە.

[67] بڕوانە، شازین هێرش، س پ، ل ١٠٠، بەڵگەنامەی ژمارە (٢١)ی سەرچاوەکە.

کۆبوونەوەکەی گۆڕی، لەبەرئەوە پرۆسەی بۆردومانی شوێنەکە ئامانجی خۆی نەپێکا[٦٨]. ئەم کردەوەیە گەلی کوردو سەرکردایەتیەکەی پتر نیگەران‌و بێ ئومێد کرد لەئەگەری چارەسەرکردنی دۆزی کورد لەگەڵ حکومەتدا بەرێوشوێنی دیپلۆماسی، چونکە ئەو جۆرە کردەوانە لەگەڵ هەموو بنەماو پرنسیپە یاساییو رەوشتیەکانی بواری دیپلۆماسیەتدا دژەو هاوکات کارێکە پێشینەو هاوشێوەی نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا (بارزانی) هەر داوای لەحکومەت کرد کەبەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ بکات[٦٩]. هەر بەمەبەستی نارەزایی دەربڕین‌و خستنەڕووی ئاڵۆزیەکانی نێوان گەلی کوردو حکومەت، (سەرکردایەتی پێشمەرگەی ناوچەی سلێمانی پارتی) داوای لەدانیشتوانی شارەکە کرد کەبەشداری لەپێشوازی کردنی (قاسم)دا نەکەن‌و لەماڵی خۆیان دەرنەچن ئەگەر سەردانی شارەکەی کرد[٧٠]. دیارە ئەنجام دانی هەنگاوێکی لەو چەشنە هەڵوێستی گەلی کوردی لەدژی سیاسەتەکانی حکومەت بەشێوەیەکی روونتر نیشانی گەلانی عیراق‌و جیهان دەداو کاریگەریەکی رامیاریو وێژەیی لەسەر حکومەت دەبوو بەئاراستەی پتر گۆشەگیربوونی.

---

[68] بڕوانە، هـ س، ل ١٠١، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٢)ی سەرچاوەکە، لەهەندێك سەرچاوەدا رۆژی سەردانی نێردراوەکەی حکومەت بۆ لای (بارزانی) بەرۆژی (١٧/١٢/١٩٦١) دیاری کردووە، بۆ نمونە: میڤان عارف عبدالرحمن البادی، س پ، ل ل ٩٨-١٠١، لەکاتێکدا دروست شەوی (١/١٢/١٩٦١)ە وەکو لای (شازین هێرش) ئاماژەمان پێیداوە.

[69] بۆ زانیاری پتر بڕوانە، د. عادل تقی عبد محمد البلداوی، س پ، ل ل ٤٠-٤١.

[70] بڕوانە، شازین هێرش، س پ، ل ل ١٠٣-١٠٤، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٣)ی سەرچاوەکە.

حکومــەتی (قاســم) لەبڕیارێکیــدا لێبــوردنی بــۆ ســەرکردایەتی بزووتنەوەکــەو پێشــمەرگە ڕاگەیانــد، پــارتیش لــە (٥/١٢/١٩٦١)دا بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە بۆ هۆشــیارکردنەوەی گــەلی کــورد لەئامانجــە ڕاستەقینەکانی پشت ئەو بڕیارەی حکومەتەوە[٧١].

پارتی لەمیانی هەوڵەکانیدا بۆ پەیداکردنی پشتیوانیی پتر بۆ بــەرەی کــوردیو بێهێزکردنــی بــەرەی حکومــەت، لــە (٦/١/١٩٦٢)دا بانگــەوازێکی ئاراســتەی ســوپای عــیراق کــردو تێیــدا داوای لێکــردن کەئەرکی نیشتمانی وادەخوازێت لەدژی حکومەتی قاسم بجەنگن[٧٢].

لەماوەی نێــوان (٧/١٢/١٩٦١-١٥/٣/١٩٦٢)دا شــەڕی قــورس لەنێوان سوپای عیراقو هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا درێــژەی هــەبوو، بەڵام لــەنێوان (١٦-٢٦/٣/١٩٦٢) خــاو بــووەوە[٧٣]. هــەر لەگەرمــەی شەڕەکاندا، پارتی لە (٢٥/١/١٩٦٢)داو لەیادی شەهیدانی ڕاپــەڕینی ساڵی (١٩٤٨)دا بەیاننامەیەکی تری دەرکردو تێیــدا داوای یــەکگرتنی هێزە نیشــتمانیەکانی عیراقــی لەبەرەیــەکی یــەکگرتوودا کــرد لــەپێناو کۆتاییهێنان بەحوکمی (قاســم)و دامەزرانــدنی سســتمێکی دیمــوکراتی پەرلەمانیو بەدیهێنانی ئامانجەکانی گەلی عیراق[٧٤].

---

[71] بڕوانــە، شــازین هێــرش، س پ، ل ل ١٠٥-١٠٧، بەڵگەنامــەی ژمــارە (٢٤)ی سەرچاوەکە.

[72] بڕوانە، هـ س، ل ١١٢، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٧)ی سەرچاوەکە.

[73] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٠٨-١٠٩، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٥)ی سەرچاوەکە، ل ل ١١٣-١١٥، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٨)ی سەرچــاوەکە، ل ل ١٢٤-١٢٦، بەڵگەنامــەی ژمــارە (٣١)ی سەرچاوەکە.

[74] بڕوانە، هـ س، ل ل ١١٠-١١١، بەڵگەنامەی ژمارە (٢٦) ی سەرچاوەکە.

پـارتی لـە (١٩٦٢/٣/٨)دا بەیاننامەیـەکی بەهـەردوو زمـانی کوردی‌و عەرەبی دەرکرد لەبارەی ئەو بڕیاری لێبوردنەی کەحکومەتەکەی (قاسم)لەو دواییەدا دەری کردو رایگەیاند، تێیدا ئاماژەی بەوەدا کەئـەوە هەشتەمین جارە حکومەت لەکردنەوەی بەنـداوی دەربەندیخانـەوە بڕیـاری لەو چەشنە دەربکات. هۆشداری بۆ گەلی کورد تێدابوو کەفریو نـەدرێن، وە ئەو هـەنگاوەی حکومـەتی بەسـووکایەتی پێکردنـی گـەلی عیراقـی لەقەڵەم داو جارێکی تریش داخوازیەکانی گەلی کوردی تێداخستـەڕوو[٧٥].

هـەروەها بەبۆنـەی جـەژنی نـەورۆزەوە لـە (١٩٦٢/٣/٢١)دا بەیاننامەیەکی پیرۆزبایی ئاراستەی گـەلی کـورد کـردو تێیـدا جـەختی لەسەر درێژە پێـدانی خـەبات کـردەوە لـەپێناو روخانـدنی حکومـەت‌و هێنانـەدی ئامانجـە نەتەوەییـەکانی کـورد[٧٦]، کـەخۆی لـە "سـەندنی ئۆتۆنۆمـی بۆ کوردستانی-عـیراق"[٧٧] دا دەبینیـەوە، وەکـو لەبروسـکەی پیرۆزبایی لقی سلێمانیدا دەردەکەوێت کەهەر بەو بۆنەیەوە بڵاوی کردەوە.

لـەبواری کێشمەکێشـی سەربازیشـدا، شـەڕو پێکدادانـەکان لەکوردستاندا تا (١٩٦٣/٢/٨) کەم‌و زۆر درێژەی کێشا[٧٨]. لـەم رووەوە سەرباری ئەو جیاوازیەی کە لەبنەماکانی هێزی هەردوو لایەندا لـەڕووی چەندایەتی‌و چۆنایەتیەوە هەبوو، هێشتا تەرازووی هێزەکـان تـا دەهـات بەقازانجی لایەنی کوردیدا دەشکایەوە بەئەندازەیەك کە "لەم قۆناغەدا، و بۆ یەکەمین جارە لەمێژووی جموجوڵە سـەربازیەکانی عیراقـدا لـەباکوور

---

[75] بڕوانە، هـ س، ل ل ١١٦-١٢٣. هەردوو بەڵگەنامەی ژمارە (٢٩-٣٠)ی سەرچاوەکە.

[76] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٢٧-١٢٨، بەڵگەنامەی ژمارە (٣٢) ی سەرچاوەکە.

[77] شازین هێرش، س پ، ل ١٢٩، بەڵگەنامەی ژمارە (٣٣)ی سەرچاوەکە.

[78] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٣٠-١٤٢، هەردو بەڵگەنامەی ژمارە (٣٤-٣٩).

هێزەکانی حکومەت زیانی زۆر گەورەیان بەرکەوتووە..[79]" لەگەڵ ئەوەشدا وەکو (الدرە) دەڵێت، (قاسم) بەمەبەستی چەواشەکردنی رای گشتی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی بەردەوام رایدەگەیاند کەسوپای عیراق کۆتایی بە(بزووتنەوە جوداخوازیەکەی کوردەکان) هێناوە، لەکاتێکدا کەهەموو عیراقیەکان و جیهان دەیانزانی کەبزووتنەوەکە تا رۆژی روخاندنی حکومەتەکەی لە (٨/٢/١٩٦٣)دا زۆربەی ناوچە شاخاویەکانی کوردستانیان بەدەستەوەبوو[80].

حکومەتی عیراقی هەرکاتێك کەتەرازووی هێزەکان بەقازانجی نەبووایە، پەنای دەبردە بەر مانۆڕی رامیاری و داوای ئاگربەستی دەکرد، یەکێك لەو هەولآنەی لەرێگەی سەرکردەی هێزی مەیدانەوە لەکەرکوك لە (٢٣/٦/١٩٦٢)دا ئەنجام دا کەتێیدا داوای گفتوگۆی لەگەڵ (بارزانی) دا لەبارەی مەرجەکانی ئاگربەستی نێوانیانەوە کرد، ناوبراویش چەند مەرجێکی بەرایی بۆ حکومەت دانا، کەهەرکاتێك جێبەجێیان بکات ئینجا ئامادەی دانوستان دەبێت[*]. لەراستیدا ئەو مەرجانە بەهیچ

---

[79] منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٥، وەبەهەمان واتا بڕوانە، محمد احسان: كوردستان ودوامة الحرب، ط٢، منشورات دار ئاراس للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص ٣٨.

[80] بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ٣٠٤.

[*] مەرجەکان بریتیبوون لە:

-کشانەوەی سوپای عیراقی لەکوردستان.

-ئازادکردنی هەموو زیندانیە رامیارییەکان.

-چەکداماڵینی چەکدارە بەکرێ گیراوەکانی حکومەت.

-ئامادەبوون بۆ دانوستان لەپاش جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەی ئاماژەیان پێدراوە.

بڕوانە، دانا ادمز شمدیث، س پ، ل ١٣٥.

شـێوەیەك لەگـەڵ سروشـتو بیروبـاوەڕو سیاسـەتی ئـەو سـەردەمەی دەسـەڵاتدارانی عیراقـدا یەکینەدەگرتـەوە، لەبەرئـەوە هـیچ ئاکـامێکی بەئاراسـتەی رێککـەوتنی ئاگربەسـت لێنەکەوتـەوە، ئـەو هـەنگاوە دیپلۆماسیەی (بارزانی) لەشوێنی خۆیدا بو، چونکە بەهـەردو بارەکـەدا هەر بەقازانجی کورد دەشکایەوە، چ بەجێبەجێ کردنی مەرجەکان لەلایەن حکومەتەوە، یان بەپێچەوانەوەو درێژەدانی حکومەت بەشەڕەکە کەتێیـدا سوپای عیراقی پتر شپرزە ببوو، ئەمە وێـڕای ئاشـکراتربوونی نیازەکـانی حکومـەت لـەو هـەنگاوە تەکتیکیـەی کـەبۆ مەبەسـتی خاوکردنـەوەی دۆخەکەو بەدەستهێنانی کاتو خۆسازدانەوەبوو بۆ خولێکی تری جـەنگ لەدژی کوردستان، بەم شێوەیە سیاسەتەکانی حکومەتی عیراق هۆکـاری سەرەکی بوو بۆ نەڕەخسانی هەلومەرجی لەبارو پێویست بۆ وتووێژکردنو یەکلاکردنەوەی کێشەکان بەڕێگەچارەی ئاشتیانە.

لەو هەلومەرجە دژوارەدا، جارێکی تر دەرفەت بـۆ حکومـەتی ئێـران رەخسـایەوە تـا لەهاوکێشـەی کێشمەکێشـی نێـوان گـەلی کـوردو حکومەتەکانی عیراقـدا رۆڵێـك بـەقازانجی پاراسـتنی بەرژەوەندیـەکانی خۆیو فشار خستنەسەر حکومەتەکەی (قاسم)و کارکردنەسەر ئاراستەی بزووتنەوەکەی کورد لەباشووردا بگێڕێت، بۆ ئەم مەبەسـتەش لـەکۆتایی (ت١/١٩٦٢)دا پەیوەندی بە (بارزانی)ەوە کـردو ئامـادەیی پێشـکەش کردنی هەموو جۆرە یارمەتیو هاوکاریەکی مـادیو سـەربازی دەربـڕی، بەدەستهێنانی ئەو برە یارمەتیە بۆ ئەو بارودۆخە دژوارەی کەگەلی کوردی تێدا دەژیـا، بەسـەرکەوتنێکی گـەورە لێکدرایـەوە[81]. لەگـەڵ ئەوەشـدا (بارزانی) هەر بەردەوام بوو لەسەر هەوڵەکانی بەئاراستەی ئـەنجام دانـی

[81] بڕوانە، عبدالله احمد رسول الپشدری، اندلاع ثورة ایلول المجیـدة ١٩٦١، ترجمـة محمـد صالح عقراوي، ج١، مطبعة الثقافة، اربیل، ٢٠٠١، ص ١١٠.

ئاگربەست‌و گرتنەبەری ڕێگەچارەی ئاشتیانە، لەبەرئەوە لە (١٨/١/١٩٦٣)دا بانگەوازێکی ئاراستەی فەرماندەی سەربازی ناوچەی خانەقین‌و جەلەولا کرد کەتێیدا ئارەزوی پێکهاتنی دەربڕی بەمەرجی "ئازادکردنی گیراوەکان‌و کێشانەوەی هێزە سەربازیەکان لەناوچەکانی باکوورو ئەنجامدانی دانوستان لەگەڵیدا لەلایەن کەسانی بێلایەنەوە"[٨٢]، بەڵام حکومەت هیچ بایەخێکی پێنەداو درێژەی بەسیاسەتەکانی پێشووی دا[٨٣].

له (٨/٢/١٩٦٣)دا لقی سلێمانی پارتی لەڕاگەیاندنێکیدا داوای لەدانیشتوانی شارەکە کرد کە (١١/٢/١٩٦٣) مانگرتنێکی گشتی ئەنجام بدەن، بۆ نارەزایی دەربڕین لەدژی ڕەشە کوژیەکەی حکومەت لەگوندی (سیارە)ی دەربەندیخان[٨٤]. ئەوەی جێگەی سەرنجە لەو هەڵوێستەی پارتی ئەوەیە کەهەر لەو ڕۆژەدا واتا (٨/٢/١٩٦٣) (پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی)و بەهاوکاری ناسیونالیست‌و ناسریەکانی عیراق حکومەتەکەی (قاسم)یان لەڕێگەی کودەتایەکی سەربازیەوە کە بەسەرپەرشتی (عبدالسلام عارف) بوو ڕووخاندو دەسەڵاتی رامیاری لەعیراقدا گرتەدەست[٨٥]. بەم گۆڕانکاریە کۆتایی

---

[82] د. عادل تقی عبد محمد البلداوی، س پ، ل ٤٧.

[83] بڕوانە، هـ س، ل ٤٨.

[84] بڕوانە، شازین هێرش، س پ، ل ١٤٢، بەڵگەنامەی ژمارەی (٤٠)ی سەرچاوەکە.

[85] بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٣١.

-History. www.Findarticles.com.

-Peter sluget.op.cit، p 89.

-History of Iraq. Op.cit، www.findarticles.com.

-Borgna Brunner. Iraq Timeline، www.infoplease.com.

بەقۆناغێکی مێژووی رامیاری عیراق‌و بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لەباشووردا هێناو قۆناغێکی نوێ دەستی پێکرد.

سەبارەت بەکاریگەری جەنگی حکومەتەکەی (قاسم) لەدژی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی لەسەر خێراتربوونی هەرەسهێنانی ئەو حکومەتە لەرێگەی ئەو کودەتایەوە، وادیارە کەجۆرێك لەکۆدەنگی لەنێو توێژەراندا لەو بارەیەوە هەیە، بۆ نمونە: (خدوری) دەڵێت:

"دەکرێت جەنگی کورد بەیەکێك لەو هۆکارە گرنگانە دابنرێت کەبوە مایەی روخانی عبدالکریم قاسم"[86] بەهەمان واتا توێژەرانی تریش ئاماژەیان بۆ ئەو راستییە کردووە[87].

-Iraq.History. www.infoplease.com.

[86] د، مجید خدوری، س پ، ل ٢٤٢.

[87] بۆ نمونە، بڕوانە، د. عادل تقي عبد محمد البلداوي، س پ، ل ٣٠.

## باسی دووەم

# هەڵسەنگاندنی ئاسەوارەکانی گۆڕانی سستمی فەرمانڕەوایی‌ی عیراق لە (١٩٥٨/٧/١٤)و ئەنجامەکانی لەبەر ڕۆشنایی‌ی هەردوو چەمکی کودەتاو شۆڕش

زۆربەی مێژوونوس‌و توێژەران گۆڕانکاریەکەی (١٤/٧/١٩٥٨) بە (شۆڕش) ناوزەد دەکەنو بەبۆچوونی ئێمە ئەو ڕووداوەو شێوازی فەرمانڕانی سەردەمی (قاسم)و ئاکامەکانی ئەو سەردەمی فەرمانڕانییە، زاراوەو چەمکی کودەتا هەڵدەگرێت، نەك شۆڕش، سەلماندنی ئەم بۆچوونەش وادەخوازێت کەلێکدانەوە بۆ هەردوو چەمکەکە بکەین، بەخستنەڕووی شەقڵەکانی شۆڕش‌و جیاکردنەوەی ئەو دووچەمکە لەیەکتری بەپێی پێوەرە زانستیەکانی ئەو بوارە.

لەبارەی چەمکی شۆڕشەوە، بەزۆر شێواز گوزارشتنی لێکراوە، بەڵام بەگشتی لەناوەڕۆکدا یەکدەگرنەوە، لێرەدا چەند نمونەیەك دەخەینەڕوو، لەوانە، (تاڵەبانی) پێی وایە کە شۆڕش بەچەمکە کۆمەڵایەتیەکەی بریتیە لەبزووتنەوەی ئەنجام دانی گۆڕانکاری ریشەیی لەکۆمەڵگادا، بەجۆرێك کەبنچینەی ئابووری کۆمەڵگاو بنیانە رامیاریەکەی هەڵتەکێنی‌و لەشوێنیدا سستمێکی کۆمەڵایەتی نوێ‌و پێشکەوتووترو باڵاتر دابمەزرێت، بەمەرجێك ئەم گۆڕانکاریانە خێراو پێشکەوتنخوازو بەشێوەی بازدان بێنە دی، بەو مانایەی کە کۆمەڵ بەرەو باشترو باڵاتر بەرن[88].

---

[88] جلال الطالباني، س پ، ل ل ١١٥-١١٦.

(دوكوفله) چەمكی شۆڕش وەكو پڕۆژە لێكدەداتەوە، پێی وایە كەئاوێتەبوونی هۆشیاری شۆڕشگێڕیو هەلومەرجی بابەتی دەبێتە مایەی پەیدابوونی خواستو ئارەزووی گشتی بۆ شۆڕش، ئەم خواستو ئارەزووە گشتیەیە كەپڕۆژەكە دەنوێنێت، ئەو پڕۆژەیەی كەكرۆكی شۆڕش پێكدێنێت.[٨٩] دیارە پڕۆژەكەش چەند شەقلێكی هەیە كەبریتین لە: تجریدی، گشتگیری، كۆمەلایەتی، هەمەلایەنەیی، ئاییندەیی[٩٠].

بەهەمان واتا بەبۆچوونی (د. حمید الساعدی) ئامانجی شۆڕش بریتیە لەئەنجامدانی گۆڕانكاری ریشەیی لەكۆمەڵگادا، یان گۆڕینی ئەوەی كەهەیە كەپێویستە ببێت[٩١].

پسپۆران لەم بارەیەوە دوو پێوەدانگی جیاواز بەكاردێنن بۆ لێك جیاكردنەوەی هەردوو چەمكی شۆڕشو كودەتا. گروپێكیان پێوەدانگی (ئامراز)ی ئەنجام دانی پرۆسەی گۆڕانكاریەكە رەچاو دەكەن، بەجۆرێك ئەگەر گەل ئامرازو سەرچاوەی ئەو هێزە بێت، ئەوكاتە پرۆسەكە بەشۆڕش ناودەبەن، بەڵام ئەگەر ئامرازو سەرچاوەی ئەو هێزە دەستەی فەرمانڕان خۆیان یان شتێكیان بن، ئەو كاتە بەكودەتای ناودەبەن، بەڵام گروپەكەی تر پشت بەپێودانگی (ئامانجەكان)ی پرۆسەكەو ئەو (ئەنجامانەی) كەلێیدەكەوێتەوە دەبەستێت، بەوەی كەئامانجی كودەتا دەسەڵات گرتنەدەستو پاوان كردنێتی، بەبێ ئەوەی مەبەستی ئەنجام دانی گۆڕانكاری بێت لەبوارەكانی رامیاریو یاساییو كۆمەلایەتیو ئابووری، كەچی ئامانجی شۆڕش ئەنجام دانی گۆڕانكاری ریشەییە،[٩٢] بەواتایەكی

---

[89] بڕوانە، د. عبدالرضا الطعان، مفهوم الثورة، ط١، دار المعرفة، بغداد، ١٩٨٠، ل ٣٠.

[90] بڕوانە، هـ س، ل ل ٣٢-٤٣.

[91] بڕوانە، د. حمید الساعدي، س پ، ل ٨٥.

[92] بڕوانە، د. حمید الساعدي، س پ، ل ٨٥.

تر، ئەنجامدانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی ئامانجی سەرەکی (پرۆژەکەیە)[٩٣]. یان بریتیە لەپرۆژەی ئەنجام دانی گۆڕانکاریو پێشخستن لەسەر خانو ژێرخانی کۆمەڵگادا بەشێوەیەکی بەردەوام، کەواتا ئەو هێزو ئامرازەی کەگۆڕانکاریەکە ئەنجام دەدات رەچاو ناکات، گرنگ ئامانجو ئەنجامەکانی پرۆسەکەیە.

بەپشت بەستن بەپێودانگی یەکەم، دەشێت بڵێین بۆچوونەکەمان دروستە، چونکە ئەو هێزو ئامرازەی کەپرۆسەکەی ئەنجام دا (عبدالکریم قاسمو عبدالسلام عارفو لیژنەی باڵای ئەفسەرە ئازادەکان) خۆیان بەشێك بوون لەسوپای عیراقی سەردەمی فەرمانڕەوایی‌ی پاشایەتی[*].

لێکدانەوەی پرۆسەکە، لەڕوانگەی ئامانجە دیاری کراوەکانیەوە کە لەبیست ئامانج پێکهاتبوو[٩٤]، وێڕای زۆریو هەمەجۆریان، بەڵام لەناوەڕۆكو بواری جێبەجێ کردنیاندا، نەك هەر گوزارشت لەچەمکی شۆڕش ناکات، بەڵکو تەواو پێچەوانەکەیەتی، چونکە حکومەتی (قاسم) بەشێوەیەکی گشتی سەرکەوتوو نەبوو، لەبواری زاڵبوون بەسەر قەیرانەکانی سستمی فەرمانڕەواییدا (ڕەوایی، پێکەوەگونجانو ئاوێتە بوو،

---

93 بڕوانە، د. عبدالرضا الطعان، س پ، ل ٤٣، هەر لەبارەی ماكو سروشتی پرۆژەکە: (شۆڕش)ەوە، بڕوانە، ه س، ل ل ٤٣-٦٩.

* لەبارەی چۆنێتیی ئەنجامدانی پرۆسە سەربازیەکەی کودەتاکە، بۆ نمونە، بڕوانە، لیث عبدالحسين الزبيدي، س پ، منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٢٨-١٣٠.

94 لەبارەی ئامانجە دیاریکراوەکانی پرۆسەکەوە، بۆ نمونە بڕوانە، حسن العلوى، عبدالكريم قاسم رؤية بعد العشرين، منشورات دار الزوراء، لندن، ١٩٨٣، ل ل ١٢٨-١٣٠

هاوبەشی کردن)[95]. هەروەها حکومەت قۆناغی گواستنەوەی دیاری نەکردو دەستوری هەمیشەیی دانەنا کەخۆی بانگەشەی بۆدەکرد، هیچ هەولێکی راستەقینەی لەو پێناوەدا نەدا، هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی نەکرا تاوەکو لەبەر رۆشناییدا حکومەت دەستنیشان بکرێت، (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی لەئەندامانی لیژنەی باڵای ئەفسەرە ئازادەکان پێك نەهێنا تا لەبری دەسەڵاتی یاسادانان کار بکات[96].

(محمود الدرة) ئاکامی دیدارو گفتوگۆیەکی خۆی لەگەڵ (قاسم)داو بیروڕا گۆڕینەوەیان لەمەڕ بارودۆخی رامیاری وڵات، بەم شێوەیە هەڵی دەسەنگێنێت:

"وام بۆ دەرکەوت، کەپرۆسەی شۆڕشەکە خۆی لەخۆیدا ئامانجی راست کردنەوەی ئەو بارودۆخانە نەبوو کەگەلی عیراق بەدەستیەوە دەینالاند بەو ئەندازەیەی کەمەبەستی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتو پاوان کردنی بوو"[97].

واتا ئامانجی پرۆسەکە گوزارشت لەکودەتا دەکات نەك شۆڕش.

هەر لەو بارەیەوە (فؤاد عارف) دەڵێت: "راستە فەرمانڕانی بوو بەکۆماری پاش ئەوەی کەپاشایەتی بوو، بەڵام پشێوی بەربڵاوبوو سروشتی هەرەمەکی (سەرپێی) بەسەر فەرمانڕانیدا زاڵ بوو"[98].

---

[95] بۆ زانیاریی پتر لەبارەی چەمکی قەیرانەکانی سستمی فەرمانڕانیەوە، بۆ نمونە بڕوانە، د. صادق الاسود، علم الاجتماع السياسي، اسسه وابعاده، ط١، مطبعة دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠، ل ل ٤٧٢-٤٨٠.

[96] بڕوانە، حسن العلوي، س پ، ل ل ١٤٦-١٤٧.

[97] محمود الدرة، س پ، ل ٢٧٢.

[98] فؤاد عارف، مذكرات فواد عارف، تقديم وتعليق، د. كمال مظهر احمد، ج١، مطبعة خەبات، دهوك، ١٩٩٩، ص ٢٠٨.

حکومەت لەبواری ڕێکخستنی ژیانی پارتایەتیدا شکستی هێنا، لەگەڵ ئەوەی کە لە(ك٢/١٩٦٠)دا یاسای پارتە رامیاریەکانی دەرکردو ژمارەیەکیان مۆڵەتی کارکردنیان وەرگرت، بەلاّم دواتر هەڵوێستی نایاسایی توندی لەدژ نواندن و "مۆڵەتی بەپارتو بزووتنەوە نەتەوەییەکان نەدا تاوەکو کاری ئاشکرا لەگۆڕەپانی عیراقدا ئەنجام بدەن"[99]، بۆ نمونە (پارتی) یەکێك بوو لەو پارتانەی کەحکومەت لەدواییدا ئەو جۆرە هەڵوێستەی لەدژ نواند[100]. وێڕای ئەوانەش لەهەڵسوکەوتی لەگەڵ پارتەکاندا سیاسەتی پەرتکەو زاڵبەو جیاکاری نەتەوەیی[101]، و هاندانیان بۆ پێکدادان لەگەڵ یەکتزداو بەگژیەکتریداکردنی کوردەکانی پەیڕەو دەکرد[102].

دیارە ئەو چەشنە سیاسەتانە لەگەڵ بنەماکانی دەستوری وڵاتو یاسا کارپێکراوەکانو ئەرکەکانی حکومەت بەرامبەر بەگەل لەبواری ژیانی رامیاریو پارتایەتیداو هەروەها لەگەڵ چەمکی شۆڕشو حکومەتو سەرکردەی شۆڕشگێڕو پێشکەوتنخوازدا یەکناگرێتەوە.

سیاسەتی حکومەتەکەی (قاسم) لەبەرامبەر زۆربەی لایەنە رامیاریەکانی عیراق، کاردانەوەی جۆراوجۆری لێکەوتەوەو لەئاکامدا

---

[99] حسن العلوی، س پ، ل ١٤٨.

[100] بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ٢٩٦، جلال الطالباني، س پ، ل ١٨٣. مسعود بارزانی، س پ، ل ١٠٤. منذر الموصلي، س پ، ل ١٢٢. محمد احسان، س پ، ل ٣٧.

[101] بۆ زانیاری پتر لەبارەی پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتە لەلایەن (قاسم)ەوە بۆ نمونە بڕوانە، جلال الطالباني، س پ، ل ١٨٦.

[102] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ٢٨٥. مسعود بارزانی، س پ، ل ٥٨. محمد احسان، س پ، ل٣٦. احمد فوزی، قاسم والاکراد خناجر وجبال، ط١، ب م، ١٩٦١، ص ص ١٧٩-١٨٠.

بـەبێ پشـتیوانیو لایـەنگیریی میللـی مایـەوەو لـەپارتو سـەرکردە نیشتمانیەکان داماڵراو[103]، لەئاکامدا حکومەتەکەی شەرعیەتی میللی لەدەستدا، کەمەرجێکی سەرەکی حکومەتی شۆڕشگێڕو دیموکراتیخوازە، نمونەی هەر بەرچاوی ئەو کاردانەوانەش بریتیە لە: بەرپابونی بزووتنەوەی چەکداری نیشتمانی کورد لە (١٩٦١)دا، ئەمە وێـڕای نـاڕەزایی لـەنێو بەشـێکی زۆر لەچـینو توێـژو لایەنـە رامیاریـەکانی عـەرەبی عیراقـدا بەگشتی. هەروەها حکومـەت لـەبواری چارەسـەرکردنی ریشـەیی کێشـە ئابووریەکانو ئـەنجام دانـی پرۆسـەی گەشـەپێدانی ئـابووری لەعیراقـدا شکسـتی هێنـا، بـۆ نمونـە لـەبواری کـەرتی کشـتوکاڵیدا هەرچـەندە حکومەت لە (١٩٥٨/٩/١٠) دا یاسای ژمارە (٣٠) سـاڵی (١٩٥٨) تایبەت بەریفۆرمی کشتوکاڵی دەرکرد[104]، بەڵام وەکو پێویست جێبـەجێ نەکراو لەهەندێك باردا پشتگوێ خرا، لەیاساکەدا تایبەتمەنـدێتی بـاری کوردسـتان رەچـاونەکراو جیـاوازی رێوشـوێنەکانی جێبـەجێ کردنـی لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر کێشـەی زۆری نایـەوەو لەئاکامـدا بـۆ جووتیاران بوو بەبەڵا[105]. ئەمـەش بەپێچەوانەی هەندێك لێکدانـەوەی تـر

---

[103] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانـە، حسـن العلـوي، س پ، ل ل١٢٢-١٢٤. حامد الحمـداني، بـين الـزعيم عبـدالكريم قاسـم والـزعيم مصـطفى البـارزاني، القضـية الكردية من التوافق الى الصراع، www.sotaliraq.com

[104] بڕوانـە، حسـن العلـوي، س پ، ل ١٣١. بەڵگەنامـەکانی بـەریتانیا دەرکردنـی ئـە یاسایەیان بەگرنگترین یاسا لەو قۆناغەدا ناوزەد کرد. بۆ زانیـاری زیـاتر لـەو بارەیـەوە بڕوانە، کریم مراد عاتی، س س، ل ل١٤٧.

[105] بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ل١٣٩-١٤٠. مسـعود بـارزانی، س پ، ل ل٦١-٦٣.

کەئێمە لایەنگیریی ناکەین، کەپێیان وایە حکومەت بەدەرکردنی ئەم یاسایە دەرەبەگی نەهێشتو زەوی بەسەر جوتیاراندا دابەش کرد[١٠٦].

لەبواری سامانی پترۆلیدا، هەرچەندە حکومەت چەند هەنگاوێکی نا[١٠٧]، لەرێگەی دانوستانی سێ ساڵەیدا (١٩٥٨-١٩٦١) لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکانی پترۆلدا، بەلام سەرەنجام شکستی هێنا[١٠٨]، وە نەگەیشتە رادەی خۆماڵی کردنی تەواوی ئەو کەرتە گرنگەی ئابووری لەعیراقدا.

لەبواری کەرتی پیشەسازیدا، حکومەت نەیتوانی هەنگاوی کارا بنێت بەرەو دامەزراندنی بناغەی پیشەسازی پێشکەوتوو هەروەها ئەنجام دانی پرۆسەی گەشەپێدانی هەمەلایەنیو گشتگیری لەولاتدا[١٠٩]، سەرباری ئەوەی کەرێککەوتننامەی هاوکاری ئابووری لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێتو ولاتە سۆشیالیستیەکاندا ئەنجامداو بڕی (٥٥٠) ملیۆن رۆبڵی بەقەرز لێوەرگرتن بەناوی پەرەپێدانی بوارە ئابووریو خزمەتگوزاریەکانەوە[١١٠].

هەروەها لەبواری سیاسەتی دەرەوەدا، حکومەت نەیتوانی سیاسەتێکی هاوسەنگ دارێژێتو پیادە بکات*، چونکە لەلایەك گرەوی لەسەر پەیوەندیەکانی لەگەڵ ولاتانی بلۆکی رۆژهەلاتدا دەکردو بەم هەنگاوەش

---

106 بۆنمونە بڕوانە، حسن العلوي، س پ، ل١٣١.

107 بڕوانە، ه س، ل ١٣١.

108 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ١١٦.

109 بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ل١١٩-١٢٠.

110 بڕوانە، حسن العلوي، س پ، ل ل١٤١-١٤٢.

* بۆ زانیاری پتر لەسەر سیاسەتی دەرەوەی عیراق لەسەردەمی (قاسم)دا بۆنمونە بڕوانە، د. مجید خدوری، س پ، ل ل٢٤٢-٢٤٧.

دەرگای وڵاتە بـەهێزەکانی ڕۆژئـاوای لـەڕووی عیراقـدا داخسـتو دواتـر کێشەی بۆ حکومەتەکەی دروست کرد، لەلایەکی ترەوە، هەرچەندە عیراق ئەندامێکی بزووتنەوەی وڵاتە بێلایەنەکان بوو، لەگەڵ ئەوەشـدا (قاسـم) نەیتوانی سـەنگو ئامـادەبوونێکی بەرچـاو بـۆ خـۆیو عـیراق لـەکۆڕە نێودەوڵەتیەکاندا بەدەستبهێنێت، ئەویش بـەهۆی سروشـتی گۆشـەگیری خۆیو هەبوونی سەرکردە مێژوویـیـەکانی بزووتنەوەکـە، نمونـەی (تیتـۆ، نەهرۆ، عبدالناصر، سۆکارنۆ)[111].

لەمەیدانی عەرەبیشدا، هەڵوێستو هەنگاوەکانی حکومەتی عیراقـی لەو سەردەمەدا لەمەڕ هەردوو بابەتی تایبەت بـەکوەیتو یـەکێتی یـان یەکبوونی عەرەبی، سەرکەوتوو نەبوو[112]، وێڕای ئەوەی کەلەگەڵ چەمکی "شۆڕش" لەلایەكو ڕاگرتنی بەرژەوەندیە باڵاکانی عیراقدا دژبوو، چونکە داواکاری لکاندنی کوەیت بەعیراقەوە لـەژێر هـەر پاسـاوو بیانوویەکـدا بووبێت، هیچ نا، لەگەڵ دەستوری کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبیو دەسـتوری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دژ دەوەستێتەوە.

هەروەها هەڵوێستی (قاسم) بەرامبەر بە مەسەلەی یەکپارچـەکردنی عەرەبستان خێراو یەکسەر جێگەی تێبینیو ڕەخنە بـوو، چـونکە تـەنها لەبارێکدا لەگەڵ ئەو جۆرە یەکگرتنەدا بوو، ئەگـەر عـیراق ڕووبـەڕووی مەترسی گەڕانەوەی دەسەڵاتی پاشایەتی بووایـە، "ئەمـەش مـەرجێکی هەلپەرستیو پراکماتیە"[113].

هەر لەچوارچـێوەی ئـەم خاڵـەدا، (قاسـم) دۆزی کـوردی لەعیراقـدا کردبوو بەبیانوویەكو لەهزری خۆیدا پەیوەندیـەکی نادروسـتی لـەنێوان

---

[111] بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، حسن العلوي، س پ، ل١٤٤.

[112] بڕوانە، هـ س، ل ل٥٧-٦١. د. کاوس قفطان، س پ، ل ل١١٥-١١٦.

[113] بڕوانە، حسن العلوی، س پ، ل ١٣٨.

دەستەبەرکردنی لایەنگیری کورد بۆ دەسەڵاتەکەیو نەچوونە پێشەوەی بەگەرمی لەپرسی یەکگرتنی عەرەبییدا دروستکردبوو[114]، لەکاتێکدا کەدەکرا حکومەتی عیراق هەنگاو لەو بوارەدا بنێت بەبێ ئەوەی لایەنگیریی گەلی کورد لەدەست بدات، ئەگەر لەچوارچێوەی هەرچەشنە یەکگرتنێکدا مافەکانی گەلی کوردی بسەلماندایە.

هەروەها حکومەتەکەی (قاسم) لەبواری بەدیهێنانی یەکێتی نیشتمانیو دۆزینەوەی چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ دۆزی کورد لەعیراقدا سەرکەوتوو نەبوو[115]، چونکە هیچ هەنگاوێکی راستەقینەی بەئاراستەی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە نەنا، هەرچەندە لەدوو ساڵی یەکەمدا پەیوەندیەکانی نێوان (قاسم)و سەرکردایەتی پارتی لەسەر بنەمای ئەندازەیەك لەلێکتێگەیشتنو هاوکاری کاتی بەندبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پرۆژەیەکی بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد پێشکەش نەکرد[116]، هەروەها هیچی بۆ باش کردنی باری کۆمەڵایەتیو ئابووری کوردستان نەکرد[117]. هەر لەم بارەیەوە هەندێك لەتوێژەران هەر لەلێکدانەوەی هەنگاوە بەراییەکانی حکومەتەکەوە ئەو باری سەرنجەیان لەلا دروست بووە، بۆ نمونە (الموصلی) دەڵێت: "لەخوێندنەوەی یەکەمین بەیاننامەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کەهیچ ئاماژەیەکی بۆ کەمینە نەتەوەییەکانو ئایندەی رامیاریانو رۆڵیان لەشۆڕشدا تێدانەبوو، ئەمەش

---

114 بۆ زانیاری پتر لەوبارەیەوە بۆنمونە بڕوانە، هـ س، ل١٣٣.

115 بڕوانە، حسن العلوی، س پ، ل ١٣٢، حامد الحمدانی، بین الزعیم ....، س پ، www.sotaliraq.com

-Christiane Bird op،cit،p20.

116 بڕوانە، هـ س، ل١٣٢.

117 بڕوانە، د. مجید خدوری، س پ، ل ٢٣٨، هەر بەهەمان واتا بڕوانە، احمد فوزی، س پ، ل ل١٨٠-١٨١.

سەرنجی ئەوە دەبەخشێت کەسەرکردەکانی شۆڕش لەئەجیندای کورتخایەنی خۆیاندا دایان نەناوەو دێرەکانی بەیاننامەکە ئاماژەی پێنەدراوە"[118].

هەر لەبارەی بەیاننامەکەوە (العلوی) بەم شێوەیە گوزارشتی لێدەکات کە، "یەکەمین بەیاننامەی شۆڕش بڕگەیەکی روونی لەبارەی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی لەسەر بنەمای دروست تێدابوو، وادیارە مەبەست لەم بنەما دروستانە بەلای عبدالکریم قاسمەوە بانگەوازەکەی ئابی ساڵی (١٩٦١) هەمووان لەپشتی سەرکردەوە) دەگەیەنێت"[119].

هەر لەو بارەیەوە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی بابەتیانەی توێژەرێکی تر جێگەی بایەخە کەپێی وایە لەهزری (قاسم)و هاوپیشەکانیدا کە لەسەربازگەکانەوە گەیشتوونەتە دەسەڵات، هیچ دیدو بۆچوونێکی کردارەکی نەبووە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد لەسەر بنەمایەکی یاسایی، بەڵکو هەموویان لەو بڕوایەدابوون کەکێشەکە خۆی لەنیاز پاکیدا دەبینێتەوە، دروشمەکانی برایەتیو هاوبەشێتی لەنیشتمانداو یەکسانی بەسن بۆ چارەسەرکردنی دۆزەکە بەبێ بایەخدانێکی راستەقینە بەمافو خواستە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەزمانو کەلتورو ئۆتۆنۆمیو.. هتد[120]. بەم شێوەیە وەکو (خدوری) دەڵێت: "عبدالکریم قاسم لەدوارۆژەکانی حوکمڕانییدا ئەوەندەی لەجیهانی دەرەوە دابڕا بوو ئەوەندەش لە گەلەکەی خۆی دابڕابوو"[121].

---

[118] منذر الموصلي، س پ، ل ١٠٧.

[119] حسن العلوی، س پ، ل ١٣٢.

[120] بڕوانە: علی کریم سعید، عراق ٨ شباط ١٩٦٣ من حوار المفاهیم الی حوار الدم مراجعات في ذاكرة طالب شبيب، ط١، دار الكنوز الادبية، بيروت، ١٩٩٩، ص ٢٤٨.

[121] د. مجید خدوری، س پ، ل ٢٤٧. هەر لەو بارەیەوە بڕوانە، حامد الحمدانی، بین الزعیم...، س پ، www.sotaliraq.com

## باسی سێیەم

# باری یاسایی گەلی کوردو مافەکانی لە دەستوری کاتیی ساڵی ١٩٥٨دا

کێشمەکێشی دەستوریو یاسایی بوارێکی تری بێنەوبەرەی نێوان سەرکردایەتیی کوردو حکومەتەکانی عیراق بووە. تێیدا گەلی کورد خەباتی سەربازیو دیپلۆماسی ئەنجام داوە لەپێناو سەلماندنو بەدیهێنانی مافەکانیداو لەبەرامبەردا ئەو حکومەتانە کاریان بۆ پێچەوانەی ئەوە کردووە. لەبارەی هەڵوێستی دەستوری کاتیی عیراق ساڵی (١٩٥٨)* ەوە لەمافەکانی گەلی کورد، لێرەدا بەکورتی لێکدانەوە بۆ ئەو بەندانەی دەستورەکە دەکەین کە لەوانیتر بۆ کورد پتر جێگای سەرنجو بایەخن، کەبریتین لەبەندەکانی (٢، ٣)، لەبەندی دووەمی دەستورەکەدا هاتووە کە:

"عیراق بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب"[122]، بەبۆچوونی ئێمە دەقەکە ئەم تێبینیانە هەڵدەگرێت:

---

* دەستورەکە لە (٢٧/٧/١٩٥٨)دا راگەیاندراو تێیدا ئاماژە بەهەڵوەشانەوەی یاسای بنچینەیی عیراقی ساڵی (١٩٢٥) کراو ماوەی گواستنەوەی کارپێکردنی دەستورە نوێیەکەی دەستنیشان نەکرد، بڕوانە: د. رعد الجدة، التشريعات الدستورية في العراق، بيت الحكمة، بغداد، ١٩٩٨، ل ٦٠. ازهار عبدالكريم عبدالوهاب، الحقوق والحريات العامة في ظل الدساتير العراقية، اطروحة ماجستير غير منشورة، كلية القانون والسياسة. جامعة بغداد، ١٩٨٣ص ١٢٣.

[122] بۆ دەقی بەندی دووەم لەدەستوری کاتی عیراقدا ساڵی (١٩٥٨)، بڕوانە: د. رعد الجدة، التشريعات الدستورية في العراق، بيت الحكمة، بغداد، ١٩٩٨، ل ٦١.

١-دەقەکە رەنگدانەوەی ئایدۆلۆجیای پان عەرەبیزمو شۆڤێنیزمی عەرەبییەو ئامانجی بەزۆر لکاندنو تواندنەوەی نەتەوە ناعەرەبەکانی عیراقە لەبۆتەی جیهانی عەرەبیدا.

٢-ناوەڕۆکی دەقەکە پێچەوانەی راستییە جوگرافیو مێژوویی‌و نەتەوەییەکانی عیراقەو نکۆڵی کردنە لەدانپێدانان بەکەسایەتی جیاوازی گەلی کوردو نیشتمانەکەی دا.

٣-فەرامۆش کردنو پێشێل کردنی دەستورییە بۆ پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان، چونکە رەچاوی ویستو بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردی تێدا نەکراوە.

٤-ناوەڕۆکی بەندەکە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ناوەڕۆکی بەندی سێیەمی دەستورەکەدا کەتێیدا هاتوە"... عەرەبو کورد هاوبەشن لەم نیشتمانەداو، دان بەمافە نەتەوەییەکانیان لەناو یەکێتی عیراقدا نراوە[١٢٣]. ئەمەش جگە لەناواخنە رامیاریەکەی لەبارەی مافەکانی گەلی کوردەوە، ئەوا لەڕوانگەی بنەما یاساییەکانیشەوە نەشیاوە، چونکە لەمەرجو شەقڵەکانی بنەما دەستوریەکان ئەوەیە کەیەکانگیری‌و تەواوکەری لەنێوانیاندا هەبێت، نەك هاودژی. سەبارەت بەئەم راستیەو بانگەشەکەی رۆژنامەی "الثورة"ی سەر بە (قاسم) لەمەڕ تواندنەوەی نەتەوەیی گەلی کورد لەبۆتەی نەتەوەی عەرەبدا، پارتی لەگوتاری (٩/١٠/١٩٦٠)[١٢٤] دا وەلامێکی بابەتیانەی وردو راشکاوی دایەوە کەگوزارشت لەئایدیای بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی‌ی کورد لەباشورو پرۆگرامو پێڕەوی نێوخۆی پارتی لەو سەردەمەدا دەکرد، لەم

---

[١٢٣] بۆ دەقی بەندی سێیەم بڕوانە: د. رعد الجدة، س پ، ل ٦١

[١٢٤] بۆ دەقی گوتارەکە، بڕوانە: جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، ل ٨٤١.

بارەیەوە (العلوی) دەڵێت: "مافە نەتەوەییەکانی کورد کە پاش شۆڕشی ١٤ی تەمموز زۆریان لەبارەوە وترا، نە لەبڕیارێکدا بەرجەستە کران نە لەیاسایەکداو نە لەبەیاننامەیەکداو تەنانەت لەبەیاننامەیەکی لەبابەتی بەیاننامەکەی عەبدولڕەحمان بەزازیش بەرجەستە نەکران. عەبدولکەریم قاسم واوەتر رۆیی، کاتێك ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای لە کوردستان لەنێوان سوپای عێراقو هێزەکانی کورد بەسەرکردایەتیی بارزانی شاردەوەو رێگەی نەدا باس بکرێنو مەسەلەی کوردی نەکردە بابەتێکی باس لەئەجندەی کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران یا هەر کۆبونەوەیەکیتر. بەڵام بۆ عەبدولکەریم قاسم کارێکی قورس نەبوو کە کوردزوبانێك بدۆزێتەوەو وەك نوێنەری کورد بیکاتە وەزیر لە وەزارەتێکی خزمەتگوزاردا"[١٢٥].

هەر لەبارەی ئەو بەندەوە (الموصلی) دەڵێت: "ئەو دەقەی دەستور وەکو تێبینی دەکەین بەشێوەیەکی گشتی هاتووە، بەڵام هەنگاوێکی باشە، هەرچەندە هیچی لەبارەی دەسەڵاتدان بەحکومەت لەخۆنەگرتووە بۆ دەرکردنی بڕیاری پێویست بۆ گۆڕینی ئەم رێبازە دەستوریە بەشێوەیەکی کردارەکی پراکتیکی لەمەیداندا[١٢٦]، هەرچەندە هەندێك لەهەنگاوەکانی حکومەت لەبواری مافو ئازادیە کەلتوریو پیشەییەکاندا بۆ کورد بەدەستکەوت ژمێردرا[١٢٧]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو هەنگاوانەی حکومەت لەو بارەیەوە وەکو توێژەرێك دەڵێت: شتێکی نوێی نەهێنایە

---

[١٢٥] حسن العلوي، عبدالكريم قاسم رؤية بعد العشرين، منشورات دار الزوراء، لندن، ١٩٨٣، ل ١٣٣.

[١٢٦] منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق، البعث والاكراد، دار المختار، دمشق، ٢٠٠٠، ل ١٠٨.

[١٢٧] بڕوانە: هـ. س، ل ل ١٠٨-١٠٩.

کایەوە، چونکە "حکومەتی قاسم لەعیراق هیچ دەستکەوتێکی نوێی لەدەستکەوتەکانی دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز پێشکەش بەگەلی کورد کەهاوولاتیە لەخاکی عیراقدا نەکرد.. زمانی کوردی پێشتر زمانێکی دانپێدانراو بوو.. دەسەلاتدارانی سەردەمی پاشایەتی لەناوچوو دانیان پێداناو خستیانە بەرنامەی خوێندنەوە"[128]، هەر لەم بارەیەوە (تالەبانی) دەڵێت: "هەرچەندە شۆڕشی ١٤ی تەمووز دانی نا بەهەبوونی نەتەوەی کوردو پرنسیپی شەریکایەتی‌ی نیشتمان لەنێوان عەرەبو کورداو لەمادەی سێیەمی دەستورەکەدا مافە نەتەوەییەکانی کورد سەلمێنراون .. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پەیکەری کارگێڕیو دەستوریی عیراق هەر لەسەر جۆری کۆن مایەوە، یەکێتی‌ی عیراق لەڕووی کارگێڕیو دەستوریەوە نەگۆڕاو نەبوە یەکێتیەکی برایانەی راستەقینەی لەنێوان هەردوو نەتەوەدا ئەوەش بەهۆی بێبەشکردنی گەلی کورد لەو دامودەزگا کارگێڕیو ڕووناکبیریو رامیاریە نەتەوەییانەی کە بەهۆیانەوە مافە نەتەوەیی‌یەکانی خۆی دەخستە کار"[129]. هەرچەندە ئەمە یەکەمین جارە کەباس لەجووت پێکهاتەی نەتەوەیی‌ی کوردو عەرەب لەعیراقداو هاوبەشیان لەنیشتماندا بکرێت، بەلام حکومەت هیچ هەنگاوێکی کردارەکی بۆ جێبەجێ کردنی ئەو بەندە نەنا، وێڕای ئەو هاودژیەی کە لەنێوان ئەو بەندەو بەندی دووەمدا هەیە[130].

سەرباری ئەو تێبینیانەی ئاماژەیان پێدرا، خودی دەستورەکەش لەچەند روویەکی ترەوەو چۆنێتی مامەڵەکردنی دەسەلاتداران لەسایەیدا چەند تێبینیەکی تر هەڵدەگرێت، گرنگترینیان ئەمانەن:

---

[128] احمد فوزی، قاسم والاکراد خناجر وجبال، بیروت، ١٩٦١، ل ل ١٨٠-١٨١.

[129] جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، مطبعة الجمهورية، بغداد، ١٩٦٩، ل ٢١١.

[130] لەو بارەیەوە بڕوانە: حسين جميل، العراق الجديد، بيروت، ١٩٥٨، ص ٦٠.

١-دەستورەکە کاتیی بوو، کە لەوانەیە زۆر جار مەبەستی شاراوەی پشت ئەم جۆرە هەنگاوە خۆدزینەوە بێت لەئەرکی دانانی دەستورێکی هەمیشەیی کە لەسایەیدا دەستکاری کردنی بنەماکانی قورسترو ئاڵۆزتر دەکرێت، لەپێناو چەسپاندنو جێگیرکردنیدا، بەپێچەوانەی دەستوری کاتیەوە کەبواری خراپ راڤەکردنو هەموارکردنو پێشێل کردنی پترە، هەر لەسایەی ئەو دەستورە کاتیەشدا، حکومەت هەوڵی زەمینە خۆش کردنی نەدا بۆ دانانی دەستوری هەمیشەییو دامەزراندنی دامودەزگا دەستوریەکانی وەکو "ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش" تاوەکو ئەرکەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بگرێتە ئەستۆ[١٣١].

٢-یەکێك لەئەرکە بنچینەییەکانی دەستور دەستنیشانکردنی دەستەکانی دەسەڵاتی فەرمانڕانیو پسپۆڕیو دەسەڵاتەکانی هەر یەکەیانو رێوشوێنو مەرجەکانی هەڵبژاردن یان دامەزراندنی کارمەندانێتی. کەچی دەستورەکەی ساڵی (١٩٥٨) لەبارەی ئەنجومەنی سەروەرییەوە، کەیەکێکە لەو دوو دەستەیەی پرۆسیسکردنی دەسەڵاتیان پێسپێردراوە، هیچی لەبارەی رێوشوێنی دیاری کردنی سەرۆكو دوو ئەندامەکەو ئەو مەرجانەی کەپێویستە تێیاندا هەبێت ئاماژە پێنەدراوە، ئەمەش هێمایە بۆ ئەوەی کەدەسەڵاتی دەستنیشان کردنیان لەدەستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیراندایە[١٣٢]، سەرباری ئەوەی کەدەستورەکە دەسەڵاتی روونو دیاری کراوی بەئەنجومەنەکە نەداوە[١٣٣].

---

[١٣١] بۆ نمونە بڕوانە: حسن العلوی، س پ، ل ١٤٧.

[١٣٢] بڕوانە: د. حميد الساعدي، مبادیء القانون الدستوري وتطور النظام السياسي في العراق، دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٠، ل ١٦٨.

١٣٣ بڕوانە: هـ س، ل ١٦٩.

٣-لەبارەی ئەنجومەنی وەزیرانەوە، دەستورەکە هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە بۆ لانی کەمی ژمارەی ئەندامەکانی‌و ئەو مەرجانەی کەپێویستە لەپاڵێوراودا هەبێت بۆ دامەزراندنی بەشالیار[١٣٤].

٤-جێگیرکردنی پرنسیپی جیاکردنەوەی نێوان دەسەڵاتەکان لەدەستوردا، یەکێکە لەبنەما بنچینەییەکانی سستمی فەرمانڕانی دیموکراتی، کەرێگر دەبێت لەبەردەم دیاردەی چڕکردنەوەی دەسەڵاتەکان‌و دکتاتۆریەت‌و تاکڕەوی، بەڵام لەسایەی ئەو دەستورەدا، هەردوو دەسەڵاتەکانی یاسادانان‌و جێبەجێ کردنی بەئەنجومەنی وەزیران سپێردراوەو هیچ کۆت‌و بەندێکی دەستوریش نیە رێگر بێت لەبەردەم خراپ بەکارهێنانیدا[١٣٥].

٥-پێویستە بنەماکانی دەستور بەوردی‌و روونی داڕێژرێت‌و راڤەی جۆراوجۆر هەڵنەگرێت، بەڵام لەم رووەوە بۆ نمونە وەکو (الساعدی)دەڵێت: "دانەرانی دەستوریساڵی ١٩٥٨ لەداڕشتنیدا سەرکەوتوو نەبوون، رەنگە ئەوەش بەمەبەست بووبێت بۆ ئەو نیازانەی کە لەبیری دەسەڵاتدارە نوێیەکاندا بوو"[١٣٦].

---

[١٣٤] بڕوانە: د. حمید الساعدی، س پ، ل ١٦٩.

[١٣٥] بۆ زانیاری پتر لەسەر پرنسیپی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان‌و رادەی رەچاوکردنی لەدەستورەکانی عیراق‌و پەیڕەوکردنی لەلایەن حکومەتەکانی ئەو وڵاتەوە، بڕوانە: لطیف مصطفی امین، مبدأ فصل السلطات ووحدتها وتطبیقها في الدساتیر العراقیة، رسالة ماجستیر غیر منشورة، کلیة القانون، جامعة السلیمانیة، ٢٠٠٣، سردار یاسین محمد امین، استقلال السلطة القضائیة بین النظریة والتطبیق. رسالة ماجستیر غیر منشورة، کلیة القانون والسیاسة، جامعة صلاح الدین-اربیل، ٢٠٠١، ص ٣٩ وما بعدها.

[١٣٦] د. حمید الساعدي، المصدر السابق، ل ١٦٩.

٦-رێوشوێن‌و شێوازی دانانی دەستورەکە جێگەی تێبینیە، چونکە ناچێتە خانەی هیچ کام لەو رێوشوێن‌و شێوازانەی کەباون* بەتایبەتی دیموکراتیەکانی، بەڵکو ئەم راستیەش رەنگدانەوەی خراپی لەسەر هەموو بوارەکانی ژیان لەعیراقدا هەبوو، لەوانەش فەرامۆش کردنی رۆڵ‌و دیدی گەلی کورد لەدانانیدا.

---

* رێوشوێن‌و شێوازەکانی دانانی دەستور بەسەر دوو جۆردا پۆلێن دەکرێت، نادیموکراتیەکان کەبریتین لە (پێبەخشین‌و، گرێبەست)و دیموکراتیەکانیش کە (کۆمەڵەی دامەزرێنەرو، راپرسی میللی یان دەستوری) دەگرێتەوە، بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە، بڕوانە: د. حميد الساعدي، س پ، ل ١٠٦.

## باسی یەکەم

# سیاسەتی حکومەتی بەعس سەبارەت بە مەسەلەی کورد لەساڵی ١٩٦٣دا

لـــە (٨/٢/١٩٦٣)دا بەعـســـیەکان، لەڕێگـــەی کودەتایـــەکی سەربازیەوە کۆتاییان بەحکومەتی(قاسم) هێنـــا، بەمـــەش ســـەرەتای فـــەرمانڕانی دە مانگـــەیان دەســـتی پێکـــرد[١]. یـــەکێك لـــەهۆکارە سەرەکییەکانی رووخانی حکومەتی پێشوو بریتی بوو لەنەگرتنەبەری رێگەچارەی ئاشتیانەو دیموکراتیانە بۆ دۆزی نەتەوەیی گەلی کـوردو سوربون لەسەر بەکارهێنانی رێوشوێنی زەبـروزەنگو سـەرکوتکردنی سەربازی بەجۆرێك کە تا ساتی رووخانی ئەو حکومەتە کێشمەکێشی سەربازی لەکوردستاندا درێژەی هەبوو.

هەر لەپێش ئەنجامدانی کودەتاکەوە، جۆرێـك پەیوەنـدی لـەنێوان پـــارتیو بەعســـیو ناسیۆنالیســـتەکان بـــەهۆی ژیـــانی هاوبەشـــی زیندانیانـــەوە دەســـتیپێکرد. بەعـسییەکان لەڕێگـەی عـەقید تـاهیر یەحیاوە کەماوەیەکی کەم بەر لەکودەتاکە پەیوەندی بەبەعســەکانەوە کردبوو، پێشـتریش لەسـەر داوای بەعـسیەکان هـەوڵی رێکخسـتنی

---

[١] حکومەتی(قاسـم) بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵو شـەش مـانگو بیسـتو پێـنج رۆژ فەرمانڕەوایی‌ی عێراقی کرد. بڕوانە: منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق، دار المختار، دمشق، ٢٠٠٠، ص١٣٢. شایانی ئاماژە پێدانە کەژمارەیەك لەلایـەنگرانی پارتی بەشداریان لەسەرخستنی کودەتای بەعسیەکاندا کـرد، بەتایبـەتی ئەوانـەی لـەهێزی ئاسمانیـدا کاریـان دەکـرد، لەڕێگـەی پەکخسـتنی فڕۆکـەکانی فێرگـەی رەشیدەوە، بڕوانە: د. علي كريم سعيد، عراق ٨ شباط ١٩٦٣، دار الكنـوز الادبيـة، بيروت، ١٩٩٩، ص٢٤٨.

پەیوەندی نێوانیانی لەگەڵ کورددا دابوو، ناوبراو بەمولازم(کەریم قەرەنی)دا بابەتەکەی بەسکرتێری پارتی(ابراهیم احمد) راگەیاندو بەڵێنی زارەکییان بەپارتیدا کەهاتنە سەر حوکم چارەسەری ئاشتیانەی دۆزی کورد بکەنو داخوازیەکانیان لەچوارچێوەی ناوەندێتیدا جێبەجێ بکەن بەمەرجێك لەگەڵ حکومەتی(قاسم)دا رێکنەکەونو درێژە بەشەڕ بدەنو لەگەڵ بەعسدا هاوکار بن بۆ روخاندنی ئەو حکومەتە[2].

لەسەر ئەو بنەمایە سەرکردایەتیی پارتی بڕیاریان لەسەر هاوکاریکردنیان داو(ابراهیم احمد) سکرتێری پارتی لەنامەیەکدا بۆ بەعسیەکان ئەوەیان دەربڕی کەئەو هەڵوێستەیان بەندە بەدانپێدانان بەمافەکانی گەلی کوردو چارەسەری دۆزەکەیان لەچوارچێوەی ئۆتۆنۆمیو لەیەکەمین بەیاننامەی پاش دەسەڵات گرتنەدەستدا ئەمە رابگەیەندرێ لەتەك راگەیاندنی ناوی(بارزانی) وەکو سەرۆك وەزیرانی حکومەتی ئۆتۆنۆمی کوردستان[3]

هەر لەو هەلومەرجەدا(طاهر یەحیا) لەنامەیەکیدا بۆ سکرتێری پارتی(ابراهیم احمد) داوای کرد کەناوی شەش کاندیدی خۆیان بدەن بە

---

[2] بڕوانە: شلومو نکدیمون، الموساد في العراق ودول الجوار انهيار الآمال الاسرائيلية والكردية، ترجمة: بدر عقيلي، ط٢، مطبعة دار القدس، بيروت، ١٩٩٨، ص٧٩.
ابراهیم جەلال، خواروی کوردستانو شۆڕشی ئەیلول بنیاتنانو هەڵتەکاندن، ١٩٦١-١٩٧٥، ط٣، چاپخانەی ژیار، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٩٣.

[3] بڕوانە: ابراهیم جەلال، س پ، ل٩٣. د. محمد عمر مولود، الفدرالية وامكانية تطبيقها في العراق، ط١، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، أربيل، ٢٠٠٠، ص١٠٦
شایانی ئاماژەپێدانە کە(ابراهیم جەلال) پێی وایە راگەیاندنی ناوی(بارزانی) وەکو سەرۆك وەزیرانی حکومەتی ئۆتۆنۆمی کوردستان، مەرجێکی کورد بوو.

بەعسیەکان بۆ ئەوەی پاش هاتنیان بۆ سەر حوکم بەشداری حکومەتی نوێیان بکەن، هەروەها دانی بەوەدا نا کەهەڵوێستی حکومەتی نوێ لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی دەبێت[٤]، پارتی بەم شێوەیە وەڵامی نامەکەی دایەوە"دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، ئەمە دروشمی ئێمەیەو سیاسەتی حزبمانە، وە ئەو ناوانەی کە پێشنیازیان دەکەین بریتین لەبابەعەلی شێخ مەحمودی حەفید، عەمید فوئاد عارف، بکر عبدالکریم، عمر مصطفی، جەلال تاڵەبانی، علی عسکری"[٥]

دواتر دوو ناوی یەکەمیان وەکو وەزیر لەکابینەی(احمد حسن بکر)دا بەرەزامەندی سەرکردایەتی پارتی دەستنیشان کران[٦]، بێ ئەوەی هیچیان لەڕووی پەیوەندی سیاسییەوە سەر بەپارتی یان بزووتنەوەی کوردایەتی بن[٧]. ئەمە وێڕای ئەوەی کە لەکۆبوونەوەی دووقۆڵی نهێنی نێوان نوێنەری هەردوو لایەن(صالح یوسفی)و(علی صالح سعدی) بەئامادەبوونی(شوکت عقراوی) کە(فوئاد عارف) رۆڵی لەسازدانیدا هەبوو، بەر لەکودەتاکە بەچوار رۆژ ئەنجام درا، بەڵێنی ئەوەیان دا کەداخوازیەکانی کورد لەچوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدا، لەبری نا ناوەندێتی جێبەجێ بکرێت[٨]. لەوەش زیاتر(السعدی) رایگەیاند کە"نەک هەر مافی ئۆتۆنۆمیان هەیە، بەڵکو لەسەرووی ئەوەشەوە

---

[٤] بڕوانە: شلومو نکدیمون، س پ. ل٨٠.

[٥] مسعود بارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية ثورة ايلول ١٩٦١-١٩٧٥، ج٣، مطبعة وزارة التربية، اربيل. ٢٠٠٢، ص٨٤.

[٦] بڕوانە: منذر الموصلي، المصدر السابق، ص١٣٥.

[٧] بڕوانە: ابراهيم جەلال، س پ، ل٩٤.

[٨] بڕوانە: فؤاد عارف، مذكرات فؤاد عارف، تقديم وتعليق د. كمال مظهر احمد، ج١، مطبعة خبات، دهوك، ١٩٩٩، ل٢٦٣.

مـــــافی چـــارەی خۆنووســـــین"[9] لـــــەبارەی ئـــــەم کۆبوونەوەیـــــەو ئاکامەکەیـەوە(جـرجیس فـتح الله) دەڵێـت" "لـە(صـالح یوسـفی) تێگەیشتم رێککەوتنی نووسراو لەئارادا نەبوو بەڵکو شتێك لەبابـەتی ئەوەی پێی دەڵێن(رێککەوتنی جێنتلمان)ی زارەکیو هەنـدێك بـەڵێنی تەمومژاوی[10].

لەبـــەیانی(٨/٢/١٩٦٣)دا کودەتاکـــە ئـــەنجام دراو رووخـــانی حکومـەتی(قاسم) راگەیەندراو ئێوارەی ئەو رۆژە لەلایەن(بارزانیـیەوە) بانگەوازی راگرتنی شەڕ راگەیەندرا[11]، دەسەڵاتدارانی نوێی عێـراقیش لەلایەن خۆیانەوە درێـژەیان بەشـەڕی پـێش خۆیـان نـەداو[12]، هـەر لـەو مـانگەدا ئەو بارە رێککەوتنی ئاگربەستی نێوانیانی لێکەوتەوە[13].

یەکەمین بەیاننامەی بەعسیەکان لەپاش گرتنەدەستی دەسـەڵاتدا، جگە لەچـەند زاراوەو چـەمکێکی گشـتیو تەمومـژاوی، هـیچ چەشـنە دەستنیشانکردنو دانپێـدانانێکی روونـی بەگـەلی کـوردو مافـەکانیو سروشـــتی راســـتەقینەی دۆزەکـــەی لـــەخۆ نـــەگرتبوو، هـــەروەها لـــەو بانگەوازەی هەر لەو رۆژەدا راگەیەنـدرا داوای لـەکورد کـرد کـەکۆتایی

---

[9] مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٣.

[10] میڤان عارف عبدالرحمن البادی، الحركة القومية الكردية التحررية في كردستان الجنوبية ١٤ تموز ١٩٥٨-٨ شباط ١٩٦٣، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٢، ل١١٦.

[11] بڕوانـە: ابـراهیم جـەلال، س پ، ل٩٤. عبـدالكريم فرحـان، حصـاد ثـورة، تجربـة السـلطة في العـراق(١٩٥٨-١٩٦٨)،(المـذكرات)، ط١، دار الـبرق، لنـدن، ١٩٩٤، ل١٥٧. شلومو نكديمون، س پ، ل٨٠.

[12] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٣٥. عبدالكريم فرحان، س پ، ل١٥٧.

[13] بڕوانە: دیڤید ادامسنو جرجیس فتح الله، الحرب الكردية وانشقاق عـام ١٩٦٤، ط٢، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ١٩٩٩، ل٢٠٤.

بەبزووتنەوەکەی باشووری کوردستان بهێنن، بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەك بۆ دابینکردنی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بکات[١٤].

هەر لەو بەیاننامەیەدا هاتبوو کە"حکومەت کار دەکات لەپێناوی رێگەدان بەئازادییە دیموکراتییەکانو بەهێزکردنی پرنسیپی سەروەریی یاسا، وە بەدیهێنانی یەکێتی نیشتمانی گەل کەپێویستی بەهێزکردنی برایەتی عەرەبو کورد دەخوازێت، بەجۆرێك کە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی دابین بکات... هتد"[١٥].

هەر لەیەکەمین رۆژی کودەتاکەدا بێژەری ئێزگەی بەغدا داوای لە(عەمید فوئاد عارف)و(سالّح یوسفی) کرد کەبۆ بارەگای ئێزگە ئامادە بن تاوەکو پەیوەندیکردنی نێوان سەرکردایەتی پارتیو بەعس دابین بکەن[١٦]. ناوبراوان لەبروسکەیەکدا کە دواتر بلاّوکرایەوە، واژۆی هەردووکیانی بەسەرەوە بوو، بەلاّم لەلایەن(شەوکەت عقراوی)ـەوە دارێژرابوو بەناونیشانی(دەست لەململانێی دوو شۆڕشەکە). پیرۆزبایی و پشتیوانی پارتیان لەمەڕ گۆڕانکاری نوێی عێراق تێدا خستە روو، هەروەها بەلّێنەکانی پێشووی بەعسیەکانیان لەمەڕ ئۆتۆنۆمی کوردان وەبیر هێنانەوە[١٧].

---

[١٤] بڕوانە: د. سعد ناجي جواد، المسألة الكردية في العراق ١٩٥٨-١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ل٧٨.

[١٥] فؤاد عارف، س پ، ل ل٢٦٢-٢٦٣. منذر الموصلي، س پ، ل١٣٢. ابراهيم جەلال س. پ. مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل٤٨١-٤٨٢، پاشکۆی ژمارە(١١)ی سەرچاوەکە.

[١٦] بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، سپ، ل٨٣، بەراوردی بکە لەگەلّ منذر الموصلي، سپ، ل١٣٤.

[١٧] بڕوانە: ابراهیم جەلال، س پ، ل٩٥. منذر الموصلي، س پ، ل١٣٤. د. علي كريم سعيد، س پ، ل ل٢٥٠، ٣٦٧. عبدالكريم فرحان، س پ، ل١٥٧.

بەڵام رابەرانی کودەتاکە وەڵامی بروسکەکەیان نەدایەوەو هیچ چەشنە نیازپاکییەکیان بەئاراستەی رەواندنەوەی گومانەکانی رابەرانی کوردو چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد نیشان نەدا[18]

هەر لەسەرەتای فەرمانڕانی پارتی بەعسەوە، دوو رێبازی جیاواز لەمەڕ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ دۆزی نەتەوەیی کورددا پەیدا بوو. یەکەمیان لەگەڵ گرتنەبەری رێوشوێنی سەربازیو زەبروزەنگ بوو بەمەبەستی ملکەچکردنی کورد، بەڵام دووەمیان لەگەڵ گرتنەبەری رێوشوێنی رامیاری بوو، لەچەشنی دانوستانو دووبەرەکینانەوە لەنێو کورددا بۆ پەرتکردنی بزوتنەوەکەیان[19]

لەبەرامبەریشدا، لەنێو سەرکردایەتی پارتیداو لەبەر رۆشنایی‌ی هەڵوێستەکانی حکومەتی بەعس لەهەفتەی یەکەمی فەرمانڕانیدا، دوو بۆچوونی جیاواز لەمەڕ چۆنێتی مامەڵەکردن لەئاست ئەم گۆڕانکاریە نوێیەدا سەری هەڵدا" لایەنگرانی درێژەدان بەرێگاچارەی سەربازی لەگەڵ حکومەتی نوێداو، لایەنگرانی راگرتنی شەڕو بواردان بەرێگەچارە دیپلۆماسیەکان[20]

---

[18] بڕوانە: د. كاوس قفطان، الانتفاضات البارزانية صفحات من الحركة القومية التحررية الكردية في النصف الاول من القرن العشرين، مطبعة سركوتن، السليمانية، ٢٠٠٢، ل٢١٤.

[19] بڕوانە: د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية ملاحظات تأريخية ودراسات اولية، مؤسسة مكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١، ل٢٣٠.

[20] بۆ زانیاری پتر لەسەر ناوەڕۆکی بۆچوونی لایەنگرانی هەردوو رێبازەکەی لایەنی کوردیو پاساوی هەر یەکەیان، بۆ نمونە بڕوانە: ابراهیم جەلال، س پ، ل ل٩٤ —٩٥. د. کاوس قفطان، س پ، ل ل٢١٨-٢٢١.

لەڕاستیدا دواتر دەرکەوت کەلێکدانەوەکانی لایەنگرانی بۆچوونی یەکەمیان دووربینانەتر بوو وە لەسەر بنچینەیەکی بابەتیانەتر گەڵاڵە کرابوو، ڕەوتی ڕووداوەکانی ڕۆژانی دواتر ئەم ڕاستیەی سەلماند، لەم بارەیەوە پشتیوانی لەهەڵسەنگاندنەکەی(د. کاوس قفطان) لەمەڕ چوونە پێشەوەی کورد بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بەعسیدا دەکەین بەوەی کەئاکامە خراپەکانی ئەوەندە بەهێزو کاریگەر بوون لایەنە باشەکانی داپۆشی[21].

هەر لەم بارەیەوە بیرۆی رامیاری پارتی لە(٨/٢/١٩٦٣)دا بروسکەیەکی ئاراستەی(بارزانی) کرد کەتێیدا هاتوە(...... لەو بڕوایەداین کەدەرفەت بەتەواوی لەبارە بۆ لێدانی دوژمن پێش ئەوەی شوێن پێی قایم بکات... پێویستە ئەم دەرفەتە بقۆزینەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی شۆڕشەکەمانو ئامانجەکانی گەلی عێراق بەگشتی"[22]

لەگەڵ ئەوەشدا پارتی لە(١٠/٢/١٩٦٣)دا لەبروسکەیەکی پیرۆزباییدا داوای لەحکومەت کرد کەدان بەمافی ئۆتۆنۆمیدا بۆ کورد بنێتو شاندێکی فەرمی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا بنێرێت[23]، لە(١١و١٢/٢/١٩٦٣)دا بەبروسکە هێزی پێشمەرگەی لەبڕیاری

---

[21] بڕوانە: د. کاوس قفطان. س پ. ل٢١٧.

[22] ه س، ل٢١٨.

[23] بۆ دەقی بروسکەکە بڕوانە: شازین هێرش، ب١، بەڵگەنامە: پارتی دیموکراتی کوردستان لەچەندین بەڵگەنامەی مێژوییدا، چاپخانەی ژیر، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ل١٤٣-١٤٤.

ئاگربەستو دەستپێکردنی وتووێژی فەرمی نێوان هەردوو لایەن ئاگادار کردەوە[٢٤].

لە(١٦/٢/١٩٦٣)دا حکومەت لەچوارچێوەی راگەیاندنی بەرنامەی خۆیدا، بەڵێنیدا کەدۆزی کورد لەگەڵ سەرکردایەتی کورددا بەئاشتیانەو لەرێگەی گفتوگۆوە چارەسەر بکات[٢٥].

لە(١٨/٢/١٩٦٣)دا شاندێکی پارتی بەسەرۆکایەتی(تاڵەبانی)و ئەندامێتی(صالح یوسفی)و(لوقمان بارزانی) گەیشتە بەغداو لەدواترەوە زنجیرەیەك کۆبوونەوەو وتووێژیان ئەنجام دا لەگەڵ گەورە بەرپرسانی حکومەتو حزبدا، وەکو(احمد حسن البکری سەرۆك وەزیرانو طاهر یەحیا، علی صالح السعدی، حازم جواد، طالب شبیب، صالح مهدی عەماشو حردان تکریتی)[٢٦]. (الموصلي) پێی وایە کەسەردانی شاندەکە بۆ بەغدا پتر بۆ پێشکەشکردنی پیرۆزبایيو تاقیکردنەوەی نیازی بەرامبەرەکەیان بوو[٢٧]. لەگەڵ ئەوەشدا شاندەکە پرۆژەی ئۆتۆنۆمیان لەژێر ناوی نا ناوەندێتیدا بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد خستە بەردەستی بەرپرسانی حکومەتی عێراق، بەلاّم ئەمان پرۆژەکەیان پەسەند نەکردو داوایان لەشاندەکە کرد کە داخوازیەکانیان

---

[٢٤] بڕوانە: د. کاوس قفطان، س پ. ل ل٢١٩-٢٢٠. شازین هێرش، س پ، ل ل١٥١-١٥٢.

[٢٥] بڕوانە: د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل٢٣٠.

[٢٦] بڕوانە: شلومو نکدیمون، س پ، ل٨١. ابراهیم جەلال، س پ، ل٩٦. منذر الموصلي، س پ، ل ل١٣٥-١٣٦. مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٤. د. علی کریم سعید، س پ، ل٢٤٩.

[٢٧] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٣٥. (تالب شبیب) لەو بارەیەوە دەڵێت کۆبوونەوەکان شێوازی دانوستانی فەرمی بەخۆوە نەبینی. بڕوانە: د. علی کریم سعید، س پ، ل٢٤٩.

دوا بخەن، بەبیانووی ئەوەی کاری لەوە گرنگتریان بەدەستەوەیە کەئەوەش هەنگاونانە بۆ سەرخستنی پرۆژەی یەکێتی نەتەوەیی عەرەب کە بەیەکێتی سێ قۆڵی نێوان عێراقو میسرو سوریا دەست پێدەکات[٢٨]. (دیڤید ماکداول) لەم بارەیەوە دەڵێت“"..... بۆ خودی رژێم، لەکۆدا ئۆتۆنۆمی کورد، مەسەلەیەکی لاوەکی بوو: خەمە گەورەکەی رژێم- هەم ناسرییەکانو هەم بەعسییەکان- مەسەلەی یەکێتیی عەرەب بوو[٢٩].

لەکاتی ئەنجامدانی کۆبوونەوەکاندا، هەڵوێستی دژ بەیەکی هەندێك لە بەرپرسانی عێراقی جێگەی سەرنجە چونکە" هەر کەوتوویژەکان دەستیپێکرد عەلی سالح ئەلسەعدی پارتی دیموکراتی کوردستانی بەهاوکاریکردنی کۆمۆنیستەکان تاوانبار کردو رایگەیاند: ئێمە نوێنەرایەتی هەموو عەرەب ناکەین، هەروەها نوێنەرانی کورد کەئامادەن نوێنەرایەتی هەموو کورد ناکەن، هەر لەبەر خودی ئەمە پێویستە بانگەشە بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی میللی فراوان بکرێت بۆ هەڵبژاردنی کەسانی تر بۆ ئەندامێتی هەردوو شاندەکە. ئەم هەڵوێستە بەپچڕاندنی کردارەکی وتووێژەکان دانرا"[٣٠].

---

[٢٨] بڕوانە: ابراهیم جەلال، س پ، ل٩٦. بەڵام(طالب شبیب) لەو بارەیەوە دەڵێت لەراگەیاندنێکدا لەسەر سیستمی نا ناوەندێتی رێککەوتین، بەڵام مەترسیمان لەکاردانەوەی وڵاتانی دراوسێی عێراقو رای گشتی عەرەبیو بەعسیو نەتەوەییو عێراقی هەبوو...هتد. بڕوانە: د. علی کریم سعید، س پ، ل٢٤٩.

[٢٩] دیڤید ماکداول، مێژوی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٦٤٧.

[٣٠] منذر الموصلي، س پ، ل١٣٦-١٣٧. د. کاوس قفطان، س پ، ل٢٢٢. بۆ زانیاری پتر لەبارەی هەڵوێستی دژبەیەکی بەرپرسانی عێراقەوە لەمەڕ چۆنێتی تێڕوانینو

هەر لەو دانیشتنەدا (صالح مهدي عەماش) رایگەیاند کەبەعسو حکومەت نیازیان هەیە بەشێوەیەکی فەرمی دان بەمافە نەتەوەییەکانی کوردو مافی چارەی خۆنووسیندا بنێت، بەلاٚم (تالب شبیب) هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی کرد ئەگەر (بارزانی) لەگەڵیاندا رێکنەکەوێت[31].

(تاڵەبانی) و (فوئاد عارف) بەنوێنەرایەتیی پارتی لەگەڵ شاندی فەرمی حکومەتدا بەسەرۆکایەتی (السعدي) لە (٢٣/٢/١٩٦٣) دا سەردانی قاهیرەیان کرد، بەبۆنەی ساڵیادی دامەزراندنی کۆماری عەرەبی یەکگرتووەوەو هاوکات بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە بۆ وتووێژکردن لەگەڵ (عبدالناصر) دا لەبارەی یەکێتی سێ قۆڵی عەرەبەوە[32]. لەو سەردانەدا (تاڵەبانیو عارف) چاویان بەسەرۆکی

---

مامەڵەکردنیان لەگەڵ پارتیو داخوازیەکانی گەلی کورددا، بۆ نمونە بڕوانە: د. کاوس قفطان، ل ل٢٢٢-٢٢٣.

[31] بڕوانە: د. کاوس قفطان، س. پ، ل ل٢٢٢-٢٢٣.

[32] بڕوانە: د. علی کریم سعید، س پ، ل٢٥٠. لەبارەی ئەو سەردانەی (تاڵەبانی) یەوە (مسعود بارزانی) دەڵێت" حکومەتی عێراق هەردوو ناوبراوانی بۆ ئەو سەردانە قایل کرد، (تاڵەبانی) ش بەبێ راوەرگرتنو رەزامەندی (مصطفی بارزانی) ئەو کارەی ئەنجامدا. بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٤. (فؤاد عارف) ئەندامی شاندەکە راستی ئەم زانیاریە دووپات دەکاتەوەو دەڵێت" "بەڕێز جەلال تاڵەبانی لەشاندەکەدا نوێنەرایەتی بزووتنەوەی کوردی کرد. وە بۆ مێژوو باسی دەکەم کەتاڵەبانی زۆر رارا بوو لەقایلبوونی بە بەشداریکردن لەشاندەکەدا بەبێ وەرگرتنی رەزامەندیی پێشوەختی بارزانی، بەلاٚم من بەپێویستی بەشداریکردنی قایلم کرد، وەڕوونکردنەوەی ئەو کارەم بۆ بارزانی لەدوای گەڕانەوەمان خستە ئەستۆی خۆم. دواتر زانیم کەبارزانی لەسەرەتادا خۆشحاڵ نەبوو بە بەشداریکردنی تاڵەبانی لەشاندەکەدا، بەلاٚم پاش ئەوەی کارەکەم بۆ روونکردەوە رای گۆڕی". فؤاد عارف، س پ، ل٢٩٦. شلومو نکدیمون، س پ، ل٨٢. هەر لەبارەی ئەم

**میسری بەئامادەبوونی(علی صبری) سەرۆك وەزیران كەوتو داوایان لێكرد كەبەڵێن لەحكومەتی عێراقی وەربگرێت ئاشتی بەردەوام بێتو داخوازیەكانی كورد جێبەجێ بكات[٣٣]. (عبدالناصر) دژایەتیكردنی خۆی بۆ هەر چەشنە نیازو داخوازیەكی جوداخوازی پێڕاگەیاندنو**

---

سەردانەی(تاڵەبانی)ەوە، (دیڤید ماكداول) دەڵێت" "مەلا مستەفا كەخۆزگەی بەبارو پێگەی پارتیو سەرۆكی وەفدی نوێنەرایەتی- تاڵەبانی- دەخواست، بەئاشكرا رەخنەی لەسەفەری وەفدی كوردی بۆ قاهیرە دەگرتو پێگەی تاڵەبانیی، وەك(نوێنەری گەلی كورد ) سست كردبوو، چونكە سەركەوتنی تاڵەبانی وەك سەرۆك وەفد بەئاشكرا بەمانای لەرزینی بارو پێگەی شەخسیی ئەو بوو". دیڤید ماكداول، س پ، ل٦٥٠. بەپێی(ادمون غریب) بارزانی لە(٢٨/٢/١٩٦٣)دا رایگەیاند كەئەو نوێنەری خۆی بۆ دانوستان لەبەغداد ناردووە، نەك بۆ پایتەختە عەرەبیەكانی تر. بڕوانە: ادمون غریب، الحركة القومیة الكردیة، دار النهار للنشر، بیروت، ١٩٧٣، ص٦٩. بەبۆچوونی ئێمە لەكاتێكدا كەگەڕانەوەی هەر شاندێك بۆ وەرگرتنی رەزامەندیو رێنمایی نوێ لەبەر رۆشنایی پێشهاتەكان كارێكی گرنگە، بەڵام لەوە گرنگتر كاركردنی شاندەكەیە بەئاراستەی بەدیهێنانی ئامانجە بنچینەییەكانی چوونە ناو پرۆسەی دانوستانەكەوە، لەم ڕووەوە دەشێت سەردانەكەی(تاڵەبانی) بۆ قاهیرەو قۆستنەوەی هەلی بەشداربوون لەو بۆنەیەدا كە ئاكامەكانی بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەخۆ كاریگەری لەسەر گەلی كوردو مافەكانی بەجێدەهێشت، بەهەنگاوێكی باش لێكبدرێتەوە، هەروەها دەرفەتێكیش بوو بۆ بیروڕا گۆڕینەوە لەگەڵ سەرۆكی میسرو سەرۆكی جەزائیر لەبارەی پرسە سەرەكیەكانی نێوانیان، لەبەر ئەوە لەهەلومەرجێكی لەو چەشنەدا، وەرگرتنی راو رەزامەندی دەبێتە پرسێكی رواڵەتی، بەتایبەتی ئەگەر بڕوابوون لەنێوان سەركردایەتیو شاندەكەدا جێگیر بێت، ئەمە وێڕای ئەوەی كە ئەو سەردانە لەچوارچێوەی ئامانجە گشتیو ئایندەییەكانی شاندەكە دەرنەچووبوو.

[٣٣] بڕوانە: د. علی كریم سعید، س پ، ل٣٦٦.

پشتیوانیی خۆی بۆ مافەکانی گەلی کورد لەچوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدا دەربڕیو ئامۆژگاری هەردوو لایەنی کرد کە ڕێگەچارەی ئاشتیانە بگرنە بەر بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان[٣٤]

پاش دوو ڕۆژ لەو دیدارە(تاڵەبانی) چاوی بەسەرۆکی جەزائیری(احمد بن بيلله ) کەوت، بۆچوونەکانی ئەمیش لەچوارچێوە گشتیەکەی بۆچوونەکانی(عبدالناصر) دەرنەچوو[٣٥]. بەگوێرەی هەندێك لەسەرچاوەکان" کاری شاندەکە شتێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوە

---

[٣٤] لەبارەی ئەو دیدارەوە بڕوانە: جلال الطالباني، حول القضية الكردية في العراق، ب م، ١٩٨٨، ص٣١. د. سعد ناجي جواد، س پ، ل٨٣. شلومو نكديمون، س پ، ل٨٢. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل٨٤. منذر الموصلي، س پ، ل١٣٩. (طالب شبيب) کەئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە بوو ئاماژە بەزاراوەو چەمکی ئۆتۆنۆمی لەقسەکانی(عبدالناصر)دا ناکات، بۆ نمونە بڕوانە: د. علي كريم سعيد، س پ، ل ل٢٥٠-٢٥١. بەڵام(فؤاد عارف) کەلەگەڵ(عبدالناصر)دا کۆبوەوە، لەو بارەیەوە دەڵێت" ناوبراو پشتیوانی لەبیرۆکەی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد دەکرد، بڕوانە: فؤاد عارف، س پ، ل٢٧٢. بەڵام لەدەقی کۆنووسی کۆبوونەوەکەی نێوانیان زاراوەی ئۆتۆنۆمی نەهاتووە، بۆ دەقی کۆنووسەکە بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل٤٤٩-٥٠١. هەر لەم بارەیەوە نزیك لەڕاکەی(فؤاد عارف)ەوە(تاڵەبانی) دەڵێت" "زۆر باش لەیادمە کەچۆن سەرۆك جەمال عبدالناصر داوای لەشاندی بەعسی عێراق کرد لەساڵی ١٩٦٣دا کەبۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد کەڵك لەئەزموونی یەکێتی سۆڤێتو یوغسلافیا وەربگرن"، جلال الطالباني، حول القضية الكردية في العراق، ١٩٨٨، ص٣١. هەروەها هەڵوێستی(تاڵەبانی) لەمەڕ بیرۆکەی ناو یاداشتنامەکەی شاندی کوردی لەو سەردانەدا نێگەتیڤ بوو. بڕوانە: ھ س، ل٣٢.

[٣٥] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٣٩. فؤاد عارف، س پ، ل٢٧٢. شلومو نكديمون، س پ، ل٨٢.

کەشـــایانی باســـکردن بێـــت"[٣٦]، بەپێچـــەوانەی رای تـــرەوە کـــەپێی وایە"سەردانی ئەم شاندە بۆ قاهیرەو جەزائیر بۆ یەکەمین جارە کەگورِو تینێکی عەرەبیو نێودەوڵەتی بەدۆزی کورد بدات، بـەڵام ئـەم گـورِو تینە تەنها بەسۆزو بەبێ هـیچ رێوشـوێنو چارەسـەرێکی کردارەکـی مـایەوە"[٣٧]. بەبۆچـوونی ئێمـە بەشـداربوونی شـاندی کـوردیو ئـەو چالاکییانەی کەئەنجامیدا، وێرای بایەخەکەی لـەبواری پرِوپاگەنـدەی راگەیاندنداو پتر رونکردنەوەی خواسـتە نەتـەوەییو دیموکراسـیەکانی گەلی کورد بۆ رای گشتی نێوخۆییو عـەرەبی، دووپاتکردنـەوەی ئـەو راستیە بوو کەگەلی کوردو سەرکردایەتیەکەی فاکتەرێکی سـەرەکیە لەهاوکێشـەی نێوخـۆییو نێودەولـەتی عێراقـداو پەیوەندیـەکی ئۆرگانیکی لەنێوان سەرگرتنی هەر پرۆژەیەکی یەکگرتنی عـەرەبیو چارەسەرکردنی ئاشتیانەو دادپەروەرانەی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورددا هەیەو ناکرێت حکومەتەکانی عێراق ئـەو راسـتیە پشـتگوێ بخـەن، ئامۆژگاریەکەی هەردوو سەرۆکی میسرو جەزائیر بۆ بەعسیەکان لەو بارەیەوە گوزارشت لەتێگەیشتنیان لەو راستیە دەکات.

لـە(١/٣/١٩٦٣)دا حکومـەت لـەژێر گوشـاری هەرِەشـەی سەرکردایەتی کورددا بە هەڵگیرساندنەوەی شەرِ، راگەیاندنێکی بـڵاو کردەوە کەتێیـدا هـاتبو" "وەکـو دانپێـدانانێك بـە پەیوەندییـەکانی برایەتیو هاورِێتی نێوان عەرەبو کوردەکان، ئەوا شۆرِشـی رەمـەزان سـورە لەسـەر نەهێشـتنی هـەموو پاشماوەکـانی حکومـەتی قـاسمی گۆرِبەگۆرِ بە بەلێندانی بەدابینکردنی مافەکانی کوردەکان"[٣٨]. دیارە

---

[٣٦] مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٤.

[٣٧] منذر الموصلي، س پ، ل١٣٩.

[٣٨] د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل٢٣٠. شلومو نکدیمون، س پ، ل٨٣.

هەڵوێستی سەرکردایەتی کوردی بەرامبەر بەناوەڕۆکی ڕاگەیاندنەکە توند بوو. چونکە هیچ ئاماژەیەك بۆ تایبەتمەندی گەلی کوردو ناسنامەی نەتەوەییو داخوازییە ڕامیاریەکانی ناکات[39]، لەبەرامبەردا (بارزانی) داوای جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کردو مۆڵەتی سێ ڕۆژی بۆ حکومەت دیاری کرد کە داخوازیەکانیان بسەلمێنێت، ئەگینا شەڕ هەڵدەگیرسێنێتەوە[40].

لە(٢/٣/١٩٦٣)دا یەکەمین شاندی فەرمی حکومەت بەسەرۆکایەتی(طاهر یحیی)و یاوەریی(بابەعەلی شێخ محمودو فؤاد عارفو علی حیدر سلێمانو عمید فتاح شاڵی) گەیشتنە گوندی کانی مارانی سەر بەناحیەی چوارقوڕنەو لەگەڵ نوێنەرانی پارتیدا بەسەرۆکایەتی (بارزانی)، کۆبونەوەیان ئەنجامدا[41]. (علی حیدر سلیمان) ڕەشنووسی پرۆژەکەی حکومەتی بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد خوێندەوە، بەڵام(بارزانی) پێی قایل نەبوو، گوتی" "پرۆژەی خۆمان هەیە، ئێمە هەر لەبنچینەوە داوای ئۆتۆنۆمیمان کردبوو"[42]. هەروەها لەدرێژەی ڕوونکردنەوەکانیدا، بەسەرۆکی شاندی حکومەتی ڕاگەیاند کەپێویستە ئۆتۆنۆمی ڕابگەیەنن وەکو مەرجێکی

---

[39] بڕوانە: د. سعد ناجی جواد، س پ، ل٩٠

[40] بڕوانە: د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل٢٣١. شلومو نکدیمون، س پ، ل ل٨٢-٨٣.

[41] بڕوانە فؤاد عارف، س پ، ل٢٦٤. ابراهیم جەلال، س پ، ل٩٦. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل٨٤. شایانی ئاماژە پێدانە کە لەسەرچاوەی یەکەمدا ناوی عەمید(فتاح شاڵی) نەهاتووە، کەچی لەدووەمدا ناوی باڵیۆز(علي حيدر سليمان) نەهاتووە. هەروەها(الموصلي)(فؤاد عارف)ی وەکو سەرۆکی شاند ناو بردووە، بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٤٣.

[42] فؤاد عارف، س پ، ل٢٦٤.

پێشەکیمان بۆ راگرتنی شەڕ[43]، دواتر داواکاریەکانی گەلی کوردی پێشکەش بەسەرۆکی شاندەکە کرد کە لەدوو بەش پێکهاتبوون" داواکاریە هەنووکەییەکانی قۆناغی یەکەمی گفتوگۆکە، بۆ دڵنیاییکردنی کوردو دەرخستنی نیازپاکی حکومەتو داخوازیەکانی قۆناغی دووەم کەخۆی لەپرۆژەی ناناوەندێتی(ئۆتۆنۆمی)دا دەنواند[44].

ناوەڕۆکی پرۆژەکە لەهەشت خاڵ پێکهاتبوو، دەکرێت بەم شێوەیە پوختی بکەینەوە:

١)دانپێدانانی دەستبەجێی حکومەت بەئۆتۆنۆمی بۆ کوردو ناردنی وێنەیەکی لەگەڵ دەستووری نوێی عێراقدا بۆ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٢)دەستنیشانکردنی سنووری باشووری کوردستان.

٣)دابینکردنی مافە زمانەوانیو کەلتوریەکانی گەلی کورد.

٤)دامەزراندنی دامو دەزگای فەرمانڕانی تایبەت بەباشووری کوردستانو نوێنەرایەتیکردنی کورد لەدامودەزگاکانی حکومەتی ناوەندیدا بەرێژەی دانیشتوانەکەی.

٥)رەچاوکردنی تایبەتمەندیی باری سەربازیی کورد لەناو سوپای عێراقدا.

---

43 بڕوانە: د. سعد ناجي جواد، س پ، ل ل٩٠-٩١.

44 بۆ ناوەڕۆکی ئەو داخوازیانە بڕوانە: دیڤید ماکداول، س پ، ل٦٤٨. د. عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، س پ، ل ل٢٢٢-٢٢٣. ابراهیم جەلال، س پ، ل ل ٩٦-٩٧. لەڕاستیدا لەپرۆژەکەدا زاراوەی(ئۆتۆنۆمی) هاتووە، نەك(ناناوەندێتی)، لەم بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٤. منذر الموصلي، س پ، ل١٤٣. د. عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، س پ، ل ل٢٢٢-٢٢٣. فؤاد عارف، س پ، ل٢٦٥. شلومو نكديمون، س پ، ل ل٨٣-٨٤.

٦)دامەزراندنی دامودەزگای سەربازیی کوردی لەکوردستاندا، هاوشێوەی ئەوەی لەعێراقدا هەیە.
٧)دەستنیشانکردنی پشکی کوردستان لەداهاتی نەوتی عێراقدا بەڕێژەیەکی دیاریکراو.
٨)پێکهێنانی حکومەتێکی خۆیی بۆ ئەوەی ڕێککەوتنی تایبەت بەمافەکانی گەلی کورد مۆر بکات.

لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی داخوازیەکاندا کە لەپرۆژەکەدا گەڵاڵە کرابوو، چەند راستیەك روون دەبێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:
١)پرۆژەی پارتی بۆ دانوستان لەگەڵ حکومەتدا بریتی بوو لەداخوازی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.
٢)لەپرۆژەکەدا رەچاوی بایەخی گرەنتی نێودەوڵەتی بۆ هەڵوێستی حکومەت لەمەڕ ئۆتۆنۆمی کوردستان کراوە.
٣)لەپرۆژەکەدا سنووری جوگرافی-رامیاری ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەجۆرێك دەستنیشان کراوە کە لەگەڵ خواستەکانی گەلی کوردو راستیە مێژوویی- جوگرافیی-نەتەوەییەکانی ناوچەکەدا هاوجووتە.
٤)داخوازیەکانی پارتی لەمەڕ مافە زمانەوانیو کەلتوریەکان، وێڕای ئەوەی کە لەمافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤە، مافێکی پێشتر سەلمێنراوە لەیاساو بەڵگەنامە فەرمیەکانی عێراقی سەردەمی پاشایەتیدا.
٥)داخوازیەکانی تایبەت بەدامەزراندنی دامودەزگای فەرمانڕانی ناوچە ئۆتۆنۆمیەکەو بەشداربوونی کورد لەدامودەزگاکانی حکومەتی ناوەندیدا، چەشنە داخوازیەکن کەلەسایەی ئەو جۆرە فۆرمەدا لەشوێنی خۆیدایە، چونکە چەمکی ئۆتۆنۆمی ئەوانە لەخۆ دەگرێت.

٦)داخوازیەکانی تایبەت بەپێکهاتەو پێگەی سەربازی کورد لەعێراقدا، گوزارشت لەبایەخی دامەزراندنی هێزێکی چەکداری تایبەت بەکوردستان لەلایەكو کزیی بڕوای سەرکردایەتیی کوردی بەنیازو سیاسەتەکانی حکومەتی عێراق بەرامبەر بەکورد لەلایەکی ترەوە دەکات.

٧)داخوازیە ئابووریەکان لەو راستیەوە سەرچاوەیان گرتووە کە کوردستان خاوەن سامانێکی سروشتی زۆرو هەمەچەشنەو مافی یاسایی گەلی کوردستانە کەلێی بەهرەمەند بێ، ئەمە وێڕای ئەوەی کەپرەنسیپی دادپەروەری وا دەخوازێت رێژە زۆرەکەی بۆ گەشەپێدانی کوردستانو قەرەبووکردنەوەی دانیشتوانەکەی بێت لەبری ئەو زیانە لەڕادە بەدەرەی کە لەئاکامی سیاسەتە کاولکاریەکانی حکومەتەکانی پێشووتری عێراقەوە لێیان کەوتووە.

٨)سەبارەت بەداخوازی پێکهێنانی حکومەتێکی خۆیی تاوەکو رێککەوتن لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا مۆر بکات، لەڕاستیدا فۆرمی ئۆتۆنۆمی لەڕێگەی رێسا دەستووریەکانو دواتر بەیاسایەکی تایبەت کە لەلایەن حکومەتی ناوەندیەوە دەردەچێت رێکدەخرێتو دامودەزگاکانی ناوچە ئۆتۆنۆمیەکە لەبەر رۆشناییدا دادەمەزرێن. لەوانەیە مەبەستی سەرکردایەتی کوردی لەو رووەوە بەدیهێنانی دوو ئامانج بێت، یەکەمیان دامەزراندنی حکومەتی خۆیی کوردستان هەرچی زووترەو، دووەمیان پێدانی فۆرمو مۆرکێکی فەرمیە بەرێکەوتنی نێوانیان لەباری ئەنجامدانیدا.

هەر لەدانیشتنەکەی نێوانیاندا، (صالح مهدی عماش) رایگەیاند کەئەوان لەترسی(جمال عبدالناصر) ناتوانن ئەو داخوازیانە پەسەند بکەن، بەڵام(تاڵەبانی) وەڵامی دایەوە بەوەی لەکاتی دیداریان لەگەڵ(عبدالناصر)دا، ناوبراو رەزامەندی خۆی لەسەر بیرۆکەی

ئۆتۆنـۆمی یـان هـەر چەشـنە فـۆرمێکی تـر کەهـەردوو لایـەنی پەیوەندیدار لەسەری رێککەون دەربڕی، کەچـی(عـەماش‌و السـعدي) رایانگەیاند کە(عبدالناصر) شتێکی بەئێوە گوتـووەو شـتێکی تـری بەئێمە گوتووە[٤٥]. بەڵام راگەیاندنەکەی وەزیری دەرەوەی عێراق(طالـب حسين شبيب) لە(٦/٣/١٩٦٣)دا لـەبارەی داخوازیـەکانی کـوردەوە تیشکێك دەخاتە سەر ئەو بوارە، کاتێـك گـوتی: "ئـەو داخوازیانـەی بارزانی بەلای ئێمەوە پەلپ‌و بیانووگرتنە بۆ رێگـەگرتن لەئاشـتی‌و، جێگەی شك‌و گومانیشـە لـەبارزانی‌و پـارتی کەنایانـەوێ یـەکێتی عێراق‌و نەتەوەی عەرەب بپارێزن، بەتایبەتی لەم کاتەدا کەپێویسـتە چاو لەداخوازیەکانیان بپۆشن‌و پشـتگیری لەشۆڕشـی ١٤ی رەمـەزان بکەن. ئەگەر بارزانی‌و پارتی هـەر سـوربوون لەسـەر ئـەو داخوازیـە بیانووگرانەیە، ئێمە ناچار دەبـین کەبەتوونـدی دژیـان بوەسـتین، بـۆ توانـاو دەسـەڵات‌و هێـزی سـوپای عێـراقیش زۆر ئاسـانە تێکشکاندنیان"[٤٦].

لـەپاش ئـەم راگەیاندنـە، شـاندی حکومـەت یاداشـتنامەکەی سـەرکردایەتیی کوردیـان خسـتە بەردەسـت(ئەنجومـەنی نیشـتمانی سـەرکردایەتی شـۆڕش)، ئەنجومەنەکـەش پـاش تـاوتوێکردنی هەڵوێسـتی نێگـەتیڤی نوانـد، چـونکە هـەر لەبنەڕەتـەوە بـڕوای بەناوەرۆکەکـەی نـەبوو[٤٧]، هـیچ بۆچـوون یـان بڕیـارێکی لـەبارەوە دەرنـەبڕی‌و وتووێـژەکانیش هـیچ پێشـنیازێکی یەکلایکـەرەوەی

[45] بڕوانە: شلومو نكديمون، س پ، ل٨٤.
[46] بڕوانە: ابراهيم جەلال. س پ، ل٩٧.
[47] فؤاد عارف. س پ، ل٢٦٥.

لێنەکەوتەوە[48]. دواتریش حکومەت بەمەبەستی گوشار خستنە سەر سەرکردایەتی کوردو ناچارکردنی بۆ گۆڕینی هەڵوێستەکانی، شاندێکی میللی ڕەوانەی لایان کردو لەگوندی کانی مارانی سەر بەناحیەی چوارقوڕنە چاویان بە(بارزانی) کەوتو[49]، داوایان لێکرد کەواز لەدرووشمی ئۆتۆنۆمی بهێنێت، ئەویش قایل بوو، چونکە بەلایەوە ناوەڕۆکی داخوازیەکە گرنگ بوو نەك زاراوەو چەمکەکەی[50]. وە لەئەنجامی زنجیرە کۆبوونەوەکانی نێوانیان لە(٧-٨/٣/١٩٦٣)دا گەیشتنە پرۆژە ڕێککەوتنێکی بەراییو ڕێگە خۆشکەر، هەردوولایەن تاووتوێی بکەنو دواتر بخرێتە بەردەم حکومەت، ئەوەش چەند ڕاسپاردەیەکی لەخۆ گرتبوو، گرنگترینیان[51]:

١)دانپێدانان بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەسەر بنچینەی خۆ بەڕێوەبردنو چەسپاندنی لەدەستوری عێراقدا.

٢)ڕاگەیاندنی لێبوردنی گشتیو هەڵگرتنی ئابلۆقەی ئابووری لەسەر ناوچەکەو ئەنجامدانی پاکسازی لەدامودەزگاکانی حکومەت لەو کەسانەی خراپەیان لەگەڵ کورددا کردووەو گێڕانەوەیماڵو موڵکی دەستبەسەرداگیراوی کورد.

---

[48] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٤٣.

[49] شاندەکە پێکهاتبوو لە: محمد رضا الشبيبي، فائق سامرائي، حسين جميل، فيصل حبيب الخيزران، د. عبدالعزيز الدوري، زيد احمد عثمان. بڕوانە: فؤاد عارف، س پ، ل٢٦٦. مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٤.

[50] بڕوانە: شلومو نكديمون، س پ، ل٨٤. ديڤيد ماكداول، س پ، ل٦٤٩.

[51] بڕوانە: فؤاد عارف، س پ، ل ل٢٦٦-٢٦٧. منذر الموصلي، س پ، ل ل١٤٣-١٤٤. شلومو نكديمون، س پ، ل٨٤.

**٣)کشانەوەی سوپای عێراق لەکوردستان وەکو بەڵگەی نیاز پاکیی حکومەت بۆ ڕێککەوتن.**

**شایانی ئاماژە پێدانە چەمکی خۆ بەڕێوەبردن کەسەرکردایەتی کوردی وەکو پرنسیپ پەسەندی کرد، تەواو جیاوازە لەو چەمكو فۆرمی ئۆتۆنۆمیەی لەپرۆژەکەی پارتیدا هاتبوو کە لە(٥/٣/١٩٦٣)دا پێشکەش بەشاندی حکومەتی کردبوو چونکە پرۆژەکە لەرووی دارشتنو زمانو ناوەڕۆکی یاسایی داخوازیەکانەوە نەك هەر لەگەڵ چەمكو فۆرمی ئۆتۆنۆمیدا یەکانگیرە، بەڵکو لەهەندێك لەخاڵەکانیدا لەوەشی تێپەڕاندووە[٥٢]. لەڕاستیدا بەگوێرەی هەلومەرجی ئەو سەردەمەی کوردستانو عێراق، لایەنی کوردی پرۆژەیەکی باشی گەڵاڵە کردبوو وەکو بنچینەیەك بۆ دانوستان، بەلام بەکردەوە لەسەر چەمکی خۆ بەڕێوەبردن وەکو سەرەتایەك قایل بوو، بەبۆچوونی ئێمە ئەم هەنگاوە پاشەکشەیەکی بەرچاو بوو لەپرۆژەکەیان هەرچەندە بەبۆچوونی هەندێك لەکەسانی ئاگادار لەو بارەیەوە هەر خۆبەڕێوەبردنەکەیان بەئۆتۆنۆمی لێکداوەتەوە، لەوانە(فؤاد عارف) کەدەڵێت: "لەدیدی منەوەو لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئۆتۆنۆمییە"[٥٣].**

**لەم پرۆسەیەدا، پێش ئەوەی شاندەکەی حکومەت بگەڕێتەوە. (بارزانی) ماوەیەکی سنوورداری بۆ حکومەت دیاریکرد تا وەلامی داخوازیەکان بداتەوە، ئەگینا لەدژی حکومەت دەجەنگێتەوە[٥٤].**

---

[52] بۆ دەقی پرۆژەکە بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل٨٥.

[53] فوئاد عارف، س پ، ل٢٦٧.

[٥٤] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل٨٤. عبدالكريم فرحان، س پ، ل١٥٧. د. عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، س پ، ل٢٣١. دیڤید ماکداول، س پ، ل٦٤٨.

هەرچەندە رەوتی رووداوەکانو درێژەکێشانی هەوڵە دیپلۆماسیەکانی نێوانیان بوارو پاساوی جێبەجێکردنی ئەو هەڕەشەیەی لەو کاتەدا نەدا، لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهێنانی هەڕەشەی پەنابردنە بەر رێوشوێنە نادیپلۆماسیەکان لەسەرو بەندی پرۆسەی دانوستاندا بایەخی خۆی هەیە، ئەگەر زەمینەکەی لەبار بێت.

حکومەت لەراگەیاندنێکدا لە(١٩٦٣/٣/٩)دا یەك لایەنە دانی بەمافەکانی گەلی کورد لەچوارچێوەی پرۆژەی ناناوەندێتیدا بەناوی یاسای پارێزگاکانی بلاوکردەوە[٥٥]. ئەو پرۆژەیە جگە لەباسکردنی نیوەچڵی چەند مافێکی کارگێڕیو زمانەوانی، لانی کەمی داخوازیەکانی گەلی کوردی تێدا رەچاو نەکرابوو. بەئەندازەیەك کەتەنانەت چەمکی ناناوەندێتیەکەشی لەناوەڕۆکەکەی پوچەڵ کردەوە[٥٦] لەڕاستیدا پرۆژەکە نەك هەر ئۆتۆنۆمی نیە، بەڵکو لانی کەمی بنەماو خەسڵەتەکانی ناناوەندێتی کارگێڕی، یان خۆبەڕێوەبردن، یان چڕکردنەوەی کارگێڕی، تێدا نییە. بەگوێرەی پرۆژەی(ناناوەندێتیەکە):

-سنووری پەیڕەوکردنی هەموو ناوچەکانی باشووری کوردستان ناگرێتەوە.

-بەڕێوەبەرانی یەکە کارگێڕیەکانی ناوچەکە بەگشتی بەدانان دەبێت، نەك بەهەڵبژاردن لەلایەن کوردەوە.

---

[٥٥] بڕوانە: عبدالکریم فرحان، س پ، ل١٥٧. لەبارەی خاڵەکانی ئەو پرۆژەیەوە بۆ نمونە بڕوانە: ابراهیم جەلال. س پ، ل ل٩٧-٩٨. شلومو نکدیمون، س پ، ل ل٨٤-٨٥.

[٥٦] بڕوانە: شلومو نکدیمون، س پ، ل٨٥.

-قەبارەی بەشداریکردنی کورد لەدەسەلاتی جێبەجێکردندا تەنها بەدوو شالیار دەبێت.
-دەرکردنی بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ زیندانیە کوردەکان بەهۆی رووداوەکانی کوردستانەوە. کەتێکڕا پرسی رامیاریەو لەچوارچێوەی مافە رامیاریەکانی هاوولاتیاندایەو، خۆی بەڵگەیە لەسەر نارەوایی بڕیاری گرتنەکەیان لەبنچینەدا، کەچی حکومەت ئەم بڕیارەی وەکو جیاوکێك پێشکەش بەکورد کرد، لەکاتێکدا پێویست بوو حکومەت دواتر کار بۆ قەرەبووکردنەوەیان لەڕووی ماددیو مەعنەوییەوە بکات لەبەرامبەر بەندکردنەکەیاندا.
-لەبارەی بژاردنەوەی زیانەکانی ناوچە کوردیەکان کە لەئاکامی سیاسەتەکانی حکومەتی(قاسم)دا کەوتۆتەوە، ئەوا پرسی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی هەر خاڵێکی لەم چەشنە لەمافە ئاساییەکانی هاوولاتیانو ئەرکە بنچینەییەکانی حکومەت لەدەوڵەتی یاساییدا. بەم شێوەیە حکومەت دۆزی گەلی کوردو داخوازیەکانی لەچەند خاڵێکی لاوەکیدا چڕ کردەوە بەرادەیەك کە چاوەڕوانی ئەوەی لێنەدەکرا لایەنی کوردی پێی قایل بن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەنگاوەی حکومەت مشتومڕی پتری لەنێوان لایەنگرانی کۆتاییهێنانی گفتوگۆکانو لایەنگرانی درێژەپێدانی لەنێو ریزەکانی سەرکردایەتی پارتیدا نایەوەو هەر گروپەیان پاساوی خۆی لەو بارەیەوە دەخستە روو[٥٧]. بەبۆچوونی ئێمە لێکدانەوەی پاساوەکانی هەردووکیانو رووداوەکانی دواتر، دروستیی

[٥٧] بۆ وردەکاری پتر لەبارەی پاساوەکانی هەردوو لایەنەکەوە، بۆ نمونە، بڕوانە: ابراهیم جەلال، س پ، ل ل٩٨-٩٩.

بۆچوونەکانی ئەو گروپەی سەلماند کە لەگەڵ کۆتاییهێنانی گفتوگۆکانو دەستپێکردنەوەی شەڕ لەدژی حکومەتدا بوو.

حکومەت چەند هەنگاوێکی بەئاراستەی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە نا، لەچەشنی هەڵگرتنی ئابلۆقەی ئابووریو دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی گشتیو دەرکردنی بەیاننامەیەك لە(١٩٦٣/٣/١١)[٥٨]. لەخوێندنەوەی ناوەڕۆکی بەیاننامەکەدا دەردەکەوێت کەجەخت لەسەر چەند تەوەرەیەك کراوەتەوە، پوختەی گرنگترینیان ئەمانەن[٥٩]:

١)ئاماژەکردن بەهەڵوێستی دەستوری کاتی عێراق ساڵی ١٩٥٨ لەمەڕ پەیوەندی نێوان هەردوو گەلی عەرەبو کورد.

٢)دانپێدانان بەو راستیەی کەسیاسەتی زەبروزەنگو تۆقاندنی سەردەمی حکومەتی(قاسم) هەردوو گەلی کوردو عەرەبی گرتەوە، ئەگەر بەجۆرو ئەندازەی جیاوازیش بێت.

٣)حکومەتی بەعس جەخت لەسەر پرنسیپەکانی ئازادیو دادپەروەری دەکاتەوە.

٤)بەعس هاوکاریکردنی نێوان عەرەبو کوردو نەتەوەکانی تر بەبناغەی یەکێتی عێراق دەناسێنێت.

٥)ئاماژەکردن بەهەڵوێستی یەکەمین بەیاننامەی بەعسیەکان لەگەلی کوردو مافەکانی.

٦)دانپێدانانی دەسەڵاتدارانی نوێی عێراق بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەسەر بنچینەی نا ناوەندێتی و تۆمارکردنی ئەم پرنسیپە لەدەستوری کاتیو هەمیشەییدا هەرکاتێك دابنرێن،

---

[٥٨] بڕوانە: د. کاوس قفطان، س پ، ل٢١٦. منذر الموصلي، س پ، ل١٤٤.

[٥٩] بۆ دەقی بەیاننامەکە، بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل٨٥-٨٦.

بەعس ئەو هەڵوێستەی بۆ دوو هۆ گێڕایەوە: یەکەمیان بۆ ئەو پرنسیپانەی کەدان بەمافی گەلاندا دەنێت بۆ دیاریکردنی چارەنووس‌و پاشەڕۆژی خۆیان!، دووەمیان بۆ هەڵسەنگاندنێکی بابەتیانەی ئەو بارودۆخەی کە لەعێراقدا لەئارادا بوو[60]. لەڕاستیدا تەنها ئەم پاساوەی دووەمیان دروستە، چونکە لەلایەك چەمکی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان زۆر فراوانترە لەپرۆژەو چارەسەرە نیوەچڵیەکانی حکومەت بۆ مافەکانی کورد، لەلایەکی ترەوە بارودۆخی ئەو سەردەمەی حکومەت وای دەخواست کە لەرێگەی وتووێژەوە کات بەدەستبهێنێت‌و خۆی رێکبخاتەوەو بەرەی کوردستان بۆ ماوەیەك ئارام رابگرێت.

٧)پێکهێنانی لیژنەی پسپۆڕ لەئایندەدا بۆ دانانی بنەماو هێڵە گشتیەکانی ئەو نا ناوەندێتیە.

هەرچەندە بەگوێرەی هەندێك هەڵسەنگاندن"بەیاننامەکە شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو هیچ کام لەئامانجەکانی شۆڕش بهێنێتە دی. وە بێنەو بەردەی نێوان حکومەت‌و سەرکردایەتی شۆڕش هیچ ئاکامێکی لێنەکەوتەوە"[61]، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەیاننامەیە شایانی بەراوردکردنە لەگەڵ چەند پرۆژەیەکی تردا، بۆ نمونە، پرۆژەکەی پارتی بۆ دانوستان بریتی بوو لەئۆتۆنۆمی، بەڵام لەو رێککەوتنە بەراییەی کە لەئەنجامی گفتوگۆکانی(٧و٨/٣/١٩٦٣)دا هاتە کایەوە، لەسەر(خۆبەڕێوەبردن) پێکهاتن، کەئەو بەیاننامەیەی حکومەت لە(١١/٣/١٩٦٣)دا دەریکرد، جەختی لەسەر بنەمای(ناناوەندێتی) کردەوە. کەواتە هەر هیچ نەبێت لەڕووی تیۆری‌و رواڵەتیەوە، ناوەڕۆکی

[60] بڕوانە: د. کاوس قفطان، س پ، ل٢١٦.
[61] مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٦.

بەیاننامەکە پێشکەوتووترە لەناوەڕۆکی خاڵەکانی ڕێککەوتنە بەراییەکەی پاش گفتوگۆکانی(٧و٨/٣/١٩٦٣). ئەوەندەی پەیوەندی بەشێوازی پێشنیازکراوەوە هەبێت بۆ جێبەجێکردنی داخوازیەکانی گەلی کورد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت ناوەڕۆکی بەیاننامەکەش زۆر جیاوازە لە پرۆژەی ئەو ئۆتۆنۆمیەی کەلایەنی کوردی لە(٥/٣/١٩٦٣)دا پێشکەش بەحکومەتی کردبوو.

لەسەر ئاستی نێوخۆیی کورد، هەڵوێستی سەرکردایەتی پارتی یەکگرتوو نەبوو، بەلای هەندێکیانەوە بەیاننامەکە وەك دەستپێك بۆ گفتوگۆکردن شیاوە. هەندێکی تریان پێیان وابوو کەشتێکی ئەوتۆی تێدا نیە پتر بێت لەوانەی حکومەتەکانی پێشووی عێراق دەریانبڕیبوو، لەبەر ئەوە بڕیاریاندا لەسەر بەستنی کۆنگرەیەکی فراوان بۆ تاووتوێکردنی بارودۆخەکەو گەیشتن بەبڕیارێکی بەکۆمەڵ کەڕای گشتی کوردستان بنوێنێت[٦٢].

کۆنگرەکە لە(١٨-٢٢/٣/١٩٦٣)دا بەسترا، کۆمیتەیەکی سیو پێنج ئەندامی دەستنیشانکرا بۆ داڕشتنی پێشنیازەکان، کەدواتر پەسەند کرانو[٦٣]، لەکۆتاییدا یاداشتنامەیەك بۆ حکومەت ئامادە

---

[٦٢] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٤٤. شایانی ئاماژە پێدانە کەژمارەیەك لەکەسایەتیە تورکمانیو عەرەبیەکان بەشداریان لەکۆنگرەکەدا کردو بۆچوونیان لەگەڵ چەمکی ناناوەندێتی کارگێڕی بوو بۆ هەموو عێراق بەو فۆرمەی کەحکومەت خستبوویە روو. بڕوانە: د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل٢٣١-٢٣٥.

[٦٣] بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل١٤٤. عبدالکریم فرحان، س پ، ل١٥٨. شایانی ئاماژە پێدانە کەلیژنەی ناوچەی سلێمانی لە(٢٣/٣/١٩٦٣)دا پرۆژەیەکی لەژێر ناونیشانی(پرۆژەی هێڵە گشتیەکانی ناناوەندێتی لەکوردستاندا) ئامادە کرد

کـرا کـەبڕیارەکانی کـۆنگرەی لـەخۆ گرتبـوو، هـەروەها شـاندێك بەسەرۆکایەتی(تاڵەبانی)هەڵبژێردراو گەیاندنی پرۆژەی پەسەندکراوی کۆنگرەی پێسپێردرا[٦٤].

شاندەکە لە(١٩٦٣/٣/٣٠)دا گەیشتە بەغـدادو لەبەرامبـەردا حکومـەتیش ئەنـدامانی شـاندی خـۆی دەستنیشـان کردبـوو[٦٥]. لەچوارچێوەی ئامادەکاریەکانیدا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەتـدا، شاندە کوردیەکە لە(١٩٦٣/٣/٣١)دا یەکەمین کۆبوونـەوەی خـۆی لەماڵی(رشید عارف) ئەنجام داو تێیدا بڕیار لەسەر چەند هەنگاوێك درا، گرنگترینیـان پێداچـوونەوەو دەستنیشـانکردنو پـۆلێنکردنی ئەنـدامانی شـاندی دانوسـتانکارو دەسـتەی راوێـژکارو دەسـتەی رازگرێتـیو رێگـەدان بەڕاگەیانـدنی نـاوی ئەنـدامانی شـاندەکەو ئەنجامـدانی کۆبوونـەوە لـەپاش هـەر دانیشـتنێکی دانوسـتانەکە، بەمەبەستی تاووتوێکردنی دانیشتنەکەو گەلاڵـەکردنی بۆچـوونێکی

---

کەناوەرۆکەکەی گوزارشت لەچەمکی ئۆتۆنۆمی دەکات. بۆ دەقی پرۆژەکە بڕوانە: د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل ل٢٣٢-٢٣٣.

[٦٤] بڕوانە: مسعود البـارزاني، ب٣، س پ، ل٨٧. عبدالکریم فرحان، س پ، ل١٥٨. شلومو نکدیمون، س پ. ل٨٥. ئەندامانی شاندەکە بریتی بوون لە: (جلال طالباني، صالح یوسفي، حبیب محمد کریم، شاخەوان نامق، عبدالحسین فیلی، صمد محمد، بابکر پشدەری، عەگید صدیق، شێخ حسین خانەقا، مسعود محمد، مصطفی عزیز). بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ. ل٤٨٨، پاشکۆی ژمارە(١٢-ب)ی سەرچاوەکە.

[٦٥] نوێنەرانی حکومەت بۆ دانوستانەکە بریتی بوون لە: صالح مهدی عماش(وەزیـری بەرگری)، حازم جواد(بریکاری وەزارەتی ناوخۆ)، ناجی طالب، علي حیـدر سـلیمان، بابەعلی شێخ محمودی حفید، لەگەڵ ئەندامانی شاندە میللیەکـەی پێشـوو. بڕوانـە: فـؤاد عـارف، س پ، ل٢٦٨. مسـعود البـارزاني، ب٣، س پ، ل٨٧. عبـدالکریم فرحان، س پ، ل١٥٨.

یەکگرتوو لەبارەیەوەو ڕێکخستنی پرسی لێدوان بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندنو کاتی بەستنی دووەمین کۆبوونەوە[٦٦].

لەمیانی گفتوگۆکاندا بیرو بۆچوونی هەردوو لایەنەکە لەچەند خاڵێکدا یەکیدەگرتەوە، بەڵام خاڵی ناکۆکی سەرەکی نێوانیان بریتی بوو لە دەستنیشانکردنی سنووری ئەو ناوچەیەی کەیاسای کارگێڕی ناناوەندی دەیگرێتەوە[٦٧]. حکومەت سور بوو لەسەر ئەوەی شارەکانی کەرکوكو خانەقینو شەنگارو زمار لەنێو ئەو سنوورەدا نەبێت، بەجۆرێك کەگفتوگۆکان دەگەیشتنە سەر ئەو تەوەرەیە، خۆیان لەباسکردنو وەڵامدانەوەی دەدزیەوەو ئامادەی دانیشتنەکان نەدەبوون[٦٨]، یان داوای ئەوەیان دەکرد کەپێویستە لەسەرەتادا (بارزانی) بەڵێنی خۆی لەمەڕ گەڕانەوەی ئەو چەكو تەقەمەنیانەی کە لەشەڕەکاندا دەستی بەسەردا گرتووە جێبەجێ بکات[٦٩]. دیارە ئامانجەکانی حکومەت لەدانانی ئەو مەرجە بریتی

---

[٦٦] بۆ دەقی کۆنووسی کۆبوونەوەکە بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل٤٨٩، پاشکۆی ژمارە (١٣)ی سەرچاوەکە.

شایانی ئاماژە پێدانە کەئەندامانی شاندەکە بەم شێوەیە پۆلێن کران:

(جەلال تالەبانی) سەرۆکی شاندەکە، ئەندامێتی: مسعود محمد، مصطفی عزیز، محمد سعید خفاف، صالح یوسفی، رشید عارف، عەگید صدیق، ئەندامانی یەدەك هەریەك لە: هاشم حسن عقراویو حبیب محمد کریم، وەپێکهێنانی دەستەی راوێژکاری لەئەندامانی تر، دەستەی رازگرەکان لە: حبیب محمد کریم، شاخەوان نامق، صمد محمد، شوکت عقراوی. بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٤٨٩، پاشکۆی ژمارە (١٣)ی سەرچاوەکە.

[٦٧] بڕوانە: فؤاد عارف، س پ، ل٢٦٨.

[٦٨] بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٨٧.

[٦٩] بڕوانە: هـ س، ل٨٧.

بوو لەداماڵینی بزووتنەوەی کورد لەتوانا سەربازیەکانی لەبارێکدا ئەگەر کورد ئەو مەرجە جێبەجێ بکات، یان تۆمەتبارکردنیان بەوەی کورد دژی رێککەوتنی ئاشتیانەیەو بەوەش رەوایی بەسیاسەتەکانی سەرکوتکردنیان بدات.

لە(١/٤/١٩٦٣)دا شاندی کورد یەکەمین کۆبوونەوەی لەگەڵ شاندێکی میللی کەحکومەت رایسپاردبوون ئەنجامداو پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کەسیفەتی(نێردراوانی حکومەت) تەنیا نێوانگیریەو رێگەیان پێنەدراوە بەناوی حکومەتەوە وتووێژبکەن[٧٠]، لەبەر ئەوە پێیان لەسەر ئەوە داگرت کەپێویستە نوێنەرانی فەرمیی حکومەت ئامادەی کۆبوونەوەکە بن بۆ گفتوگۆکردن، بەلاّم شاندە میللیەکە لەگەڵ ئەوەدا بوو کەگفتوگۆو بیروراگۆرینەوە ئەنجام بدرێت تاوەکو لەئاکامدا بەشێوەی پێشنیازی تێروتەسەل پێشکەش بەحکومەت بکرێت لەبەرامبەردا شاندی کوردی پێشنیازی کرد کە یان نوێنەرانی حکومەت ئامادە بن یان حکومەت فەرمانێك بەپێکهێنانی لیژنەیەکی هاوبەش دەربکات کەنوێنەری حکومەتو(شێخ محەمەد رەزا ئەلشەبیبی) ئامادەی بێت بۆ دارشتنی هێڵە گشتیەکانی ئەو(ناناوەندێتیەی) کە لەبەیاننامەکەی(١١/٣/١٩٦٣)ی حکومەتدا هاتبوو[٧١]، لەئەنجامی لێکدانەوەی ناوەرۆکی یەکەمین

---

[٧٠] بڕوانە: شلومو نکدیمون، س پ، ل٨٦.

[٧١] شاندەکەی حکومەت پێکهاتبوو لە: فائق السامرائي، حسين جميل، فيصل حبيب الخيزران، عبدالعزيز الدوري. بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٤٩٠، پاشکۆی ژمارە(١٣)ی سەرچاوەکە. هەر لەبارەی ئەو گفتوگۆیانەو شکستهێنانی بڕوانە: عبدالكريم فرحان، س پ، ل١٥٨.

کۆبوونــەوەی نێوانیانــدا، چــەند تێبینیــەکمان لــەلا گەڵاڵــە بــوو، گرنگترینیان ئەمانەن:

١)هەردوو لایەنە پەیوەندیدارەکـە لـەپێش ئەنجامـدانی وتووێـژەکان، بەڕوونی لەسەر پێکهاتەو ئاستو سیفەتی ئەنـدامانی شـاندەکانی دانوســتانکار پێکنــەهاتبوون، هەرچــەندە یەکێکــە لەمــەرجو پێداویستیە بنچینەییەکانی ئامادەکاری بۆ دانوستان.

٢)مەبەستی حکومەت لەناردنی شاندێکی لەو چەشنە لەسـەرەتادا بـۆ کۆکردنــەوەی زانیــاری بــوو لەســەر شــاندی کــوردیو پرۆژەکــەیو تاقیکردنـەوەی نیازیـان، بـۆ ئـەوەی لەخولـەکانی تـری گفتوگـۆدا کەڵکی لێوەربگیرێتو بواری مـانۆڕی دیپلۆماسـی فـراوانتر بکـات. حکومەت لەم هەنگاوەیدا بەرنامەدارو سەرکەوتوو بوو.

٣)شــاندی کــوردی بــەئاگا بــوو لــەبارەی پێویســتی پرســیارکردنو تێگەیشــتن لــەبارەی ســیفەتی نێردراوانــی حکومەتــەوە، چــونکە دەستنیشــانکردنی ئــەو چەشــنە بابەتانــە مــەرجێکی پێویســتە لەڕێکخســتنی هــەر پرۆســەیەکی دانوســتانداو کاریگــەری لەســەر سەرلەبەری پرۆسەکەو ئاکامەکانی بەجێدەهێڵێت.

٤)پرۆژەکەی لایەنی کوردی بۆ دانوستانەکە بریتـی بـوو لـەئۆتۆنۆمی، بـەڵام هـەر لەیەکـەمین کۆبوونـەوە لەگـەڵ شـاندێکی لـەو ئاسـتو ســیفەتە نافەرمیــەدا پێشــنیازی کــرد کەلیژنەیــەکی هاوبــەش پێکبهێنرێـــــت بـــــۆ دارشـــــتنی هێڵـــــە گشـــــتیەکانی پرنســـــیپی(ناناوەنـــــدێتی)ی حکومـــــەت کـــــە لەبەیاننامەکەی(١١/٣/١٩٦٣)دا هاتبوو. ئەم هـەنگاوەی لایـەنی کوردی لەگەڵ لۆجیـكو پرنسـیپە بنچینەییەکانی دانوسـتاندا دژەو نەرمی نواندنو پاشەکشەیەکی پێشوەخت بوو لەداخوازیەکانو دواتر

بەقازانجی بەهێزکردنی بارو پێگەی حکومەت لەو پرۆسەیەدا شکایەوە.

٥)نێردراوانی حکومەت هیچ پرۆژەیەکیان بۆ گفتوگۆکردن نەخستە روو، بەمەش دەرفەتیان لەبەردەم شاندە کوردیەکەدا تەسکتر کردەوە بەئەندازەیەك کەنەیتوانی وەکو پێویست شتێکی ئەوتۆ لەخواستو نیازی راستەقینەی حکومەت هەلّکرێنیّ.

لە(٢/٤/١٩٦٣)دا شاندی کوردی کۆبوونەوەی دووەمی خۆی ئەنجامداو سەرۆکی شاندەکە ئەنجامی سەردانەکەیانی بۆ لای سەرۆك ئەرکانی سوپا لیوا(طاهر یحیی) خستە روو کەتێیدا چەند بەلّێنێکی دابوو لەچەشنی ئازادکردنی گیراوەکانو هەلّوەشانەوەی ئەو فەرمانانەی کە لەسەردەمی دەسەلاّتی(قاسم)دا لەبارەی دەستبەسەراگرتنی مالّو مولّکی کوردەوە دەرچووبوو، هەروەها رایگەیاند کەشاندە میللیەکە لەگفتوگۆکانیدا گوزارشت لەتێڕوانینی حکومەت دەکاتو فەرمانی گرتنی بۆ عەقید روکنی خانەنشین(مصطفی عزیز) دەرنەکردووەو لەو بارەیەشەوە پسولّەیەکی دەستنەخستنەرێی پێدان، دواتر شاندەکە بیروڕایان گۆڕیەوە لەمەڕ ئەو کۆبوونەوەیەی کەبڕیاربوو هەر ئەو ئێوارەیە لەگەلّ شاندە میللیەکەدا ئەنجامی بدەنو لەکۆتاییدا بڕیاریان لەسەر چەند خالّێكدا کەناوەرۆکیان بەم شێوەیە چڕ دەکەینەوە.

١)رێزلێنانی شایستەی ئەندامانی شاندە میللیەکەی عێراق بەدرێژایی ماوەی پرۆسەی گفتوگۆکان.

٢)داوا لەشاندەکە بکرێت سنووری ناوچەی کوردستانو چۆنێتیی بەڕێوەبردنیو پەیوەندی دامودەزگاکانی ناناوەندێتی رامیاری کە لەکوردستاندا دادەمەزرێت بەحکومەتی ناوەندیەوە دەستنیشان بکات.

٣)بڕیـــاردان لەســـەر ســـنووری سازشـــکردنی شـــاندەکە لـــەبارەی پێشنیازەکەوە بـەوەی کەپێویسـتە دەسـت بەناوەرۆکەکـەوە بگیرێـتو سـازش تـەنها لەسـەر بابەتـە روالەتیـەکان بکرێـتو ئـەوەی شـیاوی دەسـتبەرداربوون نیـە پرسـی خۆبـەڕێوەبردنی کوردسـتانو پرسـی کەرکوکە وەك بەشێکی دانەبڕاوی هەرێمی کوردستان.

٤)بڕیاردان لەسـەر پێکهێنـانی لیژنەیـەك لـە(تالـەبانی، محمـد سـعید خفاف، مسعود محمـد، شـێخ حسـێنی خانـەقاو هاشـم عقـراوی) بـۆ پەیوەنـدیکردن بـە بەرپرسـانی حکومەتـەوە لەسـەرۆك کۆمـارو وەزیرەکانو هەروەها کەسایەتیە نیشتمانییەکان. لەئاکامی سەردانی شاندەکە بۆ لای(طاهر یحیی)و گوێبیستی چەند بەڵێنێکی زارەکـیو روونکردنەوەی سیفەتی شـاندە میللیەکـە، جۆرێـك لەبەرچاوڕوونیو ئومێدی درێژەپێـدانی گفتوگۆکـان بەهـەنگاوەکانی دواتـرەوە بـەدی دەکرا ئەو بڕیارانەی کە لەئەنجامی کۆبوونەوەی شاندەکەدا دەرکـران، ئەندازەیەك لەخۆ رێکخستنو بەرنامەڕێژی پێوە دیارە.

هـــەر لـــەئێوارەی(٢/٤/١٩٦٣)دا هـــەردوو شـــاندە کـــوردیو میللیەکەی عێراق دووەمین کۆبوونەوەیان ئـەنجامداو[٧٢]، سـەرەتا لەسـەر پێشـنیازی(شـێخ الشـبیبی)،(تالـەبانی) بڕیارەکـانی کۆبوونەوەکـەی چـــوارقورنەی خســـتە روو بەمەبەســـتی هەڵســـەنگاندنی رادەی جێبـەجێکردنی لەلایـەن حکومەتـەوە، نـاوبراو رایگەیانـد کەهیچیـان جێبەجێ نەکراوە، جگە لەبڕیاری هەڵگرتنی ئابلۆقەی ئـابووری نـەبێت ئەویش بەشێوەیەکی نیوەناچڵی، شایانی ئاماژە پێدانە کـە گرنگترینـی

---

[٧٢] ئەندامانی شاندە میللیەکەی عێراق پێکهاتبوون لـە: فـائق السـامرائي، حسـین جمیل، فیصل حبیب الخیزران، دکتۆر عبدالعزیز الدوریو شێخ محمد رضا الشبیبـي. بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٤٩١، پاشکۆی ژمارە(١٣)ی سەرچاوەکە.

ئەو بڕیارانە پرسی ناناوەنـدێتی بـوو کـەتا ئـەو کاتـە حکومـەت هـیچ ڕوونکردنەوەو وردەکاریەکی لەبارەیەوە نەخستبووە ڕوو.

لەسەر ئەو بنەمایە هەردوو لایەنەکە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کـەداوا لەحکومـەت بکـەن پەلـە بکـات لەجێبـەجێکردنیان، پاشـان شـاندە میللیەکە داوای هەندێك ڕوونکردنەوەیان کرد لەمـەڕ دیـدو تێڕوانینـی لایەنی کوردی بۆ ئەو چەمکی ناناوەندێتیـەی کـەخوازیارین، سـەرۆكو دووان لەئەندامانی شـاندە کوردیەکـە ئـەو تێڕوانینـەیان لـەو بارەیـەوە لەدوو خاڵدا چڕ کردەوە[73]:

١)جۆری ئەو ناناوەندێتیەی خوازیارین رامیاریە، نەك کارگێڕی.

٢)دەستنیشـانکردنی سـنووری ناوچـەی کوردنشـینو بـەجێهێنانی ئارەزووی دانیشتوانەکەی لەبەڕێوەبردنی کاروباری خۆیی ناوچـەکەیانو دیاریکردنی جۆری پەیوەندیەکەیان لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا لەسـەر ئەو بنەمایەی کە کاروبارەکـانی بـەرگریو دەرەوەو دراییـی لەدەسـەڵاتی حکومـەتی ناوەندیدا بێتو لەوەش بترازێـت دەچـێتە خانـەی دەسـەڵاتی ناوچەییەوە.

هـەروەها داوایـان کـرد کەلایـەنی کـوردی پرۆژەیـەکی نووسـراوی تێروتەسـەل پێشـکەش بکـات تـاوەکو تـاووتوێی بکـەن، شـاندەکە ڕەزامەندیی لەسەر ئەو داواکاریە دەربڕیو دواتر لەسەر کـاتو شـوێنی ئەنجامدانی کۆبوونەوەی سێیەم ڕێککەوتن کەتێیدا ئەو پرۆژەیەی پێشتر لەکۆنگرەکەی کۆیەدا ئامادە کرابوو پێشکەش بکرێت[74].

هەرچـەندە شـاندە کوردیەکـە لەئامانجـەکانی حکومـەت لەپشـت ناردنی شاندە میللیەکەوە تێگەیشتبوو، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا گـرەوی

---

[73] بڕوانە: ه س، ل٤٩٢.

[74] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل٤٩٢.

لەسەر درێژەپێدانی وتووێژەکانی نێوانیان دەکرد. دیارە بەدگومانی شاندەکەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ هەستکردنی بەم راستیانەی خوارەوە:

١) حکومەت تا ئەو کاتە بەکردەوە هیچ هەنگاوێکی بەئاراستەی جێبەجێکردنی بەڵێنو پابەندێتیەکانی پێشووی نەنابوو، ئەم راستیەش کاری کردە سەر رادەی بڕوای کورد بەحکومەت.

٢) چەمکی ناناوەندێتی لەدیدی شاندی کوردیدا، هاوتای چەمکی ئۆتۆنۆمی بوو.

٣) لەو کۆبوونەوەیەدا تێگەیشتنێکی روون لەبارەی دیدو پرۆژەی حکومەتەوە سەبارەت بە دانوستان لەلای شاندە کوردیەکە گەڵاڵە نەبوو، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی کارکردنی دیپلۆماسی حکومەت کە لەچوارچێوەی سیاسەتێکی دیاریکراوو نهێنی خۆیدا هەنگاوەکانی دەنا، چونکە لەو کۆبوونەوەیەدا شاندە میللییەکە جگە لەئاراستەکردنی پرسیارو هەڵهێنجانی چەند ئەنجامێك لەگوتەکانی شاندە کوردیەکەدا، خۆی هیچ دیدو بیرو بۆچوونێکی روونی نەخستە روو.

٤) دەستنیشانکردنی شوێنی ئەنجامدانی کۆبوونەوەکان لەدەرەوەی چوارچێوەی دامودەزگا فەرمیەکانی دەوڵەت، بەقازانجی حکومەت شکایەوە، چونکە حکومەت مەبەستی بوو گفتوگۆکان لەو قۆناغەدا سروشتێکی فەرمی وەرنەگرێت، بەڵکو لەقاوغێکی بەرتەسکدا بیهێڵێتەوەو دواتر لەبەر رۆشنایی گۆڕانی هەلومەرجەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

٥) شاندە کوردیەکە پتر پەرۆشیی بۆ گرتنەبەری رێگەچارەی ئاشتیانەی کێشەکانو گەیشتن بەرێککەوتنی پێوە دیارە، بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە لەسیاسەتەکانی حکومەت بەرامبەر بەکوردو هەڵسوکەوتی ئەندامانی شاندە میللیەکەدا بەدی دەکرێت.

٦)لەم کۆبوونەوەیەدا، شاندە کوردیەکە پابەندبوونی خۆی بەبڕیارەکانی کۆنگرەی چوارقوڕنەوە دووپاتکردەوەو جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی بڕیارەکانی بەسەرەتایەکی پێویست بۆ هەنگاوەکانی داهاتووی لەقەڵەمدا.

لە(٣/٤/١٩٦٣)دا سێیەمین کۆبوونەوەی نێوان هەردوو شاندی کوردیو میللی لەزانکۆی بەغداد ئەنجام درا، کەتێیدا بیروڕا لەسەر چەند بابەتێك ئاڵوگۆڕ کراو پێشنیاریان پێشکەش بەیەکدی کرد، کەپوختەکەی بریتی بوو لەمانەی خوارەوە[٧٥]:

١)پاش کردنەوەی دانیشتنەکە(مسعود محمد) پێشنیازی کرد کەپێویستە پێکهاتەی شاندی میللی فراوان بکرێت لەڕێگەی بەشداریکردنی نوێنەرانی نەتەوەکانی ترو نوێنەری حکومەتەوە، بەلاّم شاندی میللی ئەم پێشنیازەی بەگونجاو نەزانیو دەریبڕی کەئەوان ئامادەی گفتوگۆکان نابن ئەگەر نوێنەرانی حکومەت ئامادەبن، چونکە ئەو کاتە رۆڵی ئەوان کۆتایی پێدێت.

٢)جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کەدەستپێکردنەوەی شەڕ تاوانەو زیان بەهەدوو لایەنو پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو گەلەکە دەگەیەنێت.

٣)شاندی میللی پێی لەسەر ئەوە داگرت کەپێویستە شاندی کوردی پێشنیازەکانی خۆی بەوردی لەسەر ناناوەندێتی پێشکەش بکات، بەلاّم شاندی کوردی پێی لەسەر ئەوە داگرت کەپێویستە سەرەتا حکومەت بڕیارەکانی کۆنگرەی چوارقوڕنە جێبەجێ بکات، وە داوای کرد کەپێویستە پێکهاتەی شاندەکە لەسەر هەردوو ئاستی میللیو فەرمی فراوان بکرێت.

---

[٧٥] بۆ دەقی سێیەمین دانیشتنی نێوانیان لە(٣/٤/١٩٦٣)دا بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل٤٩٢-٤٩٣. پاشکۆی ژمارە(١٣)ی سەرچاوەکە.

٤)داوایان کرد کەپێویستە حکومەت ئەوەیان بۆ روون بکاتەوە، کەهەر خۆی بڕیاری کۆتایی لەسەر پێشنیازەکانی شاندی کوردی دەدات، بەبێ پرسو راوێژکردن لەگەڵ هیچ لایەنێکی عەرەبی دەرەکیدا، تاوەکو زووتر بگەنە ئاکام.

٥)رەوتی گفتوگۆکانی ئەم دانیشتنە بەرەو ئاڵۆزی دەڕۆیشت، چونکە(فائق السامرائي) کۆبوونەوەکەی بەجێهێشتو رایگەیاند لەوانەیە ئامادەی کۆبوونەوەکانی داهاتوو نەبێتو، (الشبیبی) پێشنیازی دواخستنی کۆبوونەوەکەی کرد تا ئەو کاتەی پەیوەندی بەحکومەتەوە بکەنو پرسی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی پێشووتری لەگەڵدا باس بکرێتو، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش(فیصل حبیب الخیزرانو مسعود محمد)ی دەستنیشان کرد.

لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی گفتوگۆکانی ئەم دانیشتنەدا چەند سەرنجێکمان لەلا گەڵاڵە بووە، گرنگترینیان: شاندی کوردی دەستپێشخەری کرد لەپێشنیازی فراوانکردنی چوارچێوەو پێکهاتەی شاندەکەدا، بۆ ئەوەی رەوتی دانوستانەکە لەهەنگاوەکانی داهاتوودا بەرەو فەرمی بوون ببات، بەڵام شاندی میللی نەچووە ژێر باری ئەو پێشنیازەوەو پاساوی ئەوەی هێنایەوە کەسروشتی تایبەتی پێکهاتەی شاندەکەو ئەو رۆڵەی کەدەیگێڕێت لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو پێشنیازەدا یەکناگرێتەوە. بەم پاساوە دەیویست دوو ئامانج بپێکێت: یەکەمیان سەلماندنی بێلایەنی رۆڵی شاندەکەو دووەمیان هاوکاریکردنی حکومەتە لەبەدیهێنانی ئامانجەکانیدا کە لەپشت سیاسەتەکەیدایە بەدەستپێکردنی گفتوگۆکان سەرەتا لەرێگای ئەو جۆرە شاندەوە.

شاندی کورد سێیەمین دانیشتنی خۆی لە(١٩٦٣/٤/٤)دا ئەنجام داو گفتوگۆ لەسەر رێوشوێنو شێوازی دانوستانی پەیڕەو کراو لەگەڵ شاندە میللییەکەدا کراو بەپێویستیان زانی پابەندی هەر

هەڵوێستێكی خۆیان بن كە لەو پرۆسەیەدا دەینوێنن، سەرۆكی شاندەكە پێی راگەیاندن كەهەر ئەم ئێوارەیە دیداریان لەگەڵ سەرۆك وەزیراندا هەیەو پێشنیازی كرد كەلەو دیدارەدا بیرو بۆچوونەكانیان بخەنە روو[76].

هەر لەو دانیشتنەدا شاندەكە بڕیاریدا داوا لەحكومەت بكەن كەیان راستەوخۆ دانوستانی لەگەڵدا بكەن، یان دانوستان لەگەڵ هەر كەسانێكدا بكەن كەحكومەت بۆ ئەو كارەی راسپێرێت، یاخود بڕیار لەسەر پێكهێنانی ئەو لیژنەیە بدات كە لەبەیاننامەكەی(ئەنجومەنی نیشتمانی سەركردایەتیی شۆڕش) لە(١١/٣/١٩٦٣)دا لە بارەی داڕشتنی پرۆژەی ناناوەندێتی ئاماژەی پێدراوە، لەكۆتایی دانیشتنەكەدا بڕیار درا كەرۆژی دواتر كۆ ببنەوە بۆ تاووتوێكردنی ئاكامی سەردانیان بۆ لای سەرۆك وەزیران[77].

لەلێكدانەوەی ناوەڕۆكی تەوەرەكانی ئەم دانیشتنەدا دەگەینە چەند ئەنجامێك:

١)تاوتوێكردنی شێوازی بەڕێوەچوونی گفتوگۆكان لەگەڵ شاندە میللیەكەدا كارێكی پێویست بوو، بەمەبەستی هەڵسەنگاندنیو دەستنیشانكردنی كەموكوڕیەكەیو بڕیاردان لەسەر درێژەپێدانی ئەو شێوازە یان دەستكاریكردنی یاخود گۆڕینی.

٢)جەختكردنی شاندەكە لەسەر پێویستی پابەندبوونیان بەهەر بڕیارو هەنگاوێكەوە كەدەینێن، لەلایەكەوە پەرۆشیان بۆ رێگەچارەی

---

[76] دەربارەی دەقی سێیەمین دانیشتنی شاندی كورد، بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٤٩٣، پاشكۆی ژمارە(١٣)ی سەرچاوەكە. شایانی ئاماژە پێدانە كەهەر لەو رۆژەدا حكومەتی بەعس دەستوری(٤/٤/١٩٦٣)ی لەژێر ناوی(یاسای ئەنجومەنی نیشتمانی سەركردایەتی شۆڕش) دەركرد.

[77] بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٤٩٣.

دیپلۆماسی دووپات دەکاتەوەو، لەلایەکی ترەوە یارمەتیدەر دەبێت بۆ پتەوکردنی بڕوای بەرامبەر بەنیازە ئاشتیخوازانەکەی شاندی کورد.

٣)هەوڵدانی شاندی کورد بۆ ئەنجامدانی دیدار لەگەڵ سەرۆك وەزیراندا، بەمەبەستی هەنگاونان بوو بەئاراستەی گۆڕینی سروشتی گفتوگۆکان لەمیللییەوە بۆ فەرمیو پێشکەشکردنی داخوازیەکان راستەوخۆ بەناوەندەکانی بڕیاری رامیاری لەحکومەتدا. ئەم هەوڵە هەرچەندە سەری نەگرت لەبەر چەند هۆکارێك کە لەویستو توانای شاندی کوردی بەدەربوو بەڵکو پەیوەندی بەهەڵوێستی حکومەتەوە بوو وەکو پێشتر ئاماژەیان پێدرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوێکی دیپلۆماسی دروست بوو بۆ ئامانجێکی دروست.

٤)بڕیارەکانی ئەو دانیشتنە لەمەڕ خستنە رووی چەند ئەلتەرنەتیڤێك بۆ بەردەم حکومەت تاوەکو دانوستانەکە سروشتیو شێوازی فەرمی وەربگرێت، هەنگاوێکی دیپلۆماسی دیکە بوو بەئاراستەی گەیشتن بەو ئامانجەی کە لەخاڵی پێشوودا ئاماژەمان پێداوە.

شاندی کوردی لە(١٩٦٣/٤/٥)دا چوارەمین دانیشتنی خۆی بەئامادەبوونی وەزیری دەوڵەت(فؤاد عارف) ئەنجام داو سەرۆکی شاندەکە رایگەیاند کەنەیانتوانی سەرۆك وەزیران ببینن بەهۆی سەرقاڵی خۆ ئامادەکردنیەوە بۆ سەردانی قاهیرەو بەشداربوون وەك سەرۆك شاندی عێراقی لەدانوستانەکانی تایبەت بەیەکێتی عەرەبدا، لەڕاستیدا کاتێك(تالەبانی) داوای کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆك وەزیراندا کرد، پێی راگەیاندرا کەدانوستانەکان بۆ(١٩٦٣/٤/٦) دوا خراوە، وە پاش نزیکەی دوو کاژێر لەو هەواڵە، لەئێزگەی بەغداوە گوێبیستی هەواڵی بەڕێکەوتنی(البکر) بوو بۆ قاهیرە بەمەبەستی

وتوویژکردن لەگەڵ حکومەتی میسردا[78]. لەئاکامی گفتوگۆکاندا بڕیاریاندا لەسەر[79]:

١) ئاراستە کردنی یاداشتنامەیەك بەناوی گەلی کوردەوە بۆ کۆنگرەی قاهیرەو تیایدا باری سەرنجی کوردی لەمەڕ یەکێتیو یەکگرتنی عەرەبی روون بکرێتەوەو وێنەی بدرێت بەهەر سێ دەوڵەتی پەیوەندیدار.
٢) سەردانی باڵیۆزی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی بکرێت بۆ خستنە رووی تێڕوانینی شاندی کورد لەو بارەیەوە.
٣) ئاگادارکردنەوەی(بارزانی) لەدوایین ئاکامەکانی پرۆسەی دانوستانەکەو ئاگاداربوون لەبۆچوونی لەو بارەیەوە.

لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی دانیشتنەکەو ئەو بڕیارانەی کەلێیکەوتەوە دەگەینە چەند ئەنجامێك، گرنگترینیان:

١) بەشداریکردنی وەزیری دەوڵەت(فوئاد عارف) لەکۆبوونەوەکانی شاندی کوردیدا بۆ یەکەمین جار، هێمایەك بوو بۆ ئەوەی گفتوگۆکان لەسنوورێکدا قەتیس ماوەو شاندی میللیو لەپشتی ئەویشەوە حکومەت هیچ هەنگاوێکی کردارەکی نانێت بەئاراستەی بەرەوپێشبردنی گفتوگۆکان، هاوکات دەکرێت شاندەکە کەڵك لەبۆچوونو ئەزمونی ناوبراو وەربگرێت.
٢) سەرنەگرتنی دیداریان لەگەڵ سەرەك وەزیراندا بەبیانووی سەرقاڵبوونیەوە بەگفتوگۆکانی یەکێتی عەرەبیو هەروەها بڕیاردان لەسەر پرسێکی لەو چەشنە پێویستی بەپرسو راوێژکردن لەگەڵ

---

[78] بڕوانە: شلومو نکدیمون، س پ، ل٨٦.

[79] دەربارەی دەقی چوارەمین دانیشتنی شاندە کوردیەکە، بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل٤٩٢، پاشکۆی ژمارە(١٣)ی سەرچاوەکە.

میسرو سورياو وەرگرتنی رەزامەنـدی سـەرەتاییان دەكـات[٨٠]، ئـەو راستیە دەردەخات كەدرێژەپێدانی گفتوگۆ لەگەڵ شاندی كوردیـداو گەیشـتن بەرێگەچـارەیەكی دیپلۆماسـیانە لەئـەركو بایەخـە لەپێشینەیەكانی حكومـەت نـەبووەو هـەر هـەلێكی لـەباری بـۆ رەخسـابێت كردوێتیـە پاسـاوو قۆسـتوێتیەوە بـۆ خۆدزینـەوە لـەو پرۆسەیە، بەمەبەستی ئەنجامدانی مانۆڕی رامیاریو بەدەستهێنانی كاتی زیاتر بۆ خۆرێكخستنەوەو ئامادەباشی تـاوەكو لـەقۆناغێكی تردا گرەو لەسەر رێوشوێنی تر بكات بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ گەلی كوردو داخوازیەكانیدا.

٣) بڕیاری ئاراستەكردنی یاداشتنامە بۆ كۆنگرەی قـاهیرە، بەڵگەیـە لەسەر ئاگاداربوونی شاندی كورد لەرەوتی رووداوەكانی سیاسـەتی ناوچەیی عـەرەبیو هـەوڵێكی دیپلۆماسـیە بـۆ قۆسـتنەوەی ئـەو بۆنەیـە بـۆ خسـتنەڕووی بۆچـوونو داخوازیـەكانی گـەلی كـوردو دەربازكردنی دۆزی كورد لەو چوارچێوە ناوخۆییـە پـەراوێز خـراوەی كەتێیدا هێڵراوەتەوەو دەستەبەركردنی هـەر ئەندازەیـەكی رەخسـاو لەپشتیوانی ماددیو مەعنەوی چەند وڵاتێكی عەرەبی لەو بوارەدا، ئەمە وێڕای ئاگاداركردنەوەی ئـەو وڵاتانـە لـەو راسـتیەی كەهـەر هەنگاوێكی یەكگرتن لەهەر ئاستو چەشنێكدا بێت، رەنگدانەوەی لەسەر مافەكانی گەلی كوردو چارەنووسـی پێكـەوە ژیـانی كـوردو عەرەب لەعێراقدا دەبێـت، لەبـەر ئـەوە لەهـەر پرۆژەیـەكی لـەو چەشنەدا، پێویسـتە نوێنـەرانی گـەلی كـورد ئامـادەبنو رەچـاوی داخوازیەكانیان بكرێت، ئـەگینا بەرپرسـیارێتی مێـژوویی لەهـەر دەرەنجامێـك كـە لـەئاكامی فەرامۆشـكردنی ئـەو بۆچـوونو

---

[٨٠] بڕوانە: هـ س، ل٩٠.

داخوازیانەوە دەکەوێتەوە، دەکەوێتە ئەستۆی حکومــەتی عێراقــیو وڵاتانی پەیوەندیدارەوە، نەك گەلی کورد.

٤)بڕیاری سەردانیکردنی باڵیۆزی میسری بەمەبەستی روونکردنەوەی بۆچوونی گەلی کورد لەو بارەیەوە، بایەخی تایبــەتی خــۆی هەیــە، بەڕەچاوکردنی بۆچوونی سەرۆکی میسری(جمال عبدالناصر) لەمەڕ دۆزی کوردو رێگەچارەی گونجاو بۆ یەکلاکردنەوەیو پێگــەی وڵاتــی میسر لەهاوکێشەی هەر پرۆژەیەکی یەکگرتنی عەرەبیدا.

٥)بڕیاری ئاگادارکردنەوەی(بارزانی) لەدوا گۆڕانکاریەکانی تایبــەت بەڕەوتی گفتوگۆکان، نیشــانەی رەچــاوکردنی شــاندی کوردیــە بــۆ بنەماو نەریتە کار پێکراوەکانی دیپلۆماسی سەردەم لــەو بــوارەداو سنوورو ئاستی دەسەڵاتی کارکردنی رێژەییو دیاریکراوی شــاندەکە لــەو پرۆســەیەدا دەردەخــاتو پابەنــدبوونیان تــا ئــەو کاتــە بــە سەرکردایەتیانەوە دەســەلمێنێتو هاوکــات لەئامانجەکانیانــدا بــوو کەهەنگاوەکانی داهاتوویان لەبەر رۆشنایی فەرمانو رێنماییەکانی ئەودا دیاری بکەنو لەبەرپرسیارێتی ئەنجامەکانی ئەو هەنگاوانەدا تەنیا نەبن.

لەبــەر رۆشــنایی چــوارەمین دانیشــتنی شــاندی کــورد لــــە(٥/٤/١٩٦٣)دا، (تالّــــەبانی)ی ســــەرۆکی شــــاندەکە لە(٦/٤/١٩٦٣)دا نامەیەکی ئاراستەی(بارزانی)ی سەرۆکی پارتی کردو چەند تەوەرەیەکی تایبەت بەڕەوتی بەڕێوەچوونی دانوستانەکانو هەڵوێستی حکومەتو پارتە نەتەوەیەکانی عــەرەبی عێــراق لەمــەڕ مافــەکانی گــەلی کــوردو خســتنە رووی چــەند پێشــنیازێك بــۆ هەنگاوەکانی داهاتووی لەخۆ گرتبوو[٨١].

---

[٨١] بۆ دەقی نامەکە، بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل٤٩٦-٤٩٨.

ناوەڕۆکی نامەکە تیشك دەخاتە سەر چەند لایەنێکی گرنگی ئەو قۆناغە، بۆ نمونە:

١)چەقبەستنی پرۆسەی دانوستانەکە، چونکە شاندی میللی. لەسەر داخوازی شاندی کوردی، داوای روونکردنەوەی لەحکومەت کرد کەسروشتی رۆڵی ئەو شاندە دەستنیشان بکات، چونکە شاندی کوردی بەپێویستی دەزانی دانوستان لەگەڵ حکومەت یان نوێنەرانیدا بکات. شاندەکە گەیشتۆتە ئەنجامێك کەحکومەت نایەوێت گفتوگۆی راستەوخۆیان لەگەڵدا بکات، یان ئەوە جۆرێکە لەدابەشکردنی رۆڵ لەنێوانیاندا یان دەیەوێت پێمان رابگەیەنێت کەداخوازیەکانی زۆرن تاوەکو دواتر ئۆباڵی دەستپێکردنەوەی شەڕ بخاتە ئەستۆی ئەوان، ئەمە وێڕای مانۆڕی رامیاریو بەدەستهێنانی کات.

٢)پابەند نەبوونی حکومەت بەئەنجامدانی کۆبوونەوە لەگەڵ شاندی کوردیدا وەك بڕیار بوو، ئەم کارەی حکومەت دروستی لێکدانەوەکانی شاندی کوردی کە لەخاڵی پێشوودا ئاماژەی پێدراوە دەسەلمێنێت.

٣)حکومەت لەم قۆناغەدا پەنای بردە بەر ئەنجامدانی پڕوپاگەندەو وروژاندنی رای گشتی عەرەبی عێراق لەدژی پرۆژەکەی کوردو ناوزەدکردنی ئەندامانی شاندەکە بەتوندڕەو، دیارە بەمەبەستی گوشار خستنە سەریان تاوەکو دەستبەرداری بەشێك لەداخوازیەکانیان بن،و هاوکات پشتیوانی نێوخۆیی بۆ هەر هەنگاوێك لەدژی گەلی کوردو مافەکانی پەیدا بکات، بەمەرجێك تا ئەو کاتە شاندی کوردی پرۆژەی نووسراوی خۆی پێشکەش نەکردبوو، چونکە داخوازی بەراییان هەبوو.

٤)(تالّەبانی) ئاماژەی بەهەڵەیەکی کورد کرد، کەحکومەت توانی بەقازانجی خۆی بیقۆزێتەوە، کاتێك کە لەکۆبوونەوەکەی چوارقورنەدا(بارزانی) دەقی پرۆژە نووسراوەکەی پێشکەش بەشاندی حکومەت کرد، هەرچەندە(تالّەبانی) لەو کاتەدا داوای لێکرد کەئەو کارە نەکات چونکە حکومەت دەتوانێت چەند خاڵێکی ناو پرۆژەکە بۆ ئامانجی تایبەتی خۆی زەق بکاتەوە، بەوەی کورد داوای زیاتر لەفیدرالیەتیش دەکات، بۆ نمونە ئەو بڕگەیەی تایبەت بوو بەهەبوونی سوپایەکی تایبەت بۆ کوردستان، بەپێی ئەوەی کە لەسایەی ئۆتۆنۆمیدا سوپای سەربەخۆ نیە.

٥)حکومەت لەو هەلومەرجەدا داوای پرۆژە لەشاندی کوردی دەکەن، سەرۆکی شاندەکەش لەو بارەیەوە پێشنیاز دەکات بۆ(بارزانی) گوایە هەڵسەنگاندنی سیاسەتی نێودەوڵەتی ئەو سەردەمە وادەخوازێت کەپرۆژەیەك پێشکەش بکرێت کەلانی کەمی داخوازیەکانی گەلی کوردی تێدا بخرێتە روو، بۆ ئەوەی ئەگەر حکومەت پەسەندی نەکرد، بەرپرسیارێتی کۆتاییهێنانی دانوستانەکە بکەوێتە ئەستۆی ئەو.

سەرۆکی شاندەکە پێشنیاز دەکات کەداخوازیەکانیان لەگەڵ هەنگاوەکانی یەکگرتنی عەرەبیدا بگونجێننو رەچاوی شێوازی داڕشتنەکەی بکەن، بەو شێوەیە کەداوای بنەما سەرەکیو هێڵە گشتیەکانی ناناوەندێتی بکەن ئەگەر عێراق وەکو خۆی مایەوە، بەلّام ئەگەر یەکێتی عەرەبی ئەنجامدا داخوازیەکانی تایبەت بەناوو ناوەڕۆکی ئۆتۆنۆمی فراوان بکەن، بەلّام ئەگەر یەکبوونی هەر سێ ولّاتی عەرەبی ئەنجامدرا، داوا بکەن کەکوردستان هەرێمی چوارەمیان پێکبهێنێت، هەروەها پێشنیازی کرد کەوێڕای ئەوە پێویستە باس

لەبابەتەکانی دیموکراسیکردنی سیستمی فەرمانڕانیو هەڵبژاردنو دانانی دەستورێکی دیموکراسی بۆ عێراق بکەن.

٦)لەنامەکەدا دەردەکەوێت کەهەڵوێستی پارتە نەتەوەییەکانی عێراق لەمەڕ دۆزی گەلی کورد لەدوو خاڵدا یەکدەگرێتەوە: یەکەمیان گرەوکردن لەسەر گرتنەبەری رێگەچارەی ئاشتیانەو خۆ دوورگرتن لەهەڵگیرسانی شەڕو دووەمیان داواکردن لەشاندی کوردی کەپێویستە داواکارییەکانیان لەسنوورێکی دیاریکراو(ناناوەندێتی) تێپەڕ نەکات. هەڵسەنگاندنی بۆچوونی(پارتی سەربەخۆیی) جێگای سەرنجە، چونکە پێی وایە حکومەتەکە بێهێزەو توانای چارەسەرکردنی نە دۆزی کوردو نەعەرەبی هەیە، لەبەر ئەوە بەپێویستی دەزانێت کەشاندەکە پرسو راوێژ لەو بارەیەوە لەگەڵ(عبدالناصر)دا بکات، دیارە رەوتی رووداوەکانی عێراق هەر زوو دروستیی ئەو بۆچوونەی لەمەڕ بێ توانایی ئەو حکومەتە سەلماند.

٧)سەرۆکی شاندەکە لەنامەکەیدا چەند پێشنیازێکی لەمەڕ هەنگاوەکانی داهاتوویان خستە روو کەبریتی بوون لە: پێشکەشکردنی پرۆژەی نا ناوەندێتی کەلانی کەمی داخوازیەکانی گەلی کوردی لەخۆ گرتبێتو پێشکەشکردنی پرۆژەیەکی تر بۆ قۆناغی دوای یەکگرتنی عەرەبی بەو شێوەیەی کەپێشتر روون کرایەوەو پەیوەندیکردن بە(عبدالناصر)ەوە بۆ روونکردنەوەی داخوازیەکانو هەڵوێستی کورد لەمەڕ پرسی یەکێتیی عەرەبی، بەو شێوەیەی کە لەیاداشتی شاندەکەدا پێشکەشی سەرۆکی شاندی عێراقی بۆ کۆنگرەی قاهیرە کراوەو وێنەی دراوەتە نوێنەرانی وڵاتانی بەشداربوو تێیدا.

٨)نامەکە، ئاماژەی بەدیداریان لەگەڵ باڵیۆزی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو کردووە کە لەڕێگەیەوە سڵاوی(بارزانی) یان بۆ(عبدالناصر) ناردو رایانسپارد ئاگاداری ناوبراو بکەنەوە لەو راستیەی کەحکومەتی عێراق نوێنەرایەتی کورد ناکاتو پێویستە لەبابەتێکی وەها چارەنووسسازدا پرس بەکورد بکرێت، هەر لەو دیدارەدا بۆچوونی خۆیان لەمەڕ داخوازیەکانی گەلی کورد لەباری یەکێتیو یەکبوونی عەرەبیدا بۆ روون کردەوە.

٩)لەکۆتاییی نامەکەدا، سەرۆکی شاندەکە داوا لە(بارزانی) دەکات کە لەبەر رۆشنایی ناوەرۆکی نامەکە. وەڵامیان بداتەوەو رێنمایی پێویستیان بکات بۆ هەنگاوەکانی داهاتوویان. ئەم خاڵە ئەو راستیە دەردەخات کەشاندەکە ئەگەر دەسەڵاتی تەواوی لە ئەنجامدانی گفتوگۆکاندا هەبووبێت ئەوا ئەو دەسەڵاتەی لەمەڕ کۆتاییهێنانی یان درێژەپێدانی پرۆسەی دانوستانەکەدا نەبووە، وێڕای ئەوەی نیشانەی پابەندبوونی شاندەکەیە بەناوەندی رامیاری خۆیەوەو لەژێر فەرمانو رێنماییەکانیدا ئەرکەکانی ئەنجامداوە.

هەر لەبەر رۆشنایی بڕیارەکەی شاندەکەی کورد کە لەچوارەمین دانیشتنی خۆیدا لە(٥/٤/١٩٦٣) سازی دابوو، سەرۆکی شاندەکە لە(٨/٤/١٩٦٣)دا یاداشتنامەیەکی پێشکەش بەشاندنی عێراقی بەشداربوو لەکۆبوونەوەکانی قاهیرە کردو داخوازیەکانی گەلی کوردو بیرو بۆچوونی لەمەڕ پرسی یەکێتیو یەکبوونی عەرەبی تێدا خستە روو[٨٢].

[٨٢] بڕوانە: دیڤید ماکداول. ب٢، س پ، ل٦٤٨. شلومو نکدیمون، س پ، ل٨٦. عبدالکریم فرحان، س پ، ل١٥٨.

## باسی دووەم

## هەڵسەنگاندنی یاداشتەکەی ساڵی ١٩٦٣ی شاندی کورد بۆ شاندی عیراق لە کۆبوونەوەکانی قاهیرە

ناوەڕۆکی یاداشتەکە کەهاوکات وێنەی درا بەنوێنەرانی میسرو سوریا، چەند تەوەرەیەکی سەرەکیی لەخۆ گرتبوو. دەکرێت بەم شێوەیە چڕی بکەینەوە:

١-لەپێشەکی یاداشتەکەدا ئەوە روون کراوەتەوە کەشاندی کوردی راسپێردراو بۆ دانوستان لەگەڵ حکومەتی عیراقدا لەبارەی مافەکانی گەلی کوردەوە بەئەرکی خۆی دەزانێت کەشاندی عیراقی لەبیرو بۆچوونی سەرکردایەتی کوردی ئاگاداربکاتەوە لەبارەی جۆری ئەو پەیوەندیەی نێوان عیراق و هەر وڵاتێکی عەرەبی کە لەئاکامی بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوانەدا دێتەکایەوە، بۆ ئەوەی بڕیارەکان لەگەڵ پێگەی گەلی کوردو مافە نەتەوەییەکانیدا دژ نەوەستێتەوە. ناوەڕۆکی پێشەکیەکە سروشتێکی هۆشدارکردنەوەی ناڕاستەوخۆی تێدایە لەئاکامە خراپەکانی رەچاونەکردنی مافەکانی گەلی کورد لەهەر چەشنە پرۆسەیەکی یەکگرتنی عەرەبییدا، هاوکات شاندەکە مەبەستی بوو کە لەرێگەی ئەم یاداشتەوە ئەو راستیە بوون بکاتەوە کەگەلی کورد لایەنێکی سەرەکیە لەسەرجەم هاوکێشە نێوخۆیی و نێودەوڵەتیەکانی تایبەت بەعیراق، لەبەر ئەوە پێویستە حکومەتی عیراق لەداڕشتن و پراکتیزەکردنی سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەکیدا رەچاوی بکات.

٢-شاندی کوردی ئاگادارە لەسروشتی سەراپاگیری کۆبوونەوەکانی قاهیرەو ئەو ئەگەرانەی کە لەوانەیە لێی بکەوێتەوەو کاریگەریان

لەسەر گەلی کوردو مافەکانی، لەبەر ئەوە رایدەگەیەنێت کەپێویستە رێگە بەنوێنەرانی کورد بدرێت بەشێوەیەك لەشێوەکان بەشداری لەشاندەکەی عیراقدا بکەن، چونکە پێکهاتەی ئەو شاندە بەو شێوەیەی هەیە لەگەڵ باری راستەقینەی پێکهاتەی نەتەوەیی گەلانی عیراقدا ناگونجێت.

٣-شاندەکە ئەوە رادەگەیەنێت کەگەلی کورد هیچ کاتێك کۆسپ نابێت لەبەردەم ویستی گەلی عەرەبیدا بۆ هەر جۆرە پەیوەندیەکی نێوانیان، هەروەها ئامادەی پێشکەشکردنی هەر چەشنە هاوکاری‌و ئاسانکاریەکن لەو پێناوەدا. دیارە دەربڕینی ئەو هەڵوێستە لەچوارچێوەی سیاسەتی دووپاتکردنەوەی هەڵوێستی نەگۆڕی گەلی کورد لەو بارەیەوە دێت‌و هەروەها بۆ رەواندنەوەی ئەو بارە تەمومژاویەیە کە لەئەنجامی پڕوپاگەندەی رەوتە شۆڤێنیەکانی عەرەبەوە هاتۆتە کایەوەو پێبەخشینی جۆرێك لەدڵنیاییە بەو حکومەتانە.

٤-هەر بەمەبەستی پتر روونکردنەوەو رێگرتن لەهەر ئەگەرێکی لەیەکتر نەگەیشتن‌و هاودژیەك لەنێوان بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوانەو مافەکانی گەلی کورددا، شاندەکە بیروبۆچوونەکانی لەبارەی رێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو گەلی کوردو عەرەبیەوە لەهەموو ئەگەرو بارێکی ئایندەییدا بەسێ خاڵ خستە روو* :

أ-لەبارێکدا عیراق هەروەکو خۆی مایەوە، گەلی کورد داوای جێبەجێکردنی ناوەرۆکی بەیاننامەکەی (١١/٣/١٩٦٣)ی حکومەت دەکات کە لەسەر بنچینەی ناناوەندێتی بوو.

---

* لەئاکامی بەراوردکردنی نێوان ناوەڕۆکی یاداشتەکەو ئەو زانیاریانەی (لەم بارەیەوە) لەپەرتووکەکەی(شلومو نکدیمون)دا هاتووە، بۆمان دەرکەوت کەئەو زانیاریانە ورد نین. بڕوانە شلومو نکدیمون، س پ، ل ٨٦.

ب-ئەگەر عیراق چووە ناو یەکێتیەکی فیدرالیەوە، پێویستە ئۆتۆنۆمی بەگەلی کورد بدرێت.

ت-ئەگەر عیراق یەکگرتنێکی تەواوی لەگەڵ دەوڵەتێکدا یان چەند دەوڵەتێکی عەرەبیدا ئەنجام دا، گەلی کورد لەعیراقدا هەرێمێکی پەیوەست بەدەوڵەتە یەکگرتووەکەوە پێکدێنێت، بەجۆرێك ئامانج لەپاراستنی بوونی بهێنێتە دیو هاوکات گومانی جوداخوازی لەسەر لابەرێتو دەستەبەری گەشەپێدانی ئایندەییو پەیوەندیی پتەوی نێوان هەردوو گەلی کوردو عەرەب بکات.

لەناوەڕۆکی ئەم سێ خاڵەدا، ڕەچاوی هەموو بارە پێشنیازکراوەکانی ئایندەو پلەبەندی خستنەڕووی داخوازیەکانی گەلی کورد بەگوێرەی هەر یەکێك لەو ئەگەرانە کراوە. بەم شێوەیە داخوازیەکان شەقڵەکانی ڕوونیو پلەبەندیو ریالیستی لەخۆ گرتووە.

بەڵام ڕێککەوتنە سێ قۆڵیەکەی نێوان میسرو سوریاو عیراق کە لە (١٧/٤/١٩٦٣)دا لەبارەی پێکهێنانی یەکێتیەکی فیدرالیەوە ئەنجام درا، هیچ ئاماژەیەکی بۆ گەلی کوردو مافەکانی تێدا نەبوو[83]، ئەم کارەش گومانو نیگەرانی لەلای سەرکردایەتی کوردی پتر کردو کاری کردە سەر ئاراستەی وتووێژەکانی نێوانیان. شاندی کوردی پێکهاتوو لە (تاڵەبانی)و (فؤاد عارف)، لەچوارچێوەی شاندەکەی عیراقدا سەردانی قاهیرەیان کرد، دیارە بەشداربوونیان لەسەر پێشنیازی سەرۆك وەزیرانی عیراق (احمد حسن البكر)و (طاهر يحيى) بو پاش بەڵێنپێدانو دڵنیاییکردنیان بەوەی کەدەشێت لەوتووێژەکاندا بگەنە چارەسەرێکی گونجاو بۆ دۆزی کوردو، هەر لەو سەردانەدا سەرۆك (عبدالناصر) لە (٢٣/٤/١٩٦٣)داو لەماڵی خۆیدا

---

[83] بڕوانە: د.محمد عمر مولود، س پ، ل ١٦١.

کۆبوونـــەوەی لەگـــەڵ شـــاندی عیراقیـــدا کـــردو تێیـــدا بەشـــێوەیەکی سەرپێیی باس لەدۆزی کوردی کـرا[٨٤]. لـەو کۆبوونەوەیـەدا، سـەرەتا (علـي صـالح السـعدي) بـــە (عبدالناصـــر)ی راگەیانـــد کەئـــەوان دەیانەوێت دۆزی کوردی بۆ روون بکەنـەوەو ئـەم کـارەش بـە (صـالح مهدي عماش) دەسپێرێت، بەڵام ناوبراو کە بەشۆڤێنیستیو دژە کورد ناسراوە لەبری ئەوەی باس لەکرۆكو ریشەی مێژوویی بابەتەکە بکـا، یەکسەر دوا رەوشەکەی خســتە رو، وە هۆکـاری سـەرەکی وروژانـدنو پەرەسەندنی گێڕایەوە بۆ سیاسەتەکانی (قاسم)و ئەوەشی روون کردەوە کەئەوان کۆبوونەوەیان لەگەڵ نوێنەری کورددا کـردووەو گفتوگۆیـان لەبارەی داخوازیەکانیانەوە لەگەڵداکردوونو لەدوا کۆبوونەوەدا لێیان تێگەیشتوون کـەئامانجیان (اسـتقلال ذاتـي)ە، وە ویسـتمان قایلیـان بکەین کە لەئاییندەدا مافەکانیان دەسـتەبەر دەکـەین، بـەڵام ئـەوان داوای گرەنتـــی دەکـــەنو، پێمـــان راگەیانـــدوون کەمافـــەکانیان رادەگەیەنینو ئامادەین رێککەوتنێکی نهێنیـان لەگەڵـدا ببەسـتینو قەوارەی خۆیان پێبدەین هەرکاتێك یەکگرتن لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا ئەنجام بدەین، دیارە ئەمە کێشەیەکی عەرەبییەو ناوخۆیی نیەو سیاسەتوان نینو لەوانەیـە هەڵگیرسـانەوەی شـەڕیش ئینگلیـزو کۆمۆنیســتەکان لەناوچــەکەندا بوروژێنێــت، لەبـەر ئـەوە ئێمــە بەپێویستمان زانی کێشەکە بخەینە روو، هەروەها کوردەکـانیش داوای ئامۆژگاریتان دەکەن. هەر لەو دانیشـتنەدا (عبدالناصـر) جـەختی لەسەر مەترسی بەریتانیاو ئێران لەسەریان کردەوەو لـەم بارەیـەوەش

---

84بڕوانە، مسعود البـارزاني، س پ، ل ٩١. بـۆ دەقـی کۆنووسـی کۆبوونەوەکـەی نێوان (عبدالناصر)و شاندی عیراقیو دواتریش کـوردی بـەجیا، بڕوانـە، ه س، ل ل ٤٩٥-٥٠١.

(عماش) پشتگیری لەو بۆچوونە کرد*. جێگەی سەرنجە کەلەگەڵ ئەوەشدا (عبدالناصر) پرنسیپی ئۆتۆنۆمی بەمەترسی دەزانیو پێی وابوو کەئەو مەترسیە لەوانەیە بۆ سوریاش تەشەنە بکاتو، هەروەها (حکم محلي) یان کارگێڕی خۆجێیەتی بەچارەسەرێکی گونجاو دادەنا!

(السعدي) پاش ئەوەی بۆ (عبدالناصر)ی روون کردەوە کەنوێنەرانی کوردی بەشداربوو لەشاندەکەی عیراقدا خوازیارن کۆبوونەوەیان لەگەڵدا بکەنو هەر لەو دانیشتنەدا پاش بەیەکتری ناساندنیان، ناوبراو (١٩٦٣/٤/٢٤)ی بۆ کۆبوونەوەکردن لەگەڵیاندا دیاری کرد. لەو کۆبوونەوە تایبەتەدا بیروڕایان لەبارەی دۆزی کوردەوە گۆڕیەوە، کەدەشێت بەم شێوەیە چڕی بکەینەوە:

سەرەتا (عبدالناصر) ئامادەی گوێگرتنی دەربڕیو (فؤاد عارف)یش کورتەیەکی لەبارەی مێژووی نویۆو هاوچەرخی دۆزی کوردەوە خستە روو، دواتر ئاماژەی بەو پەیوەندیکرنو رێککاریەی نێوان پارتیو ئەنجامدەرانی کودەتاکەی بەعسیەکان لەدژی (قاسم)کرد کە لەسەر بنەمای ئەو مەرجە بوو کەدەبێت لەیەکەمین یان دووەمین بەیاننامەی پاش دەسەڵات گرتنە دەستیاندا دان بەئۆتۆنۆمی بۆگەلی کورددا بنێن. دواتر (تاڵەبانی) ئاماژەی بەچەند خاڵێك کرد کەپوختەکەی بریتیە لە:

---

* لەم بارەیەوە (تاڵەبانی) دەڵێت: لەدیدارەکەی نێوان شاندی عیراقیو (عبدالناصر)و (بن بللا)دا ئاگاداریان کردینەوە لەمەترسی قۆستنەوەی کێشەی کورد لەلایەن ئێرانەوە، لەبەر ئەوە پێیان باش بوو کەحکومەتی عیراق مافی کورد بداتو کوردیش هاوکاریی شای ئێران نەکات. بڕوانە، جلال الطالباني، حول....، س پ، ل ل١٠٩-١١٠.

**١-لەنێو ریزەکانی پارتیدا لەمپەڕی راستەوەوە بۆ ئەوپەڕی چەپڕەو هەیە.**

**٢-دووپاتکردنەوەی زانیاریەکەی (فـؤاد عـارف) لەبارەی هاوکاریکردنی پارتیەوە لەسەرخستنی کودەتاکەی بەعسی بەسەر (قاسم)داو بەردەوامبوونی ئەو هاوکاریکردنە لەقۆناغی دواتردا.**

**٣-حکومەتی بەعس بەڵێنی روونی بەکورد دا کەئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بسەلمێنێ.**

**٤-ئاماژەی بەدەستێوەردانی یەکێتی سۆڤێت لەدۆزی کورددا کرد کەچۆن هانیان دەدات چەك لەدژی حکومەتی بەعس هەڵگرن.**

**٥-ئەوەی بۆ (عبدالناصر) روون کردەوە کەنوێنەرانی کورد پێشتر نمونەی ئۆتۆنۆمی چەند وڵاتێکیان بۆ حکومەت هێناوەتەوە، لەچەشنی ئەوەی کەکورد خوازیاریێتی، وەکو هیندستان، یۆگۆسلافیاو، سویسرا. هەروەها داوای گرەنتی لێکرد بۆ هەر بەڵێنێك کەحکومەتی بەعس بەکوردی دەدات، لەبەر ئەوەی کورد بڕوایان بەخودی (عبدالناصر) هەیە، داوای دڵنیاییکردنو دووپاتکردنەوەی لەلایەن خودی ئەوەوە لێکرد.**

**٦-لەوەڵامدا سەرۆکی میسر پێی راگەیاندن کەئەو دژی هەر پرۆسەیەکی جوداخوازیە لەهەر وڵاتێکی عەرەبیداو، میسر بەتوندی بەرەنگاری هەر رێبازو ئاراستەیەکی لەو چەشنە دەبێتەوە، دواتر داوای وەڵامی سێ پرسیاری لێکردن لەبارەی واتای کوردستانو چەمکی ئەو ئۆتۆنۆمیەی کەکورد دەیخوازێتو ئاخۆ وردەکاریەکانی لەبەردەستانو، تا چ ئەندازەیەك ئەو بەیاننامەیەی لیژنەی کوردەکان لەسویسرا رایانگەیاندووەو داخوازی کوردەکان لەبارەی پترۆڵو رێگەنەدان بەسوپای عیراق بچنە کوردستانەوەو دامەزراندنی سەرۆك حکومەتێکی کورد راستە؟ (تاڵەبانی) وەڵامی پرسیارەکانی دایەوەو**

روونی کردەوە کەکوردستان واتا شوێنێك کـوردی تێـدا بێـت‌و، ئـەو شـــوێنانەش ناســـراوو دیـــاریکراون‌و، وردەکاریـــەکانی پـــرۆژەی ئۆتۆنۆمیەکە ئامادە نیـە، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی مەبەسـتیان ئەوەیـــە کـــەبوارەکانی ســـەرۆکایەتی‌و دەرەوەو بـــەرگری‌و دارایـــی لەدەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا بێت‌و کوردستانیش خـاوەن هـەردوو دەزگای یاسادانان‌و جێبەجێکردن بێت وەکـو ئـەوەی لەویلایەتـەکانی هیندستاندا هەیەو ئەنجومـەنی جێبـەجێکردنی کوردسـتان بـەرپرس دەبێت لەبەرامبەر بڕیارەکانی حکومـەتی ناوەنـدیدا. وە بـۆ وەڵامـی پرسیاری سێیەمیان، (تاڵەبانی) روونـی کـردەوە کەئـەو داخوازیانـە دروست نین‌و ئـەو بەیاننامـەیـە لەلایـەن ژمارەیـەك لەخوێنـدکارانی کۆمۆنیستی کوردەوە دەرچـووە، دیـارە بەدواکـەوتنی چارەسـەرکردنی دۆزی کورد توندڕەوی پەرە دەسێنێت، کورد بەسـەربەخۆیی یـەکجاری ناوێت، وە داوای بەپەلـە چارەسـەرکردنی کێشـەکە دەکـەین تـاوەکو بارودۆخی نێوخۆیی ئاڵۆزتر نەبێت‌و رێگە بۆ دەسـتێوەردانی دەرەکـی خۆش نەکات، هەروەها رایگەیاند کـەکورد لەهەڵگیرسـانەوەی شـەڕ دەترسێت‌و ناشبێت ئـەوە روو بـدات، چـونکە پەیوەندیـە مێـژوویی‌و ئایینیـــەکان هـــەموان بەیەکـــەوە دەبەســـتێتەوە. لـــەکۆتایی کۆبوونەوەکەدا (عبدالناصر) سوپاسی کردن لەسەر ئەو زانیاریانـەو پێی راگەیاندن کەلەوانەیە لـەدوای دیدارەکـەی رۆژی دواتـر لەگـەڵ شاندی عیراقیدا، بتوانێت جارێکی تر لەگەڵیاندا کۆ ببێتەوە.

لەلێکدانەوەی نـاوەرۆکی گفتوگۆکـانی نێـوان شـاندی عیراقـی‌و سەرۆکی میسریدا، چەند ئـەنجام‌و تێبینیـەکمان لـەلا گەڵاڵـە بـوو، گرنگترینیان ئەمانەن:

١-ئامادەبوون‌و بەشداربوونی شاندی کورد لەتەك شاندی عیراقـدا لەو کۆبوونەوانەدا، لەسەر پێشـنیازی لایـەنی دووەمیـان بـوو، ئـەو

هەڵوێستەی حکومەت بۆ دڵنیاییکردنو چەواشەکردنی شاندە کوردیەکەو نواندنی ڕواڵەتی نیازپاکی حکومەت لەبەرامبەریاندا بوو، هەروەها بەمەبەستی پێکەوە گرێدانی چارەنووسی وتووێژەکانی نێوانیان بەچارەنووسی پرۆسەی یەکێتیو یەکبوونی عەرەبییەوە بوو، لەکاتێکدا کەئەگەری نەهاتنەدیو سەرنەگرتنی لەهەر ئەگەرێکی تر بەهێزتر بوو، وە هەموو لایەنەکان بەگشتیو دەسەڵاتدارانی عیراق بەتایبەتی ئەو راستیەیان باش دەزانی، بەمەش حکومەتی عیراق دەیویست ئۆباڵی شکستهێنانیان لەپرۆسەی بەکگرتنەکەو وتووێژەکانیان لەگەڵ نوێنەرانی گەلی کورددا بخەنە ئەستۆی کوردو هەردوو وڵاتەکەی تر، بەتایبەتیش میسر، چونکە حکومەتی عیراق راستیی هەڵوێستی دژایەتیکردنی حکومەتی سوری لەبارەی هەر مافێکەوە کە بەگەلی کورد لەعیراقدا بدرێت دەزانی، بەئەندازەیەکی کەمتریش هەڵوێستی میسر کەلانی هەرە کەمی مافو داخوازیەکانی کوردی دەسەلماند.

٢-ئامانجی شاندە کوردیەکە لەبەشداریکردنی سەردانەکەو گفتوگۆکانی قاهیرەدا، نوێنەرایەتیکردنی گەلی کوردو خستنەڕوی داخوازیەکانیو بەدەستهێنانی جۆرێك لەپشتیوانی بوو، بەتایبەتیش لەلایەن سەرۆکی میسرەوەو، هەروەها بەئاگابوون لەرەوتی گفتوگۆکانی هەرسێ وڵاتی پەیوەندیدار ئەو بڕیارو ئەنجامانەی کەلێی دەکەوێتەوەو کاریگەریان لەسەر دۆزی کورد لەعیراقدا، بەڵام لەئاکامدا هیچ یەکێك لەو ئامانجانە وەکو پێویست نەهاتنە دی، بەتایبەتی تێڕوانینەکانی سەرۆکی میسری، لەوانەیە هۆکارە سەرەکیەکەی بگەڕێتەوە بۆ رۆڵی شاندی عیراقی لەچەواشەکردنی (عبدالناصر)دا لەبارەی داخوازیەکانی کوردەوە، وێڕای تێڕوانینو لێکدانەوەی تایبەتی ناوبراو خۆی لەسەر ئەو بابەتەو کاریگەریی

بەدەستهێنانی کورد بۆ مـافی ئۆتۆنـۆمی لەعیراقـدا لەسـەر بـاری رامیاری نێو سوریا، بەپێی ئەوەی کـەخاوەن کێشـەیەکی هاوشـێوەی ئەوەی عیراقە. لەسـەر ئـەو بنەمایـە تێبینـی دەکـەین کەبۆچـوون و هەڵوێستەکانی (عبدالناصر) لەو بارەیەوە بەشێوەیەکی گشـتی پـتر بەقازانجی بیرو بۆچوون و پێگەی شاندی عیراقی شکایەوە.

٣-(عماش) بەجۆرێك بابەتەکەی وروژاند کەکاریگـەریی لەسـەر دیدو بۆچوونەکانی (عبدالناصر) بەجێهێشت، بەتایبەتی ئەو کاتـەی کەهەڵوێستی پێشووی خۆیانی لە مەڕ مافەکانی گەلی کورد خسـتە روو، ئەو بابەتـەی بەپرسـێکی عـەرەبی دانـاو بەپرسـی سـەرگرتنی پرۆسەی یەکێتی و یەکبوونی عەرەبی بەستەوەو لەبەرامبەر نـاوبراودا خۆیانی بەناسیاسەتوان نیشان داو ئەوەشی دەربڕی کەهەڵگیرسانەوەی جـەنگی کوردسـتان وڵاتـانی وەکـو بـەریتانیاو یـەکێتی سـۆڤێت دەوروژێنێت. بە بۆچوونی ئێمە (عەماش) سەرکەوتوو بـوو لـەبواری وروژانـدنی هەسـتی (عبدالناصـر)دا بەقەبەکردنـەوەی مەترسـی دەستێوەردانی بەریتانیا لەکاروباری نێوخـۆیی عـیراق و نێوچـەکەدا، بەڵام پێچەوانەکەی راستە کاتێك ئاماژەی بەمەترسی کۆمۆنیستەکان دەکات، هەر لەبەر ئەوەیە (عبدالناصر) لەوەڵامـدا شـاندی عیراقـی لەمەترسی بەریتانیاو ئێران ئاگادار کردەوەو بـەهیچ شـێوەیەك نـاوی یـەکێتی سـۆڤێت و مەترسـی کۆمۆنیسـتی نـەهێنا. دیـارە ئـەو هەڵوێستەی ناوبراو رەنگدانەوەی جۆری پەیوەندیـە نێودەوڵەتیـەکانی میسر بوو لەو قۆناغـەدا کەپەیوەندیـەکی پتـەوی لەگـەڵ یـەکێتی سۆڤێت و وڵاتانی کەمپی سۆشیالیسـتیدا هـەبوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا (عماش) نەیوەیست لەرووی (عبدالناصـر) بوەسـتێت و لەئەنجامـدا پشتگیری خۆی بۆ بۆچوونەکانی ناوبراو دەربڕی.

٤-دیدو بۆچوونی (عبدالناصر) بۆ شێوازی چارەسەرکردنی دۆزی کورد، نەك هەر لەگەڵ داخوازیەکانی شاندی کوردیدا یەکینەگرتەوە،

بەڵكو تەنانـەت لـەو ڕاگەیانـدن‌و گفـت‌و بەڵێنانـەش کـەمتر بـوو کەخودی بەعس‌و حکومەتـەکانی عـیراق لەسـەردەمە جیاجیاکانـدا بەنوێنـــەران‌و ســـەرکردە کوردەکانیـــان داوە. حکومـــەتی عـــیراق لەهەنگاوەکانی دواتردا ئەو هەڵوێستەی (عـبدالناصـر)ی بـەقازانجی خۆی‌و لەدژی گەلی کورد قۆستەوەو ئۆباڵەکەی خستە ئەستۆی ئەو.

دیدو بۆچوونەکانی (عبدالناصر) لەمەڕ دۆزی کـورد لەعیراقـداو شێوازی چارەسەرکردنی، بەرهەمی ئاوێتـەبوونی ئایـدیای نەتـەوەیی خۆی‌و کارتێکردنی بۆچوونەکانی هەردوو ڕەوتی ناسری‌و بـەعس بـوو لەعیراقداو سەرەنجام لەچوارچێوەی فۆرمی ئایدیایـەکی شـۆڤینیزمی عەرەبیـدا دەرنەچـوو، بـە بەڵگـەی ئـەوەی زۆر بەتونـدی لـەبارەی جیابوونـــەوەی کـــورد دواو ئەوپـــەڕی ئامـــادەیی میســـری بـــۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر هەوڵێکی کورد کـە بـەو ئاراسـتەیە بـدرێت دەربـڕی بـەبێ ئـەوەی لـەهیچ بۆنـەو بـەهیچ شـێوازێك لەلایـەن سەرکردایەتی‌و شاندی کوردی دانوسـتانکارەوە دروشمـی سـەربەخۆیی کوردستانیان بەرز کردبێتەوە، قسەکانی (تالب شـبیب) لەم بارەیـەوە بەڵگەیە لەسەر کاریگەریان لەسەر (عبدالناصر)و تێڕوانینەکانی بۆ شـێوازی چارەسـەرکردنی دۆزی کـورد لەعیراقـدا، کاتێـك دەڵێـت: لەکۆبوونەوەکـــەمان لەگـــەڵ (عبدالناصـــر)دا تکامـــان لێکـــرد کەنوێنەرانی کـورد تێبگەیـەنێت گوشـار نەخەنـە سـەر حکومەتـە نوێیەکەمان بەداواکاری ناپەسەند یـان جـۆرە داواکاریـەك کەئـەمڕۆ توانای بەدیهێنانی نەبێت[٨٥].

[85] بۆ زانیاریی پتر لەو بارەیەوە، بۆ نمونە بڕوانە، د. علی کـریم سـعید، س پ، ل ل ٢٥٠-٢٥١.

بەم شێوەیە لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی کۆبوونەوەکەی نێوان (عبدالناصر)و شاندی کوردیدا گەیشتینە چەند ئەنجامێك کەگرنگترینیان لەچەند خاڵێکدا چڕ دەکەینەوە:

١-لەپاش گەڕانەوەی (بارزانی) لەیەکێتی سۆڤێت، ئەوە دووەمین دیداری سەرکردەو نوێنەرانی کورد بوو لەگەڵ (عبدالناصر)دا، کەپێگەو دەسەڵاتێکی بەرچاوی لەسەر ئاستی نێوچەیی و نێودەوڵەتی هەبوو، بەتایبەتیش لەسەر ئاستی وڵاتانی عەرەبی و جیهانی سێیەمدا.

٢-(فؤاد عارف) لەو دیدارە سەرکەوتوو بوو لەبارەی خستنەڕووی کورتەیەکی مێژوویی دۆزی کوردو دواقۆناغەکانی پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتی کوردیی و نەیارانی پێشووی حکومەتەکەی (قاسم) بەگشتی و ناسری و بەعیسەکان بەتایبەتی.

٣-(تاڵەبانی) سەرۆکی شاندەکەش لەخستنەڕووی چەند راستیەکدا کەخزمەتی بەئامانجەکانیان لەو بەشداربوونەدا گەیاند، ئاستێکی باشی لەتوانای دیپلۆماسیدا نواند، بۆ نمونە بابەتەکانی، هاوکاریکردنی پارتی لەگەڵ بەعسیەکاندا بۆ سەرخستنی پرۆسەی کودەتاکەو بەڵێنەکانی پێشووی سەرکردەکانی بەعس بەپێدانی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کوردو، دووپاتکردنەوەی نمونەی ئەو فۆرمە ئۆتۆنۆمیەی کەکورد خوازیارێتی و پێشتریش بۆ سەرکردەکانی بەعسیان هێناوەتەوە، هەروەها هەوڵدانی بۆ قایلکردنی (عبدالناصر) بەپشتیوانیکردن لەداخوازیەکانیان و بوونی بەگرەنتیەك بۆ هەر بەڵێنێك کەحکومەتی بەعس بەکوردی دەدات، رەتکردنەوەو بەدرۆخستنەوەی ئەو هەواڵانەی کەباس لەهەندێك داخوازی کورد دەکەن کە بەلای (عبدالناصر)ەوە زیادەڕەوی و مەترسیدارن، روونکردنەوەی ئەو راستیەی کەگەلی کورد داوای

جیابوونەوەی یەکجاری لەعیراق نەکردووە، بەڵکو داوای ئەندازەیەك لەسەربەخۆیی نێوخۆیی لەچوارچێوەی عیراقدا کردووە، هەروەها (تاڵەبانی) داوای چارەسەرکردنی ئاشتیانەوە بەپەلەی دۆزی کوردی کرد تاوەکو ڕێگە بگیرێت لەدەستێوەردانی دەرەکی لەکاروباری نێوخۆیی عیراق، ئەوەشی دەربڕی کەئەوان لەدژی هەڵگیرسانی شەڕو کاری توندوتیژیدان.

لەگەڵ هەموو ئەو لایەنە باشانەی کە لەگوتەکانی (تاڵەبانی)دا هاتبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ورووژاندنی سێ بابەت لەروونکردنەوەکانی ناوبراودا جێگەی تێبینیو سەرنجی ئێمەیە، ئەو بابەتانەش بریتین لە:

١-باسکردنی ململانێی نێوخۆییی نێوان سەرکردایەتیی پارتی، لەکاتێکدا کەلۆجیكو بنەماکانی زانستو هونەری دانوستان وا دەخوازن کەهەر لایەنەو باری بەهێزیی خۆی نیشان بداتو خاڵەکانی لاوازیو ڕواڵەتەکانی ناکۆکیو دووبەرەکی نێوان ریزەکانی بشارێتەوە، یان هەر هیچ نەبێت ئەو لایەنە خۆی دانیپێدا نەنێت بۆ بەرامبەرەکەی، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە نەلایەنی عیراقیو نە (عبدالناصر) ئەو بابەتەیان نەورووژاند، وە هیچ بۆنەو پاساوێکی روون بۆ خستنەڕووی ئەو بابەتە لەلایەن سەرۆکی شاندەکەوە بەدی ناکەین.

٢-ئاماژەکردنی بەمەترسی دەستێوەردانی یەکێتی سۆڤێت لەدۆزی کوردو هاندانیان بۆ هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەدژی حکومەتی بەعس. لەراستیدا ئەگەر مەبەستەکەی ناوبراو بۆ خستنەڕووی مەترسیەکانی دەستێوەردانی دەرەکی لەکاروباری نێوخۆیی عیراقو تەنانەت مەترسی گەشەسەندنی ڕێبازو ڕەوتی کۆمۆنیستی بێت لەعیراقدا، ئەوا تا رادەیەك کارێکی ئاساییە، بەڵام بەحوکمی جۆری

پەیوەندیەکانی نێوان میسرو یەکێتی سۆڤێت، لەوانەیە باسکردنی ئەگەری مەترسی دەستێوەردانی ئەو وڵاتە نەك هەر مایەی خۆشحاڵی (عبدالناصر) نەبووبێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە مایەی گومانکردنی بێت لەرەوتی رامیاریو پەیوەندیەکانی سەرکردە کوردەکان بەهەندێك لەوڵاتانی رۆژئاواوە، لەکاتێکدا کەهەنگاوی دروست بۆ راکێشانی سەرنجی بەرامبەرەکەی ئەو بوو کەمەترسی دەستێوەردانی وڵاتانی تری وەکو بەریتانیاو فەرەنساو ئەمریکاو ئێرانو تورکیای زەقتر بخستایە روو.

٣-ئامادەنەکردنی پرۆژەیەکی نووسراو بەداخوازیەکانی گەلی کورد، تاوەکو لەکاتی پێویستیدا پێشکەش بەلایەنە پەیوەندیدارەکانی ئامادەبووی کۆبوونەوەکانی قاهیرەی بکردایە، لەراستیدا هەڵی خستنەڕووی پرۆژەیەکی لەو چەشنە هاتە پێشەوە کاتێك کە (عبدالناصر) داوای لێکردن، بەڵام وەڵامیان دایەوە کەهیچ پرۆژەیەکیان لەو بارەیەوە ئامادە نەکردووە!

شاندی کوردی بەشداربوو لەکۆبوونەوەکانی قاهیرەدا گەڕایەوە بەغداد بەبێ ئەوەی هیچ پێشکەوتنێك لەبواری بەئاشتی چارەسەرکردنی دۆزی کورددا بێتە ئاراوە[٨٦]. لەلایەکی ترەوە، چونکە گفتوگۆکانیان لەگەڵ شاندە میللیەکەی عیراقدا بێ ئاکام بوو، لایەنی کوردی کۆبوونەوەکردنیان لەگەڵدا بڕینو داوایان لێکردن کەپێویستە لەمەودوا وتووێژەکان بەفەرمی میللی ئەنجام بدرێتو نوێنەرانی فەرمی حکومەتیان (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) لەگەڵدا بێت[٨٧]. حکومەت بەپیر داخوازیەکەوە چوو، شاندێکی

---

[86] بڕوانە، مسعود البارزانی، س پ، ل ٩١.

[87] شاندی فەرمیی حکومەت پێکهاتبوون لە: (صالح مهدی عماش) سەرۆکی شاندو ئەندامێتی (ناجی طالب) وەزیری پیشەسازیو (محمود شیت خطاب) وەزیری

فـەرمی پێکهێنـاو شـاندە میللیەکـەش چـووە پاڵیـان، بـەڵام پـاش ئەنجامـــدانی کۆبوونـــەوەکانو پێشکەشـــکردنی پێشـــنیازەکانو تاووتوێکردنیان، کۆبوونەوەکان دوا خران بۆ دوای گەڕانـەوەی شـاندی فەرمی حکومەتی عیراق بۆ کۆبوونـەوەکانی قـاهیرە کەتایبـەت بـوو بەپرۆسـەی یـەکگرتنی عـەرەبی سـێ قـۆڵی، کـە بەسـەرۆکایەتی (البکر)ی سەرۆك وەزیران بوو، بەڵام ئەمجارەیان حکومەت قایل نەبوو لەسەر بەشداریکردنی نوێنەرانی کورد لەو سەردانەدا[88].

لەپاش پێنج رۆژ شاندەکەی عیراق لەقاهیرە گەڕایەوەو کۆبوونـەوەو وتووێـــژەکانی دەســـتپێکردەوەو داوایـــان لەشـــاندی کـــوردی کـــرد کەیاداشـتنامەیەکی فـەرمی بەداخوازیـەکانیان لەمـەڕ ئۆتۆنـۆمی ئامادە بکەن[89]. (الموصلي) لەبارەی ئەو یاداشتنامەیەی کـەکورد بـۆ ئـەو مەبەسـتە ئامـادەی کـرد، دەڵێـت: "داڕشـتنی یاداشـتەکە هێمنانەیە، دەربڕینی دیپلۆماسیانەیە، واتاکەی قووڵە، ئامانجەکـەی روونە، هاوسۆزە لەگەڵ خواستەکانی گەلی عەرەبـداو دوورە لـەگیانی وروژاندن یان هەلپەرستی بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوت"[90].

---

شارەوانیو (حازم جواد) وەزیری ناوخۆ بەوەکالەتو (مهـدي الـدولعي) وەزیـری داد. بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٤٦.

[88] بڕوانە، هـ س، ل ١٤٦.

[89] نوێنەرانی حکومەت لەو کۆبوونەوەیەدا بریتی بوون لە: (علـي صـالح السـعدي) جێگری سەرۆك وەزیرانو وەزیری ناوخۆو (صـالح مهـدي عمـاش) وەزیـری بـەرگریو (حردان التكريتي) فەرماندەی هێزی ئاسمانی. بڕوانە، هـ س، ل ١٤٦.

[90] هـ س، ل ١٤٨

## باسی سێیەم

## خستنەڕوو و لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی پرۆژە هەموارکراوەکەی شاندی کورد لە (١٩٦٣/٤/٢٤) دا

لەئەنجامی زنجیرە کۆبوونەوەکانی نێوان هەر سێ دەوڵەتە عەرەبییەکەدا، لە (١٧/٤/١٩٦٣)دا پەیمانی دەوڵەتە یەکگرتووەکەیان لەقاهیرە مۆر کرد، بەڵام نەچووە بواری کارپێکردنەوەو[٩١]، باسی کوردو مافەکانی تێدا نەکرابوو[٩٢].

لە (٢٤/٤/١٩٦٣)دا شاندی کوردی دانوستانکار لەبەغداد پرۆژەیەکی هەموارکراوی پێشنیازەکانی پێشوویان پێشکەش بەحکومەتی عیراق کرد[٩٣]. پێشەکی پرۆژەکە جەختی لەسەر چەند خاڵێك کردۆتەوە کەدەشێت بەم شێوەیە پوختی بکەینەوە:

---

[91] بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٤٩.

[92] بڕوانە، دیڤید ماکداول، س پ، ل ٦٤٧.

[93] بڕوانە، عبدالكريم فرحان، س پ، ل ١٥٨. حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني-العراق (في محطات رئيسية)، ١٩٤٦-١٩٩٣، ط١، مطبعة خەبات، دهوك، ١٩٩٨، ص ص ٢٣٩-٢٤٦. بۆ دەقی پرۆژەکە، بۆ نمونە بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ل ٣١٨-٣٢٤. شازین هێرش، س پ، ل ل ١٦٣-١٦٧. پ.د. جویس بلۆ، س پ، ل ل١٠٤-١١١. شایانی ئاماژە پێدانە کەشاندە کوردیەکە ئاگادار کرانەوە کەهەر لەو رۆژەدا کۆبوونەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، بەڵام بەگەیشتنیان بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە پێیان راگەیەندرا کەسەرۆك وەزیران نووستووە!، لەبەر ئەوە شاندەکە پاش پێشکەشکردنی یاداشتنامەکەیان، بڕیاریان دا کەبگەڕێتەوە کوردستان، بەڵام لەدوای پەیوەندیکردنی (فؤاد عارف) بە (طاهر یحیی)وەو دووپاتکردنەوەی بەڵێنەکانی پێشوویان لەبارەی داواکاریەکانی کوردەوە، شاندەکە لەبەغداد مانەوە. بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ل ٨٦-٨٧.

**١-یەکێتیی ئارەزوومەندانەی نێوان گەلان تەواوترین شێوازی پەیوەندی برایانەی نێوانیانە، بەپێچەوانەشەوە بەدرێژایی مێژو سیاسەتی داگیرکردنو پێکەوە لکاندنی زۆرە ملێی گەلان کێشەو مەینەتیو ململانێی پتری لێکەوتۆتەوە.**

**٢-یەکێتی ئارەزوومەندانە هیچ واتایەکی بابەتیانەی نابێت ئەگەر لەسەر بنەمای دانپێدانان بەمافی گەلانی ناو یەکێتیەکەو پێکەوە ژیانیانو رەخساندنی هەلومەرجی پراکتیزەکردنی ئەو مافانە نەبێت.**

**٣-خۆبەڕێوەبردنی نەتەوەیی تایبەتمەند، لەلایەن گەلانی ناو یەکێتیەکەو لەو چوارچێوەیەدا، باشترین گرەنتیە بۆ بەردەوامبوونی یەکێتیەکە، ئەمە وێڕای ئەوەی کەکرۆكو بنچینەی پتەوی ئەو جۆرە یەکێتیە پێکدێنێت، وەکو لەنمونەی چەند وڵاتێکدا بەرجەستە بووە، کەڵکی یەکێتی ئارەزوومەندانە بەئەندازەیەکە تەنانەت لەوڵاتانێکدا پەیڕەو دەکرێت وەکو شێوازێکی فەرمانڕانی دیموکراسی کە لەرووی نەتەوەییەوە یەکن.**

**٤-بەهرەمەندبوونی گەلانی ناو یەکێتیی ئارەزوومەندانە لەپراکتیزەکردنی مافە نەتەوەییەکانیان لەرێگەی دامودەزگاکانی یاسادانانو جێبەجێکردنی تایبەت بەخۆیانەوە، لەگەڵ لۆجیکی یەکپارچەپیی دەوڵەتدا یەك دەگرێتەوەو یارمەتیدەری گەشەسەندنی دەدات.**

**٥-پەسەندکردنی پرۆژەکەی شاندی کورد لەلایەن حکومەتەوە بەشداریکردنێکی راستەقینە دەبێت لەبەهێزکردنی یەکێتیی عیراقو برایەتی هەردوو گەلەکەیو پاراستنی لەفاکتەرە نێوخۆییو دەرەکیەکانی بێهێزبوونی، ئەمە وێڕای ئەوەی کەئەو هەنگاوە دەریدەخات کە تا چەند حکومەت لەئاستی بەرپرسیارێتیدایە.**

٦-گەلی کورد ئومێدەوارە حکومەت بەڵێنەکانی خۆی لەبارەی دانپێدانانو ڕێزگرتن لەمافە نەتەوەییەکانی، بەمافی چارەی خۆنووسینیشەوە بهێنێتە دی، چونکە ئەمە دەبێتە سەرەتای قۆناغێکی نوێ لەپەیوەندیەکانی نێوان هەردوو گەلدا.

ناوەڕۆکی پرۆژەکە، دیدو بۆچوونی سەرکردایەتی کوردی لەمەڕ پێکهاتەی دەوڵەتی عیراقو جۆری سستمی فەرمانڕانیو بنچینەی پێکەوە ژیانی هەردوو گەلە سەرەکیەکەی عیراقو بنەما یاساییەکانی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دامودەزگاکانی حکومەتی ناوەندیو ئەوانەی کەتایبەت دەبن بەناوچەی کوردستانو جۆرو ئەندازەی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی خستۆتە روو، کەدەشێت تەوەرە سەرەکیەکانی بەم شێوەیە چڕ بکەینەوە:

أ-کۆماری عیراق دەوڵەتێکی یەکگرتووەو لەدوو نەتەوەی سەرەکی عەرەبو کورد پێکدێت کەمافی یەکسانیان هەیەو ویستی خۆیان بۆ پێکەوە ژیان لەسەر بنەمای مافی چارەی خۆنووسین دەربڕیوە.

ب-پێویستە لەدەستوردا دەق لەسەر پەرلەمانی نیشتمانیو سەرۆك کۆمارو دەسەڵاتی جێبەجێکردن هەبێت، هەروەها بەو شێوەیەش بۆ دامودەزگا نەتەوەییەکانی تایبەت بەگەلی کورد لەکوردستاندا لەبوارەکانی یاسادانانو جێبەجێکردنو دادوەریدا.

ت-دەستنیشانکردنی ئەو بوارانەی کە لەتایبەتمەندیو دەسەڵاتەکانی حکومەتی ناوەندیدا دەبێت کە لەسیازدە خاڵدا چڕ کراوەتەوە.

پ-گەلی کورد لەرێگەی دامودەزگای ناوچەیی هەڵبژێردراوی تایبەت بەخۆیەوە مافەکانی پراکتیزە دەکاتو ئەو کاروبارانە بەڕێوە دەبات کە لەدەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا نیە.

ج-دەستنیشانکردنی سەرچاوە داراییەکانی دامودەزگاکانی ناوچەی کوردستان.

ح-دەستنیشانکردنی سنووری جوگرافی-رامیاری ناوچەی کوردستان بەهەموو ئەو ناوچانەی کەگەلی کورد بەنیشتمانی خۆی دەزانێت.
خ-جێگری سەرۆك کۆمار کورد بێتو، لەلایەن گەلی کوردەوە هەڵدەبژێردرێت، هەر بەو رێوشوێنەی کەسەرۆك کۆماری پێهەڵدەبژێردرێت.
د-پێویستە دەستوری تایبەت بەدامودەزگاکانی ناوچەی کوردستان مافە جۆراوجۆرەکانی کەمینە نەتەوەییو ئاییینیو رەگەزیەکانی ناوچەکە بسەلمێنێتو پرنسیپی یەکسانی لەمافو ئەرکەکاندا لەخۆ بگرێت.
لەتەوەرەی تایبەت بە بەندە گشتیەکاندا، پرۆژەکە چەند خاڵێکی تری گرنگی لەخۆ گرتبوو، کەلێرەدا پوختەکەی دەخەینە روو:
١-پێویستە گەلی کورد نوێنەرایەتی بکرێت لەهەموو دامودەزگاکانی یاسادانانو جێبەجێکردنی حکومەتی ناوەندیداو دامەزراندنی فەرمانبەرانو وەرگرتنی خوێندکارانی کورد لەزانکۆو پەیمانگا مەدەنیو سەربازیەکانی عیراقداو ناردنیان بۆ خوێندن لەدەرەوەی وڵات لەسەر بنەمای رێژەی هاووڵاتیانی کورد لەکۆی رێژەی هاووڵاتیانی عیراقدا.
٢-یەکێك لەیاریدەدەرانی سەرۆك ئەرکانی سوپای عیراق کورد بێتو، لەباری گۆڕانی ناوی سوپای عیراق، پێویستە ناوی بەشە کوردیەکەی (فەیلەقی کوردستان) بێتو، کورد خزمەتی سەربازی لەکوردستاندا ئەنجام بداتو ئەوانەی بەهۆکاری رامیاریو نەتەوەییەوە لەسوپا دەرکراون بگەڕێندرێنەوەو، حکومەتی ناوەند بۆی هەیە لەباری دەستدرێژی یان هەڕەشەی دەرەکیدا هێزی پتر رەوانەی کوردستان بکات یان باری نائاسایی رابگەیەنێت، بەڵام لەباری

ئەنجامــدانی ئەركــە ئاســاییەكانی، پێویســتە ڕەزامەنــدیی هــەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو جێبەجێكردنی كوردستان وەربگرێت.

٣-هــەر دەقێكــی یاســایی كەببێتــە مایــەی كــۆتكردن یــان كەمكردنەوەی مافە نەتەوەییو دیموكراتییەكانی گــەلی كــورد دەبــێ بەپوچەڵ دابنرێت.

٤-ڕاســپاردنی یــەكێك لــەوەزیرە كوردەكــانی بــەپێكهێنانی ئەنجومەنی كاتیی جێبەجێكردن تــا كــاتی ئەنجامــدانی هەڵبــژاردنی ئەنجومەنی یاسادانان لەماوەی چوار مانگی دوای پێكهێنانیدا.

٥-قەرەبووكردنەوەی ئــەو كوردانــەی كــە بــەهۆی سیاســەتەكانی حكومەتی (قاسم)ەوە زیانیان لێكەوتووە.

٦-لەباری گۆڕینی ڕەگەزنامەی عیراقــی بــۆ عــەرەبی، پێویســتە تایبەتمەندیــەكانی هاوولاتیــانی كوردســتانو ئەوانــەی ڕەچــەڵەكیان كوردە لەبەڵگەنامە فەرمیەكاندا ڕەچاو بكرێت.

٧-لەباری گۆڕینی ئاڵا یان دروشمی دەوڵــەتی عیراقــەوە پێویســتە هێمایەكی گەلی كوردی بخرێتە سەر. لەلێكدانەوەی نــاوەڕۆكی پــرۆژە هەمواركراوەكەدا تێبینی دەكەین كەسەركردایەتی كوردی لەپێناو پتر نەوروژانــدنی حكومەتــدا، چــەمكی ئۆتۆنۆمیــان بەكارنــەهێنا، هەرچەندە ناوەڕۆكی پرۆژەكە گوزارشت لــەو چــەمكە دەكــات، بــەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حكومەت وتووێژی لەسەر پرۆژەكە نەكرد[٩٤].

هەر لەكۆتاییی مانگی نیسانەوە بــەرایی نیــازی حكومــەت بــۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی توندوتیژی لــەبری چارەســەری دیپلۆماســیانە لــەجاران پــتر دەركــەوتو[٩٥]، لــەدوای (١٥/٥/١٩٦٣)ەوە چــەند

---

94 بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٤٩. شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٨٤.

95 بڕوانە، مسعود البارزاني، س پ، ل ٩٢.

رووداوێك كەوتەوە كەهێما بوو بۆ نیازو ئامادەكاریەكانی حكومەت بۆ ئۆپەراسیۆنی سەربازیو، لە (١٩٦٣/٥/٢٠)دا فەرمانی سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بەسەر كوردستاندا لەلایەن فەرمانداری گشتی سەربازیەوە دەرچوو[٩٦].

پاش ئەوەی كەسستی كەوتە دانوستانەكەوە، (تالەبانی) داوای بینینی سەرچاوەیەكی فەرمی حكومەتی كرد، دواتر ئەو دیدارەی لەگەڵ (البكر)ی سەرۆك وەزیراندا بۆ سازبوو، ئاستەنگەكانی بەردەم شاندی كوردی لەبەغداد بۆ روون كردەوەو ناوبراو پێی راگەیاند كەداخوازیەكانیان رەوانەی میسرو سوریا كراوە بۆ تاوێتەكردنی بۆچوونیان لەو بارەیەوە، كاتێك شاندەكە داوایان كرد كەرێگەیان پێبدرێت بەفڕۆكە بچنە قاهیرەو داواكاریەكانی گەلی كورد بۆ (عبدالناصر) روون بكەنەوە، (البكر) داواكاریەكەی پەسەند كردو[٩٧]، لەمانگی مایسدا (تالەبانی)و (هاشم عقراوی) سەردانی (عبدالناصر) یان كردو لەئاكامدا جۆرێك لەهاوسۆزی بۆ داواكارییەكانیان دەربڕی[٩٨]. لەگەڵ ئەوەشدا شاندی كوردی لەبەغداد هەر لەسەرەتای مانگی حوزەیرانەوە هیوایان بەگەیشتن بەرێككەوتنێك كز بوو، چونكە بۆیان دەركەوت حكومەت خۆی لەوتووێژی راستەقینە دەدزێتەوەو پاساوی جۆراوجۆری بۆ دەهێنێتەوەو ئەندامانی شاندەكەی خستۆتە ژێر چاودێریەوەو لەوانەیە لەهەر ساتێكدا بێت بەدەستگیركردنیان كۆتایی بەدانوستانەكە بهێنێتو، بۆ

---

[96] بڕوانە، هـ س، ل ٩٦.

[97] بڕوانە، شلومو نكدیمون، س پ، ل ٨٨.

[98] بڕوانە، دانا ادمز شمیدث، س پ، ل ٣٨٠، شلومو نكدیمون، س پ، ل ٨٨. منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٠.

ئەو مەبەستەش نارەزاییان گەیاندە (البکر) کەدواتر فەرمانیدا چاودێریان لەسەر سووك بکەن[٩٩]، بەلاّم بارودۆخەکە بەگشتی روو لەئالّۆزی بوو، بەتایبەتیش پاش ئەوەی دووبەرەکی نێوان سەرکردایەتی هەرێمایەتی حزبی بەعس لەسەر کۆمەلّە بابەتێك کەدۆزی کورد یەکێکیان بوو لەجاران توندتر بوو[١٠٠]. لەم سەروبەندەدا نامەیەکی نهێنیان بۆ سەرۆکی شاندەکەیان (تالّەبانی) نارد کە لەرێگەی گەرانەوەیدا گەیشتبووە بەیروتو تێیدا ئاگاداریان کردەوە کەنەگەرێتەوە بۆ بەغداد، لەبەر ئەوە ناوبراو بریاریدا هەر لەوێوە بۆ ئەوروپا بچێتو درێژە بەخەباتی بدات[١٠١].

حکومەتی بەعس پاش ئەوەی ئاراستەی رووداوەکانی بەرەو ململانێی سەربازی برد، لەهەنگاوێکی سیاسیداو بۆ رێگەخۆشکردنو پاساو هێنانەوەیەك بۆ هەنگاوە سەربازیەکانی داهاتووی، لیژنەیەکی لەپێنج وەزیرو ژمارەیەك سیاسەتوان پێکهێنا بۆ ئامادەکردنی پرۆژەیەك بۆ سستمی بەرێوەبردنی ناناوەندێتی لەعیراقداو دوای ئامادەکردنی، لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە لە (١/٦/١٩٦٣) دا پشت راست کرایەوە[١٠٢]. پرۆژەکە لەژێر ناونیشانی

---

99 بروانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ٨٨.

100 بروانە، منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٥٠-١٥١.

101 بروانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ٨٨. منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٠.

102 بروانە، محمود الدرة، س پ، ل ٣٢٥. د. علی کریم سعید، س پ، ل ٢٥٣. ئەندامانی لیژنەکە بریتی بوون لە: (فریق رکن صالح مهدی عماش وەزیری بەرگری، عمید رکن ناجی طالب وەزیری پیشەسازی، عمید رکن محمود شیت خطاب وەزیری شارەوانی، حازم جواد وەزیری ناوخۆ بەوەکالەت، مهدي الدولعي وەزیری داد، شێخ محمد رضا الشبیبي سەرۆکی پارتی بەرەی میللی هەلّوەشاوە، پارێزەر فائق السامرائي جێگری سەرۆکی پارتی سەربەخۆی هەلّوەشاوە، پارێزەر حسین جمیل

(سستمی كارگێڕیی ناناوەندی لەعیراقدا) گەڵاڵە كراو چەند تەوەرەیەكی سەرەكی لەخۆگرتبوو كەدەكرێت بەم شێوەیە پوختی بكەینەوە[103]:

لەپێشەكیەكەیدا ئەوە روون كراوەتەوە كەدەركردنی ئەم سستەمە جێیەجێكردنی ناوەرۆكی ئەوە بەیاننامە كاتیەیە كە لەلایەن (ئەنجومەنی نیشتمانی سەركردایەتی شۆڕش)ەوە لە (١٥/٣/١٩٦٣)دا راگەیاندراوەو ئامانجەكەی دابەشكردنی كارگێڕی عیراقە بۆ چەند پارێزگایەك. دواتر باس لەپێناسەی پارێزگاو پێكهاتەكەی‌و ئەرك‌و دەسەڵاتەكانی ئەنجومەنی پارێزگاو سەرچاوەكانی داهات‌و بوارەكانی خەرجكردن‌و چەند بنەمایەكی گشتی كەتایبەتە بەرێكخستنی جۆری پەیوەندی یاسایی نێوان ئەنجومەنی وەزیران‌و ئەنجومەنی پارێزگاو كاركردن بەو بنەما یاساییە كارگێڕیانەی خۆجێیەتی ژمارە (١٦)ی ساڵی ١٩٤٥ كەلەگەڵ بنەماكانی یاسای نوێی بەڕێوەبردنی پارێزگاكاندا دژ ناوەستێتەوە.

پاشكۆی ژمارە (١)ی پرۆژەكە بۆ دوو تەوەرەی سەرەكی تەرخان كراوە، یەكەمیان دابەشكردنی عیراق بەسەر شەش پارێزگاداو، دووەمیان دەستنیشانكردنی رێوشوێنی بەكارهێنانی زمانی كوردی لەپارێزگای سلێمانیدا. بەڵام لەپاشكۆی ژماری (٢)دا خشتەیەك بەئەرك‌و دەسەڵاتەكانی ئەنجومەنی پارێزگا لەهەموو بوارە ناڕامیاریەكاندا هاتوە. لەئاكامی شیكردنەوەی ناوەڕۆكی پرۆژەكەو

---

سكرتێری گشتی پارتی نیشتمانی دیموكراسی هەڵوەشاوە، دكتۆر عبدالعزیز الدوری سەرۆكی زانكۆی بەغداد. علي حیدر سلیمان باڵیۆزی عیراق لەواشنتۆن. بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ٣٢٥.

[103] بۆ دەقی پرۆژەكە، بۆ نمونە بڕوانە، محمود الدره، س پ، ل ل ٣٢٦-٣٣٤.

ئامانجەکانی حکومەت لەدەرکردنیدا بەشێوەی سستم، چەند ئەنجامو سەرنجێکمان لەلا گەڵاڵە بوە کەگرنگترینیان ئەمانەن:

١-لەپێکهاتەی لیژنەی فەرمیی دارشتنی پرۆژەکەدا دەردەکەوێت کەنیوەیان کادری سەربازینو گۆشکراوی لۆجیکی دامودەزگا سەربازیەکانن، ئەم راستیە کاریگەری خۆی لەسەر ناوەرۆکی پرۆژەکەو جۆری ئەو چارەسەرەی بۆ دۆزی نەتەوەیی کوردیان خستە روو بەجێهێشت، هەروەها ئەم جۆرە پێکهاتەیە رووبەکی جۆری سستمی فەرمانڕانی لەعیراقدا روون دەکاتەوە، ئەوەش ئەوەیە کەدامودەزگای سەربازی جڵەوی کاروباری رامیاری وڵاتی بەدەستەوەیە.

٢-بەشداریکردنی ژمارەیەك لەئەندامانی شاندە میللییەکەی پێشو لەلیژنەی دارشتنی پرۆژەکەدا دروستی ئەو گومانەی کەپێشووتر دەرمانبڕی لەبارەی بێلایەن نەبوونی رۆڵی ئەو شاندە لەخولەکانی وتووێژەکانی پێشووتردا دەسەلمێنێت، وە لەراستیدا پێکهێنانی ئەو لیژنەیە بەشێك بوو لەسیاسەتو سیناریۆی حکومەت بۆ دابەشکردنی رۆڵو ئەرکەکان بەسەر شاندە فەرمیو شاندە میللیەکەداو، بەو شێوەیەش حکومەت توانی چەند لایەنێکی ناو عیراق بکاتە هاوراو هاوپەیمانی خۆی لەو پرۆسەیەداو رای گشتی کوردیو عیراقیو نێودەوڵەتی بەوە چەواشە بکات کەهەنگاوو پرۆژەکانی حکومەت لەو بارەیەوە مۆرکێکی سەرتاسەری نیشتمانی لەخۆ گرتووە.

٣-لەناوەرۆکی پرۆژەکەدا ئەو راستیە ئاشکرا دەبێت کەئەو چەمکی ناناوەندێتیەی کە لەبەیاننامەکەی (١٥/٣/١٩٦٣)ی حکومەتدا هاتبوو لەفۆرمێکی نیوەچڵی یاسای پارێزگاکان تێپەڕی نەکردو حکومەت ئامادە نەبوو هیچ پرۆژەیەکی رامیاری دادپەروەرانە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی کورد بخاتە روو، هەروەها ناوەرۆکی

پرۆژەکە هیچ مۆرکێکی سیاسیی لەخۆ نەگرتبوو، ئەو سستەمەی کەحکومەت رایگەیاند تەنها فۆرمێکی کارگێڕی بوو، پەیوەندی بەشێوازی رێکخستنی دەسەلاتی کارگێڕی دەولەتەوە هەبوو، لەقەرەی یەکێتی یاسایی یان رامیاری دەولەت نەکەوت[١٠٤]. بەو شێوەیە حکومەت توانی ئەو ماوەیە گەلی کوردو سەرکردایەتیەکەی بەدەمەوە بگرێتو کات بەدەست بهێنێتو بۆ خۆرێکخستنو خۆ سازدان لەهەموو رووەکانەوە کەلکی لێوەربگرێت.

٤-ئەو سستمە فۆرمێکی رێکخستنی کارگێڕی تایبەت بەکوردستان نەبوو، بەلکو لەسەر ئاستی هەموو عیراق بوو، لەبەر ئەوە پرۆژەکە نە چارەسەر بوو بۆ دۆزی نەتەوەیی کوردو نەهیچ تایبەتمەندیەکی نەتەوەیی گەلی کوردی تێدا رەچاو کرابوو.

٥-ئامانجی حکومەت لەدەرکردنی ئەو سستمە لەلایەك بەدەستهێنانی کاتو لەلایەکی ترەوە چەواشەکردنی رای گشتی نێوخۆییو نێودەولەتی بوو بەوەی کەچارەسەری گونجاوی بۆ دۆزی نەتەوەیی کورد داناوە، لەبارێکدا ئەگەر کورد پێی قایل بوون، ئەوا حکومەت بەکورتترین رێگەو کەمترین تێچوونو لەچوارچێوەی فۆرمێکی کارگێڕیدا گەورەترین کێشەی نێوخۆیی لەکۆلْ خۆی دەکاتەوە، بەلام ئەگەر پێی قایل نەبوون، ئەوکاتە حکومەت پاساوی دەهێنایەوە بۆ گرتنەبەری هەر رێوشوێنێکی ترو بەو کارەشی رمێنی بۆ پرۆسەی سەرکوتکردنی گەلی کورد دەهێنایەوە.

٦-ئەرکو دەسەلاتەکانی ئەنجومەنی پارێزگا تەنها کارگێڕیو جێبەجێکردنەو ئەنجومەنی وەزیران دەسەلاتی رەهای بەسەر ئەنجومەنی پارێزگادا هەیە.

---

[104] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٨٥.

٧-لەئەنجامی دابەشکردنی عیراق بەسەر شەش پارێزگادا، دەردەکەوێت کە بەلای حکومەتەوە ناوچەی کوردستان تەنها پارێزگای سلێمانی دەگرێتەوە کە لە(لیوای سلێمانی بەچەمچەماڵەوەو، لیوای هەولێرو، لیوای دهۆك) پێکدێت، بەمەش حکومەت کەرکوکی (جگە لەچەمچەماڵ) خستە دەرەوەی سنووری ناوچەی کوردستانەوە.

٨-هەر لەسەر بنەمای دەستنیشانکردنی سنووری پارێزگاکان بەو شێوەیەی ئاماژەی پێدرا، مافە زمانەوانیەکانی گەلی کوردی بەجۆرێك سنووردار کرد کەزمانی کوردی تەنها لەپارێزگای سلێمانیدا زمانی رەسمیەو خوێندن بەو زمانە لەپارێزگاکەدا تەنها هەردوو قۆناغەکانی سەرەتایی‌و ناوەندی دەگرێتەوەو زمانی عەرەبیش وەکو دووەمین زمان دەخوێندرێت، بەلاَم لەهەموو قۆناغەکانی سەرووتردا خوێندن تێیدا تەنها بەزمانی عەرەبی دەبێت.

هاوکات حکومەت هەر لەدرێژەی سیاسەتەکانیدا بۆ ئالۆزترکردنی دۆخەکەو ئاراستەکردنی رەوشەکە بەرەو رووبەرووبونەوەی سەربازی، هەر لە(٦/٦/١٩٦٣)ەوە بەتایبەتیش لەشەوی (٩-١٠/٦/١٩٦٣)دا نمایش‌و ئۆپەراسیۆنی سەربازی ئەنجام داو پاشان لەکردەوەیەکی رەشەکوژیدا ژمارەیەکی زۆری هاوولاَتیانی کوردی سیڤلی تەمەن جیاوازی لەشاری سلێمانیدا گرت‌و (٨٦)ی لێ زیندەبەچاڵ کردن[١٠٥]. لە (٦/٦/١٩٦٣)دا شاندی کوردی بەسەرۆکایەتی (صالح یوسفی) بەوەکالەت‌و لەسەر داوای خۆیان چاویان بە (البکر)کەوت‌و هەوڵی دڵنیاییکردنەوەی شاندەکەی داو

---

[105] بڕوانە، مسعود البارزانی، س پ، ل ٩٦، دیڤید ماکداول، س پ، ل ٦٥٠. ابراهیم جلال، س پ، ل ١٠٦. د. علی کریم سعید، س پ، ل ل ٢٦٥-٢٦٦. شلومو نکدیمون، س پ، ل ل٨٨-٨٩.

پێشنیازی نوێی پێراگەیاندن، بەڵام حکومەت سووربوو لەسەر ئەوەی کەپێویستە (بارزانی) لەم پێشنیازە ئاگادار بکەنەوە، لەبەرامبەردا (یوسفی)پێی راگەیاندن سەرکردایەتی کورد رایسپاردوون پێشنیازەکانی پێشووی حکومەت رەت بکەنەوەو، ئەم پێشنیازە نوێیەش شتی نوێی تێدا نیە[١٠٦]. لە (١٩٦٣/٦/٨)دا کۆبوونەوەیەکی تر ئەنجام دراو رادەیەك گەشبینی بە(یوسفی) بەخشیو، داوای لەحکومەت کرد کەرێگەی سەردانی (بارزانی) پێبدەنو، لەو ئێوارەیەدا (طاهر یحیی) بەڵێنی دا کە بەفرۆکە شاندەکە بەرێ بکەنو، لە (١٩٦٣/٦/٩) دا بەفرۆکە شاندەکەیان بۆ زیندان نەك بۆ کوردستان گواستەوە[١٠٧]!. هاوکات حکومەت لەبروسکەیەکی هەڕەشە ئامێزدا داوای چەکدانانو خۆ بەدەستەوەدانی بێ مەرجی سەرکردایەتیو هێزی پێشمەرگەی کوردستانی لەماوەی بیستو چوار کاژێردا کردو[١٠٨]، لەدواتردا حکومەت بەناوی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ەوەو لەبەیاننامەیەکی سەربازیدا داوای چەکدانانی بزووتنەوەی کوردی کردو هاوکار دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکانی سوپای عیراق، واتە جەنگی جینۆسایدی لەدژی گەلی کورد راگەیاندو[١٠٩]، تێیدا بڕیار لەسەر ئەوە درا

---

106 بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ل٨٨-٨٩.

107 بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ٨٩. منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٢. مسعود البارزاني، س پ، ل ٤٨٨. د. عبدالفتاح علی یحیی البوتاني، س پ، ل ٢٢٣. دیڤید ماکداول، س پ، ل ٦٥٠. د. کاوس قفطان، س پ، ل ٢٣٠.

108 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ٢٣٠.

109 بۆدەقی بەیاننامەکە بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١٥٩. بۆ زانیاری پتر بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل٨٥.

کەهەموو ناوچەکانی کوردستان بەناوچەی جموجۆڵی راستەقینەی سەربازی دانرا[110]. حکومەت بۆ رەواییدان بەو هەنگاوەی، تۆمەتی ئەنجامدانی چەند پێشێلکاریەکی خستە پاڵ سەرکردایەتی کوردو هێزی پێشمەرگەی کوردستان[111]. لێکدانەوەی حکومەت بۆ هەلومەرجەکە لەم قۆناغەدا، گەیاندیە ئەو بڕوایەی کەتەرازووی هێزەکان بەئەندازەیەکی یەکجار گەورە بەلای خۆیدا شکاوەتەوەو دەرفەتی لەباری بۆ رەخساوە کە لەرێگەی پەنابردنەبەر رێوشوێنی سەربازی کۆتایی بەکێشەی کورد بهێنێت، بەرادەیەك کە (عماش) لەلێدوانێکیدا بە لەخۆباییبوونەوە ئۆپەراسیۆنی سوپای عیراقی لەکوردستاندا بەسەیرانێکی نیشتمانی ناوبرد[112]. حکومەت لەهەنگاوێکی تریداو بەمەبەستی پەرتکرنی ریزەکانی سەرکردایەتیی کورد، هەر یەك لە(مسعود محمدو شێخ حسینی خانەقاو صمد محمدو بابکر پشدەری) ئازادکردو رایسپاردن کەنامەیەکی حکومەت بگەیەننە دەستی هەندێك لەسەرۆك عەشیرەتەکانو بیرۆی رامیاری پارتی، لەبارەی ئارەزووی حکومەت بۆ وتوویژکردن لەگەڵیاندا بەبێ (بارزانی)، بەڵام ئەندامانی تری شاندەکەی لەزینداندا هێشتەوەو دوچاری ئەشکەنجەدانی کردن هەتا رۆژی ئازادکردنیان لەدوای

---

110 بڕوانە، مسعود البارزانی، س پ، ل ل ٩٦، ٥٠٦، پاشکۆی ژمارە (١٥)ی سەرچاوەکە، د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل ٢٢٣.

111 بڕوانە، دیڤید ماکداول، س پ، ل ٦٥٠. لەبارەی ئەو پێشێلکاریانەی کە لەبەیاننامەکەدا هاتووە، بۆ نمونە بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٣٨-٣٤٠.

112 بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ٩٠. د. کاوس قفطان، س پ، ل ٢٤٣. مسعود البارزانی، س پ، ل ٩٦.

ڕێککەوتنی ئاگربەستەکەی (١٠/٢/١٩٦٤)ەوە[١١٣]. ئەو شێوازە ڕەفتارەی حکومەت لەگەڵ شاندە کوردیەکەدا، وێڕای ئەوەی کەدژە لەگەڵ بنەماکانی یاساو نەریتی دانوستاندا، ئاراستەی پەیوەندیەکانی نێوانیانی لەریشەوە گۆڕیو ڕێوشوێنەکانی سەربازی بەتەواوی جێگەی ڕێوشوێنە دیپلۆماسیەکانی گرتەوە.

جەنگی کوردستان بەدرێژایی ماوەی نێوان (١٠/٦/١٩٦٣-١٨/١١/١٩٦٣)ی بەردەوام بوو بەبێ ئەوەی حکومەت ئەو سەرکەوتنە سەربازیە یەکلاکەرەوەیەی کەخۆی پێشبینی دەکرد بەدەست بهێنێتو، لەئاسۆشدا هیچ هێمایەك بۆکۆتاییهاتنی شەڕو دەستپێکردنەوەی وتووێژەکان بەدی نەدەکرا[١١٤]. هەر لەدووەمین ڕۆژی ئەو جەنگەدا (عبدالسلام عارف)ی سەرۆك کۆمار سەردانی کەرکوكو هەولێری کردو گوتەیەکی لەبەردەم سوپادا پێشکەش کردو تێیدا ڕایگەیاند کەخۆی لەبەرەکانی پێشەوەی جەنگەکەدا سەرکردایەتی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکان دەکاتو هەموو تواناکانیش لەو بوارەدا دەخرێتە گەڕ[١١٥].

جەنگەکە بەئەندازەیەك فراوان بوو کەرێژەی (٨٠٪)ی سوپای عیراقیو هەزاران چەکداری تری نانیزامی تێیدا بەشدار بوون[١١٦]، ئەمە وێڕای ئەوەی کەسوپای سوریاش بە (٥٠٠٠) پێنج هەزار

---

113 بڕوانە ،مسعود البارزاني، س پ، ل ٤٨٨.

114 بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٣. بۆ وردەکاریەکانی ئەو جەنگە، بۆ نمونە بڕوانە، مسعود البارزاني، س پ، ل ل ٩٩-١٢١.

115 بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٣.

116 بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ٢٥٦.

چەكداری فەوجی یەرموك بەشداری تێدا كردو[117]، لەوەش پتر گەلەكۆمەكێی نێودەوڵەتیی ئێرانو توركیاو سوریاو عیراقو ئەمریكاو وڵاتانی تری پەیمانی سەنتۆ لەتەمووزی ١٩٦٣دا لەچوارچێوەی (پرۆسەی دیجلە)دا چوارچێوەی جەنگەكەی فراوانتر كردو بەو شێوەیەش رەهەندی عەرەبیو نێودەوڵەتیی لێكەوتەوە[118].

حكومەت لەگەرمەی جەنگەكەدا دوو هەنگاوی بەئاراستەی جیاوازو بۆیەك مەبەست نا، یەكەمیان پێكهێنانی (ئەنجومەنی باڵای بەرگری هاوبەش) لەگەڵ سوریا لە (٢٢/٩/١٩٦٣)دا وەكو پێشتر ئاماژەمان پێداو، دووەمیان داوای ئاگربەستی لەسەركردایەتی كورد كردو لەو بارەیەوە لەبروسكەیەكی (لیوای روكن ابراهیم فیصل الانصاري) فەرماندەی تیپی دووەمدا كە بۆ (طاهر یحیی) ی سەرۆك ئەركانی سوپای نارد پێشنیازی رێگەچارەی ئاشتی كرد، ناوبراویش رەزامەندی دەربڕیو (الانصاري) راسپارد كەپەیوندی بە (شێخ احمد بارزانی)ەوە بكاتو لەهەڵوێستی ئەو تێبگات. (الانصاري) لەرێگەی نامەیەكەوە بە (اسعد شێتنە)دا ناردی كەیەكێك بوو لەئاغاكانی رەواندوز، داوای لە (شێخ احمد) كرد كەنوێنەریان بۆلای خۆیو پارێزگاری هەولێر بنێرێت بۆ وتووێژكردن لەو بارەیەوە، (شێخ احمد)یش پاش بیروڕاگۆڕینەوە لەگەڵ (بارزانی) لە (٢٣/٩/١٩٦٣)دا بەنامەیەكو ناردنی سیان لەئەندامانی بنەماڵەكەیان. وەڵامی (الانصاري) یان بەئەرێی دایەوە، بەمەرجێك حكومەتیش لەلایەن خۆیەوە ئاگربەست بكاتو هێزەكانی لەناوچەی

---

117 بڕوانە، د. سعد ناجي جواد، س پ. ل ٨٤. د. كاوس قفطان. س پ، ل ٢٥٩. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٩٧-٩٨.

118 بڕوانە، منذر الموصلي، س س، ل ١٥٦.

بارزان بکێشێتەوە! لەئاکامدا لەسەر ئاگربەستو کشانەوەی ئەو هێزانە هەنگاو بەهەنگاو لەناوچەی بارزان، ڕێك کەوتنو لەناوەڕاستی مانگی تشرینی یەکەمدا پرۆسەی کشانەوەکە ئەنجام دراو هێمنی تەنها ناوچەی بارزانی گرتەوە[119]. ئەمەش ئەو ڕاستیە دەردەخات کەمەبەستی (بارزانی) لەو هەنگاوەیدا بەدیهێنانی ئامانجێکی کاتییو تاکتیکی بوو، بەبەراورد لەگەڵ ئامانجو دروشمە ڕاگەیاندراوەکانی بزووتنەوەکەدا.

لەبارەی هاوکاریکردنی ڕامیاریو سەربازی سوریاوە بۆ عیراق لەو سەردەمەدا لەو ڕاستیەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەهەردوو وڵاتەکەدا پارتی بەعس فەرمانڕانی دەکردو پێشتریش لەبواری هاریکاری سەربازیدا دوو هەنگاویان نابوو، یەکەمیان پێکهێنانی (ئەنجومەنی باڵای بەرگری هاوبەش) لە (٢٢/٩/١٩٦٣)داو دووەمیان بەستنی ڕێککەوتننامەیەکی سەربازی هاوبەشو پێکهێنانی سەرکردایەتیەکی هاوبەشی سوپای هەردوو وڵاتەکە لە (٩/١٠/١٩٦٣)دا[120]. بە بۆچوونی (الموصلي) بڕیاری بەشداریکردنی سوپای سوریا لەو جەنگەدا بڕیارێکی مەترسیدار بوو، وە ئاکامەکانی بەوردی لێکنەدرابۆوەو هەڵەیەکی تاکتیکی گەورە بوو[121].

شایانی ئاماژە پێدانە کە (عبدالسلام عارف) پێشترو هەر لەکۆتایی مانگی ئابەوە هەتا ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٣)دا لەهەنگاوێکی نهێنیو بەبێ ئاگاداریی بەعسیەکانو

---

[119] بۆ ئەو زانیاریانەو دەقی نامەکەی (شێخ احمد بارزانی) بڕوانە، مسعود البارزاني، س پ، ل ١١٧.

[120] بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٤.

[121] بڕوانە، هـ س، ل ل ١٥٤-١٥٥.

بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆو لەڕێگـەی عەمیـد (عبـدالرزاق محمـود عمر)ی پارێزگاری سلێمانیەوە پەیوەندیان بەپارتیەوە کـرد لەڕێگـەی (نوری احمد طه)ی ئەندامی لیژنەی ناوەندیـەوە، بـەو شـێوەیە نامـە گۆڕینەوە لەنێوان هەردوو نوێنەردا ئـەنجام درا، بـەڵام سـەرەنجام ئـەو پەیوەندیانـە هـیچ ئاکامێکیـان لێنەکەوتـەوە[122]. ئـەوەی جێگـەی تێبینی‌یە ئەوەیە کەئەم هەنگاوەی هەردوو لایەن لەو بـوارەدا نایـان، لەپاش شکستهێنانی ئەزموونی وتووێژە دووروودرێـژەکانی نێوانیـان‌و دواتر قووڵبوونەوەی ململانێ سەربازیەکانی نێوانیان‌و گەیشـتنی بـە ئاستێکی ترسناك ئەنجام درا. دیارە هۆکاری سەرەکیی ئەو هەنگاوەیان دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی جەنگەکە لەسـەر توانـای هەمەلایەنـەیی هەردوو لایەنیان، بەتایبەتیش لەرووی توانای سەربازیەوە، لەبەر ئەوە مەبەستیان رەخساندنی دەرفەتێك بـوو بـۆ وچـان‌و خۆسـازدانەوە بـۆ خولێکی تری جەنگ‌و توندوتیژی، هەروەها حکومەت ئەوەی بەهـەل زانی تاوەکو قورسایی‌ی سەربازی خۆی بخاتە سەر بەرەکانی تـر. هـەر بەو شێوەیەش سەرکردایەتی‌ی کورد پێویستی بەناوچەیەکی دەرەتـان هەبوو بۆ مانەوەو بەرگریکردن لـەناو کوردسـتاندا، بەتایبـەتی لـەو هەلومەرجە دژوارەدا کەژمارەیەك لـەوڵاتانی وەکـو سـوریاو ئێـران‌و تورکیاو یەکێتی سۆڤێت‌و بەریتانیاو ئیسپانیاو پاکستان پشتیوانیان لەحکومەتی عیراقی دەکردو پێداویستیەکانیان لەکەرەستەی جەنگی بۆ دابین دەکرد، چ بەفرۆشتن بێـت یـان پێبەخشـین وێـڕای یارمەتیـە هەواڵگری‌و لۆجستیەکان[123].

---

[122] بڕوانە، د. عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، س پ، ل ٢٢٣. بۆ دەقـی نامـەکان بڕوانە، هـ س، ل ل ٢٢٤-٢٢٦.

[123] لەبارەی ئەو هاوکاریە سەربازیانەوە، بۆ نمونە بڕوانە، مسعود البارزانی، س پ، ل ل ٩٧-٩٩. عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١٥٨. د. علـی کـریم سـعید، س پ، ل

سەبارەت بەهەڵوێستی میسریش لەسەردەمی (عبدالناصر)دا، وا دیـارە کەسیاسـەتێکی دووفـاقی پـەیڕەو دەکـرد، لەلایـەك داوای دوورکەوتنەوەی لەجەنگو گرتنەبەری ڕێگـەی دیپلۆماسـی دەکـردو لەزۆر بۆنەدا ئەوەی بۆ هەردوو لایەنی عیراقیو کوردی دەربڕیـوەو[١٢٤]، لەلایەکی ترەوە بەنهێنی داخوازیەکانی ئەو کاتـەی وەزیـری بـەرگری عیراقی لەمەڕ چـەكو تەقەمـەنی پێویسـت بـۆ جـەنگی دژە کـورد بەجێهێنا[١٢٥]. هەر لـەو بارەیـەوە (نکـدیمون) دەڵێـت (عبدالناصـر) لەکۆبوونـەوەی جوداییـدا لەگـەڵ هەریـەك لـەو دوو لایەنـەدا راو بۆچوونی جیاوازی دەربڕیوە[١٢٦].

هـەر لـەبارەی هەڵوێسـتی ئـەو وڵاتانـەی ئاماژەمـان پێـدان راو بۆچوونی جیاواز هەیە، بۆ نمونە (تالب شبیب) دەڵێـت: "حکومـەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـەدژی شـەڕەکە بـوو، هـەروەها یەکێتی سۆڤێتیش، حکومەتی بـەریتانیا تەحـەفوزی کـرد، ئێـرانو تورکیا بەپەرۆش بوون بۆ بەردەوامبوونی"[١٢٧]. لەراستیدا هەڵوێسـتی یەکێتی سۆڤێتیش لەبارەی جـەنگی عیراقـەوە لـەدژی گـەلی کـورد دووفاقی بـوو، لەلایەکـەوە زۆر بەچـاکی سـوپای عیراقـی بەچـەكو

---

٢٦١. شلومو نکـدیمون، س پ، ل ٩٠. بـەراوردی بکـە لەگـەڵ لازەرێـڤ، کـوردو کوردستان (فاکتەرەکانی پەیدابوونو گەشەسەندنی مەسەلەکە، بەشێکە لـەکتێبی (چەند وتارێکی کوردناسی: کۆمەڵێ نوسـەری رووسـی، و: ئـەنوەر قـادر محەمـەد، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ل ١٢٢-١٢٧.

[124] بڕوانە، عبـدالکریم فرحـان، س پ، ل ١٦٠. د. علـی کـریم سـعید، س پ، ل ٢٦١.

[125] بڕوانە، د. علی سعید، س پ، ل ل ٢٥٨-٢٥٩.

[126] بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ٨٤

[127] د. علی کریم سعید، س پ، ل ل ٢٥٩-٢٦٣.

تەقەمەنی سۆڤێتی چەکدار کرابوو، لەلایەکی ترەوە حکومەتی عیراقی بەباندی پیاوکوژو پیلانگێڕی نازیو فاشیست ناو دەبردو لەبەیاننامەیەکیدا پشتیوانی خۆی بۆ مافەکانی گەلی کورد دەربڕیو هەڵسوکەوتی حکومەتی عیراقی لەبارەیانەوە بەخیانەتکردن لەسەر شێوازی هیتلەریو، بەربەریانەو فاشستیانە ناوزەد کرد[١٢٨]. (د. قفطان)دەڵێت: سۆڤێت هەوڵی وروژاندنی دۆزی کوردیدا لەرێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا ئەویش لەرێگەی مەنگۆلیاوە، بەلاّم پاشان لەو کارەی پاشگەز بووەوە[١٢٩]، هەروەها لەبارەی هەڵوێستی ولاّتانی ترەوە دەڵێت: ئەمریکا لەدژی شەڕی کوردستان نەبوو، بەڵکو هاوکاری عیراقی کردو، بەریتانیا تەحەفوزی نەکرد، بەڵکو هاوکاری هەمەچەشنی پێشکەش بەحکومەتی عیراقی کرد[١٣٠]، ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی (شبیب)ەوەیە کەئاماژەمان پێدا. وێڕای هەموو ئەو یارمەتیدانو پشتگیریە نێودەوڵەتیەی کە لەعیراق دەکرا، بەلاّم لەسەر ئاستی نێوخۆیی نێوان بەرپرسانی عیراقی تەباییو یەکڕیزی بەدی نەدەکرا، چونکە درێژەکێشانی جەنگەکە لەبەرەکانی تری کوردستاندا گرژیو

---

[128] بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ، ل ٩٠.

[129] بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ل ٢٥٢-٢٥٣. شایانی ئاماژە پێدانە کەکورد هەوڵێکی لەو چەشنەی لەگەڵ ولاّتانی رۆژئاواشدا ئەنجام دا، وەکو (لەیزەر) دەڵێت: "دوای یاخیبوونی ساڵی ١٩٦١ی کوردەکان لەعیراق، رێبەرایەتی کوردی چاوی بڕیە رۆژئاوا تا داواکەی لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بخاتە روو- بەلاّم ئەم هەوڵە ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە". بڕوانە، شری لەیزەر، کوردستانی بەر ئاگرباران، و: ئەبوبکر خۆشناو، چ١ ك، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٢٥.

[130] بڕوانە، د. کاوس قفطان، س پ، ل ل ٢٥١-٢٥٣.

ئالۆزیەکانی نێوان سوپای عیراقو (پاسەوانی نەتەوەیی) قوولتر کردەوە[131]، هەروەها لەسەر ئاستی سیاسیش سەرکردایەتی عیراق بوون بەدوو باڵەوە، باڵی (عبدالسلام عارف)و ژمارەیەك لەگەورە ئەفسەرانو باڵی (احمد حسن البکر)و سەرکردەکانی (پاسەوانی نەتەوەیی)و ژمارەیەك لەئەفسەرانو کادرانی بەعسو، ئەگەری پێکدادانی چەکدرای لەنێوانیاندا هاتە کایەوە[132].

لەئاکامی ململانێی نێوخۆیی هەردوو باڵەکەی پارتی بەعسی فەرمانڕەواو ئەمانو ڕەوتی ناسریو دەستێوەردانی (سەرکردایەتی نەتەوەیی بەعس) لەکاروباری سیاسەتی نێوخۆیی عیراقدا بەبیانووی چارەسەرکردنی کێشەکان[133]، زەمینەی ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی بۆ (عارف) پتر لەهەر کاتێك ڕەخساندو سەرەنجام لە (١٨/١١/١٩٦٣) ژمارەیەك لەئەفسەرانی بەعسو ناسری بەپشتیوانی ناوبراو کودەتاکەیان ئەنجام داو بەسەر پاسەوانی نەتەوەییدا سەرکەوتنو[134]، کابینەی نوێی حکومەتیان بەسەرۆکایەتی (طاهر یحیی) پێکهێناو پاسەوانی نەتەوەییان هەڵوەشاندەوە[135].

---

131 بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ل ١٠٣-١٠٤ شایانی ئاماژەپێدانە کە (پاسەوانی نەتەوەیی) لەلایەن (عبدالسلام البکر عماش)ەوە پشتیوانی دەکرانو تەنانەت ئەو ناوبراوەی پێشەوەیان چوونە ریزەکانی ئەو هێزەوەو بەشداری ڕەمزییان تێدا کرد. بڕوانە، هـ س، ل ١٠٤.

132 بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل١١٥.

133 بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٨. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٢٣.

134 بڕوانە، محمود الدرة، س پ، ل ٣٧٤.

135 بڕوانە، منذر الموصلي، س پ، ل ١٥٨. عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١١٤.

هەرچەند حکومەتی بەعس لەرێگەی بەڵێنە زارەکیەکانی بەرپرسانیو بەیاننامەو پرۆژەکانیەوە بۆ وتووێژکردن لەگەڵ سەرکردایەتی کورددا، زاراوەکانی مافی چارەی خۆنووسینو ئۆتۆنۆمیو ناناوەندێتیان بەکار دەهێناو پرۆژەو فۆرمی ناناوەندێتیان بەدەستپێشخەریو داهێنانێکی خۆیان لەقەڵەم دا[136]، بەڵام لەراستیدا هیچ هەنگاوێکی راستەقینەیان بەئاراستەی سەلماندنو دابینکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی لەرووی کردارەکیو یاساییەوە نەنا، بەڵکو بەپێچەوانەوە پەنایان بۆ سیاسەتی سەرکوتکردنو تواندنەوەی نەتەوەییی کورد برد[137]. لەبەر ئەوە پرۆسەی وتووێژەکانی نێوانیان هیچ رێککەوتنێکی گشتگیریو چارەسەرێکی ریشەیی بۆ ململانێی نێوانیان لێنەکەوتەوە، چونکە جیاوازی بنچینەییان لەئایدیاو تێڕوانینیان بۆ پرسە چارەنووس سازەکانی نێوانیان هەبوو، لەبەر ئەوە دەبینین وتووێژەکانی نێوانیان زەمینەو مەرجەکانی دانوستانی سەرکەوتووی تێدا نەبوو.

---

136 بۆ نمونە بڕوانە، بۆچوونی (منذر الموصلي)، س پ، ل ل ١٣٨-١٣٩.

137 بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ل ٨٥-٨٦.

## باسی چوارەم

## باری دەستوریی گەلی کورد لەدەستوری کاتیی عیراقی ١٩٦٣/٤/٤دا

ئەنجامـــدەرانی کودەتاکـــە لەیەکـــەمین بەیاننامەیانـــدا لـــە (١٩٦٣/٢/٨)دا، رووخانـــدنی حکومـــەتی کۆمـــاری یەکـــەمو پێکهێنـــانی حکومـــەتێکی نوێیـــان بەســـەرکردایەتی (ئەنجومـــەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش) راگەیاند[١٣٨].

لەبەیاننامـــەی ژمـــارە (١٥)ی (١٩٦٣/٢/٨)دا هـــاتووە کـــە (ئەنجومـــەنی نیشـــتمانی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش) دەســـەڵاتی بـــاڵا لەکۆماری عیراقدا پیادە دەکات بەدەسەڵاتی یاسادانانو دەسەڵاتەکانی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانو هەڵبـژاردنی ســەرۆك کۆمــارو پێکهێنانی حکومەتەوە، لەو بەیاننامەیە بترازێت تا دەرکردنی یاسای ژمارە (٢٥)ی ساڵی (١٩٦٣)، واتە دەستوری (١٩٦٣/٤/٤) هـیچ رێکخستنێکی دەستوریی تر بۆ وڵات دەرنەچووە[١٣٩].

لەلێکدانـــەوەو هەڵســـەنگاندنی نـــاوەرۆکی دەســـتورەکەداو بەپشتبەســـتن بەپرنســـیپە گشـــتیەکانی یاســـای دەســـتوریی، چـــەند تێبینیو رەخنەیەکی ئاراستە کراوە، گرنگترینیان بریتیە لە[*]:

---

[١٣٨] بڕوانە، د. رعد الجدة، س پ، ل ٦٧.

[١٣٩] بڕوانە، د. حميد الساعدي، س پ، ل ١٧٠، بۆ دەقی یاسای ژمارە (٢٥)ی ساڵی ١٩٦٣ بڕوانە، الوقائع العراقية، ع ٧٩٧ في ١٩٦٣/٤/٢٥. د. رعد الجدة، س پ، ل ٦٧.

[*] دەسەڵاتدارانی نـوێی عـیراق بەیـەکێك لـەدوو رێگـە نادیموکراسیانەکە جڵـەوی دەســـەڵاتیان گرتـــە دەســـت، ئـــەویش بەرێگـــەی کودەتـــای ســـەربازی (لـــەبارەی رێوشوێنەکانی دەسەڵات گرتنە دەستەوە، بۆ نمونە بڕوانە، د. حميدالسـاعدی، س پ،

ل ل ٨٨-٩٩)، هەر بەو شێوەیەش شێوازی دانانی دەستورەکە (دەربارەی ڕێوشوێنەکانی دانانی دەستور، بۆ نمونە بڕوانە، ه س، ل ل ١٠٤-١٠٧) ناچێتە خانەی ڕێوشوێنو شێوازە ئاساییە باوەکانەوە، بەڵکو ڕێوشوێنێکی تایبەتمەندە. (بڕوانە، ه س، ل ١٧٢).

-لەدەرکردنی یاساکەدا واژۆی سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیرانو وەزیرەکانی لەسەرە، لەکاتێکدا کەئەنجومەنەکە خۆی دەسەڵاتی یاسادانانی هەیە، ئەم کارە بەهەڵەیەکی هونەری لەیاسادانانەکەدا دەژمێردرێت (بڕوانە، د. رعد الجدة. س پ، ل ٦٧).

-لەبەندی (١٨)دا هاتووە کەئەم یاسایە یاسای دەستوریە، لەم بارەیەوە (د. منذر الشاوي) پێی وایە دانانی ئەو بەندە پێویست نیە، چونکە بەبێ ئەو ئاماژەپێدانەش یاساکە هەر دەستوریە، چونکە پرۆسێسکردنی دەسەڵاتی رامیاری ڕێك دەخات، ئەوەش ئەرکی دەستورە (بڕوانە، د. رعد الجدة. س پ، ل ٦٧)، بەبۆچوونی ئێمە (الشاوي) لەبۆچوونەکەیدا پشت بەپاساوەکانی لایەنگرانی ڕێبازی بابەتی لەیاسای دەستوریدا دەبەستێت، بەو پێودانگە تێبینیەکەی دروستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرا ئەو بابەتە لەریشەوە چارەسەر بکرێت لەرێگەی ناونانی یاساکەوە بە (دەستور)، هەروەکو چۆن لەم بارەیەوە ئەم تێبینیەی خستۆتە سەر تێبینیەکەی پێشووی، کاتێك دەڵێت ناونانی دەستورەکە بەناوی یاسای ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکرایەتی شۆڕش ناونانێکی ورد نیە، چونکە یاساکە جگە لەرێکخستنی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنەکە، باسی سەرۆکایەتی کۆماریشی کردووە (بڕوانە، ه س، ل ٦٧).

-یاساکە لەڕووی پەیکەری داڕشتنەکەیەوە. جێگەی تێبینیە، چونکە بەندەکانی بەشێوازی دەروازەو بەشو.... هتد ڕێك نەخراوە، هەروەها یاساکە چەند بەندێکی لەخۆگرتووە، کەپێویست بوو لەپەیڕەوی ناوخۆییدا تۆمار بکرێت (بڕوانە، ه س، ل ٦٨)، یان بەندێکە هیچ پەیوەندیەکی بەناوەرۆکی یاساکەوە نیە، بۆ نمونە بەندی (٢٠) (بڕوانە، د. حمید الساعدي، س پ، ل ١٧٢).

١-یاساکە بەهیچ شێوەیەك ئاماژەی بەجۆری ئایدیۆلۆجیاو پرنسیپە رامیاریەکان نەداوە[١٤٠]، واتە "هیچ بەرنامەیەکی رامیاریو کۆمەڵایەتی لەخۆ نەگرتبوو"[١٤١]، لەراستیدا ئەمە کەموکوڕیەکی بنچینەییە لەیاساکەدا، چونکە دەستور بیرۆکەی یاسای پەیڕەوکراو لەدەوڵەتدا دادەمەزرێنێتو فەلسەفەی رامیاریو کۆمەڵایەتی سستمی فەرمانڕان دیاری دەکاتو چوارچێوەی یاسایی بۆ هەموو چەشنە چالاکیەکانی ناو دەوڵەت دادەنێت[١٤٢].

٢-بەبۆچوونی ئێمە یاساکە. لەبواری رێکخستنی دەزگاکانی فەرمانڕانیو چۆنێتی دابەشکردنی پسپۆڕیو دەسەڵاتەکانیاندا پرنسیپی یەکخستنی دەسەڵاتەکان دەنوێنێ، وەکو لەو بەندانەی کەتایبەتن بەدەسەڵاتەکانی ئەنجومەنەکەوە دەردەکەوێت[١٤٣]. لەبارەی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنەکەوە (د. الساعدي) دەڵێت: "فەرمانڕەوای راستەقینە لەدوای بەرپابوونی شۆڕشەکە ئەنجومەنی نیشتمانیی سەرکردایەتیی شۆڕش بووەو بەیاننامەی ژمارە (١٥) هەموو دەسەڵاتەکانی پێسپارد، هەرچی داموەزگاکانی تریشە (سەرۆکایەتی

-یاساکە هیچ دەقێکی لەسەر شێوازو رێوشوێنەکانی هەموارکردنی بەندەکانیو ئەو لایەنەی کەئەو دەسەڵاتەی هەیە دانەناوە (بڕوانە، د. رعد الجدة، س پ، ل ٦٨)، دیارە دانانی بەندی تایبەت بەو بوارە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەهەردوو رووی رواڵەتیو بابەتیەوە.

140 بڕوانە، هـ س، ل ٦٨.

141 شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٨١.

142 بڕوانە، د. حميد الساعدي، س پ، ل ١٢١.

143 لەبارەی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕشەوە لەبوارەکانی یاسادانانو جێبەجێکردنو دادوەریەوە، بڕوانە، دەقی یاساکە لە: د. حميد الساعدی، س پ، ل ل ١٧٢-١٧٤. د. رعد الجدة، س پ، ل ل٦٩-٧٢.

کۆمار، سەرۆکایەتی وەزیرانەوە ئەنجومەنەوە سەرچاوەی گرتووەو سەر بەئەویشە..."[144]. لەسەر ئەم بنچینەیە، لەو بڕوایەداین ئەو جۆرە دەستورانەی کەدیاریکردنی دەسەڵاتەکانی دامودەزگاکان فەرمانڕانیان لەسەر بنچینەی پرنسیپی یەکخستنی دەسەڵاتەکان ڕێك خستووە، لەئاکامدا سستمی فەرمانڕانی ئیستبدادی بەرهەم دەهێنێت.

٣-یاساکە هیچ بەندێکی لەسەر مافو ئازادیە بنچینەییەکانی مرۆڤ دانەناوە، بەمەش یاساکە هیچ ڕێکخستنێکی یاسایی بۆ ئەو بوارە بۆ گەلی کوردو گەلانی تری عیراق لەخۆ نەگرتووە.

٤-یاساکە هیچ بەندێکی لەسەر پێکهاتەی نەتەوەیی گەلانی عیراقو زمانی فەرمی دەوڵەت دانەناوە، لەکاتێکدا دیاریکردنو ڕێکخستنی ئەم بوارە لەئەرکە سەرەکیەکانی دەستورە، بەم شێوەیە یاساکە خۆی لەدانپێدانان بەگەلانی عیراق بەگشتیو بەگەلی کورد بەتایبەتی دزیوەتەوە.

٥-هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەی کە لەهەردوو خاڵی پێشوودا ئاماژەمان پێدا، یاساکە هیچ ڕێوشوێنو چارەسەرێکی بۆ ڕێکخستنی دەستوریی گەلی کوردو مافو ئازادیەکانیو ڕێگەچارەی یاسایی دۆزە نەتەوەییەکەی دانەناوە، لەسەر ئەم بنەمایەش بەپشتبەستن بەو بێدەنگیو ئاماژە پێنەدانەی بەندەکانی یاساکە بەگەلی کوردو مافو ئازادیەکانی، دەشێت بارە دەستوریەکەی بەباری دانپێدانەنان بەڕاستی هەبوونی ئەو گەلە بژمێرێن.

---

144 د. حميد الساعدي، س پ، ل ل١٧١-١٧٥.

## باسی پێنچەم

## هەڵسەنگاندنی وتووێژەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی‌ی بەعس

(١٩٦٣/٢/٨-١٩٦٣/١١/١٨)

لەئاکامی لێکدانەوەی پەیوەندیەکانی نێوان سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردو حکومەتی بەعس لەعیراق لەساڵی (١٩٦٣)داو رەوشی چالاکیە رامیاری‌و دیپلۆماسی‌و سەربازیەکانی نێوانیان، گەیشتینە چەند ئەنجامێك گرنگترینیان ئەمانەن:

١-لەدەستوری (١٩٦٣/٤/٤)دا بەهیچ شێوەیەك ئاماژە بەبوونی گەلی کوردو مافەکانی نەدراوە.

٢-پارتی بەعس دەستپێشخەریی کرد بەرامبەر بەپارتی لەبارەی ئەنجامدانی جۆرێك لەپێکهاتن‌و رێککاری دەربارەی ئەو قۆناغەی کەبەعس پرۆسەی کودەتاکەی بەسەر (قاسم)دا ئەنجام دەدات. بەعسیەکان بەڵێنی زارەکیان بەسەرکردایەتی کورد دا، کەچی پارتی بەنووسراو رەزامەندیی دەربڕی، بەم شێوەیە حکومەت خۆی لەهەر پابەندێتیەکی نووسراو بوارد، بەپێچەوانەی سەرکردایەتی‌ی کوردەوە.

٣-بەعسیەکان هیچ شتێکیان لەبارەی رێوشوێن‌و کاتی ئەنجامدانی پلانی کودەتاکەوە بەپارتی رانەگەیاند، ئەمە چەند راستیەك روون دەکاتەوە کەپارتی لەدیدی بەعسدا نەهاوپەیمانێکی باوەڕپێکراو بوو، نەلایەنێکی سەرەکی بوو لەهاوکێشەکەدا، بەڵکو پێگەو رۆڵی لاوەکی هەیەو دەکرێت بۆ ئامانجێکی کاتی کەڵکی لێوەربگیرێت، گرنگترینیان بریتین لە:

أ-دەستەبەرکردنی لایەنگیری پارتی، یان هەر هیچ نەبێت بێلایەنکردنی لەپرۆسەی کودەتاکەدا.

ب-دەستکرانەوەیان لەپرۆسەی لەناوبردنی نەیارەکانیان‌و کۆنترۆڵکردنی سوپادا.

ت-مسۆگەرکردنی شوێنی داڵدەدان لەکاتی سەرنەگرتنی هەوڵی کودەتاکەیاندا.

پ-خۆتەرخانکردن لەپاش دەسەڵات گرتنە دەست‌و لەناوبردنی کۆمۆنیست‌و دیموکراتیخوازەکان، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد.

٤-لەئاکامی بەراوردکردنی نێوان پرۆژەکانی پێشکەش کراو بۆ دانوستان لەلایەن هەردوو لایەنی پەیوەندیدارەوە، دەردەکەوێت کەجیاوازیەکی تەواو هەیە لەو بنچینە فیکری‌و رامیاریەی کەهەر لایەنێکیان پرۆژەکەی خۆی لەسەر گەڵاڵە کردووە، هەروەها لەرووی چەمکی یاسایی‌و رامیاری‌و شوێنەوارەکانیەوە لەگەڵ یەکدیدا تەواو جیاوازن، چونکە پرۆژەکەی شاندی کورد بریتی بوو لەناناوەندێتی رامیاری بەفۆرمی ئۆتۆنۆمی، بەڵام پرۆژەکەی حکومەت بریتی بوو لەچەمکی خۆبەڕێوەبردن‌و دواتر یەکلایەنە لەفۆرمی یاسای پارێزگاکاندا رایگەیاند. لەبەر ئەم جیاوازییە ریشەییە لەدیدو تێڕوانینی هەردوو لایەنەکەدا، پرۆسەی دانوستانەکە سەری نەگرت. چونکە لایەنی کەمی خاڵەکانی هاوبەشیان تێدا نەبوو کەهاندەر بێت بۆ رێککەوتن.

٥-ناشێت پرۆسێسی گفتوگۆو دانوستانەکان لەیەك جۆرو لەیەك ئاستدا پۆلێن بکرێت، چونکە یەك رەوت نەرۆیشت، بەڵکو بەپێی قۆناغ‌و گۆڕانی هەلومەرجەکان جیاوازیان تێدا بەدی دەکرێت، لەبوارەکانی کات‌و شوێنی دانیشتنەکان، ئاستی شاندەکانی بەشداربوو لەگفتوگۆکانداو رادەی دەسەڵاتیان لەو بوارەداو شێوازو

ناوەرۆكی پرۆژەو داواكاریەكان كە لەهەندێك باردا لەسەر دوو ئاستی هاوتاو، هەندێك جاری تر لەدوو ئاستی زۆر ناهاوتادا ئەنجام دراوە.

٦-بەپێوەری تەرازووی هێزەكان، ئەو فاكتەرانەی كەباری حكومەتی عیراقیان لەململانێ رامیاریو سەربازیەكەدا بەهێز دەكرد بریتی بوون لە:

أ-توانای بەگەڕخستنی هەموو ئەو توانا رەخساوەی كە لەعیراقدا هەبووە.

ب-كەڵك وەرگرتن لەپشتیوانیو هاریكاری هەمەلایەنەی نێوچەیی‌و نێودەوڵەتی.

لەبەرامبەردا دوو فاكتەری سەرەكی كاریگەریان لەسەر لاوازكردنی توانای حكومەت لەو بوارەدا هەبوو كەبریتین لە:

أ-ململانێی توندی نێوان باڵەكانی ناو حكومەت لەلایەكو نێوان حكومەتو گروپو لایەنە نەیارەكانی دەرەوەی حكومەت لەلایەكی ترەوە.

ب-گرەوكردنی حكومەت لەسەر سیاسەتی ناواقیعبینی‌و زەبروزەنگو خۆسەپاندنو فریودانی بەرامبەر، كەدواتر ئاكامەكەی بەپێچەوانەوە بەسەریدا شكایەوە.

سەبارەت بەلایەنی كورد، سێ فاكتەری سەرەكی یارمەتیدەر بوون بۆ راگرتنی بارەكەی:

١-رەواییی دۆزی نەتەوەیی گەلی كوردو ئامادەیی ئەو گەلە بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەگەرەكان لەپێناو گەیشتن بەئامانجەكانی بزوتنەوەكەیدا.

٢-واقیعبینیی رێژەیی لەناوەڕۆكی ئەو پرۆژانەی كەبۆ دانوستان پێشكەش كراون، چونكە پاساوو دەرفەتی بەرگریكردن لێیان بەهێزە.

٣-ئەندازەیەکی پەسەند لەیەکبوونی ناوەندی بڕیار لەناو سەرکردایەتی بزووتنەوەکەدا لەم قۆناغەدا بەدی دەکرا، بەجۆرێك کەتوانرا ئەم بارە هەر هیچ نەبێت لەو قۆناغەداو هەتا شکستهێنانی یەکجاری پرۆسەی دانوستانەکە لەئاستێکدا بپارێزرێت، ئەمە سەرباری ئەو جیاوازیانەی کە لەنێوان دیدو بۆچوونەکانیاندا بەدی دەکرا.

لەبەرامبەردا دو فاکتەری سەرەکی کاریگەریی خراپیان لەسەر تێکڕای تواناکانی کورد لەو بوارەدا بەجێهێشت:

أ-سنورداریی پێکهاتەکانی هێزو توانای خۆیی گەلی کورد لەڕوی رامیاری، ئابوری، سەربازی، تەکنەلۆجی و.... هتد، بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کەبۆ حکومەت رەخسابوو.

ب-بێبەشبوونی گەلی کوردو بزوتنەوەکەی لەهەموو جۆرە پشتیوانیو هاریکارییەکی نێودەوڵەتی راستەقینە کەشیاوی پشت پێبەستن بێت.

لەئاکامی لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی وتووێژەکانی ئەم قۆناغەی نێوانیاندا لەهەموو رووەکانیەوە، دەشێت بەدەستپێکی شێوازێکی پێشکەوتووتری کاری رامیاریو دیپلۆماسی کوردی لەباشووردا لەقەڵەم بدەین، بەپشتبەستن بەئامادەکرنی بەرنامەی تایبەت بەدانوستانەکەو جۆری مامەڵەی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ بارودۆخو پێشهاتەکانو خودی پرۆسێسی دانوستانەکەداو پێکهاتەو رێکخستنی شاندەکەو ناوەرۆكو شێوازی ئەو پرۆژەو داواکاریانەی پێشکەش بەحکومەت دەکرانو هەوڵدان بۆ رەچاوکردنی بنەما سەرەکیەکانی تایبەت بەو بوارەو، نووسینەوەی کۆنووسی کۆبوونەوەکانو... هتد.

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کەهەردوو لایەنەکە کەڵکیان لەپرۆسێسی دانوستانەکە وەرگرت، حکومەت توانی ئەو دەرفەتە بۆ

**سەرکوتکردنی نەیارەکانیو قایمکردنی پێگەی دەسەڵاتە نوێیەکەی بقۆزێتەوە، هاوکات سەرکردایەتی کورد لەو ماوەیەدا کاری بۆ خۆرێکخستنو خۆسازدانەوە لەهەموو رووەکانەوە کرد.**

## باسی یەکەم
## کودەتای ١٨ تشرینی دووەمی ١٩٦٣و دەستپێکردنەوەی وتووێژی نێوان کوردو حکومەتی عێراق

لەئەنجامی درێژەکێشانو توندبونی ململانێی نێوان بەعسو ناسریەکانو سەرکردەکانی سوپاو سەرکردەکانی پاسەوانی نەتەوەییو دواتر لەنێوان بەعسیەکان خۆیاندا لەلایەکو درێژەکێشانی جەنگی حکومەت لەدژی گەلی کوردو رەوتە دیموکراتیخوازەکانی تری عێراق لەلایەکی ترەوە، هەلێکی لەبار بۆ (عارف) رەخسا تاوەکو لە (١٨/١١/١٩٦٣)و لەرێگەی کودەتایەکەوە کۆتایی بەدەسەڵاتی بەعسیەکان بهێنێتو تەواوی دەسەڵاتی حکومەت بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوەو[1]، پۆستی سەرۆك وەزیران بە (طاهریحیی)ی سەرۆك ئەرکانی سوپا سپێردراو (السعدي) جێگری سەرۆك وەزیران لەحکومەتەکەی پێشوودا بۆ دەرەوەی وڵات دوور خرایەوە[2].

لەبارەی هەڵوێستی کودەتاچییەکان لەجەنگی حکومەت دژ بەگەلی کورد، هەر لەسەروبەندی خۆسازدانیان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە وەکو (عبدالکریم فرحان) دەڵێت، یەکێك لەئاستەنگەکانی بەردەمیان بریتیبوو لەچۆنێتی "درێژەپێدانی کاروچالاکی لەدژی

---

[1] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، عبدالکریم فرحان، حصاد ثورة: تجربة السلطة في العراق (١٩٥٨-١٩٦٨)، دار البرق، لندن، ١٩٩٤، ل ل ١١٢-١١٨، ١٤٨.

[2] بڕوانە، س. ج. ادموزندز، کرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ل ١٤.

شۆڕشگێڕە کوردەکانو نەنواندنی هیچ جۆرە بێهێزییەك یان نەرمییەك یان ساردبوونەوەیەك"[3]. لەسەر ئەو بنچینەیە لەدوای سەرکەوتنی کودەتاکە حکومەت درێژەیدا بەپرۆسیسە سەربازییەکانی لەچەند بەرەیەکی کوردستاندا، بەڵام هیچیان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا[4].

## دەستپێکردنی وتووێژەکان

لەئاکامی گۆڕانکارییە رامیارییەکانی عیراق لە (١٨/١١/١٩٦٣) بەدواوەو سەرنەگرتنی رێگە چارەی سەربازی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دۆزی نەتەوەیی گەلی کورددا، هەروەها بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیو بنبڕکردنی دەسەڵاتی بەعسیەکانو کپکردنی یەکێك لەدووبەرەکەی شەڕ، تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی

---

[3] عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١١٣.

[4] بڕوانە مسعود البارزانی، ب٣، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، مطبعة وزارة التربية، اربیل، ٢٠٠٢، ل١٢٣، هەر لەم بارەیەوە (محمود الدرة) دەڵێت: "لەو کاتەدا حکومەتی نوێ جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتە دەست، کە کردارە سەربازییەکان بۆ کۆتایهێنانی بە بەرگریکردنی شۆڕشگێڕە کوردەکان کەتێکشکێندرابوونو لەناوچەیەکی بەرتەسکدا گەمارۆ درابوون درێژەی هەبوو". محمود الدرة، القضية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦، ل ٣٥١، هەر بەو واتایە، بڕوانە: عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١٥٩. کەچی ابراهیم جلال لەم بارەیەوە دەڵێت: "هێرشو پەلاماری سوپای عیراق بۆ سەر کوردستان خاوبووەوە، ئەو تووندو تیژییەی پێشووی نەما، رژێمی نوێی عیراق لەبارودۆخێکی خراپدا بوو..."، ئیبراهیم جەلال، خواروی کوردستانو شۆڕشی ئەیلول بنیاتنانو هەڵتەکاندن ١٩٦١-١٩٧٥، چ ٣، چاپخانەی ژیار، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٢٣.

کاتیش بێت[٥]، حکومەت ناچاربوو ڕێگەچارەی ئاشتیانەو دەستپێکردنەوەی وتووێژەکان بگرێتە بەر، ئەوەش وەکو هەنگاوێکی تەکتیکی بەمەبەستی بەدەستهێنانی کاتو ڕەخساندنی زەمینەی خۆسازدانەوە بۆ خولێکی تری جەنگی کوردستانو بەکارهێنانی ڕێوشوێنو ئامرازەکانی توندو تیژیو سەرکوتکردن. لەبەرامبەریشدا، بارودۆخی کوردستان بەگشتیو ناو سەرکردایەتی بزووتنەوەکەی بەتایبەتی فاکتەرێکی هاندەربوو تاوەکو بەهەمان ئاراستەی حکومەتی نوێدا بیربکەنەوە، چونکە "کوردستانیش هەرچەندە لەڕووی تینو توانای پێشمەرگەو کاری پێشمەرگەییەوە لەبارێکی خراپدا نەبوو، بەڵام لەڕووی سیاسیو ئابوورییەوە تووشی تەنگو چەڵەمە هاتبوو"[٦].

لەسەر ئەو بنچینەیەو لەسەر بانکهێشتی حکومەت، (شێخ بابا عەلی) چاوی بەسەرۆك وەزیرانو سەرۆك کۆمار کەوت، هەردووکیان ئامادەیی تەواویان بۆ گرتنەبەری ڕێگەچارەی ئاشتیانە دەربڕیو ڕایانسپارد کە (بارزانی) لەو بارەیەوە ئاگادار بکاتەوە، ناوبراویش لە (٢١/١٢/١٩٦٣)دا ڕاسپاردەکەی بەنامەیەکداو لەڕێگەی (ئەسکەندەر)ی هاوڕێیانەوە گەیاندە (بارزانی)، ئەمیش لە (٢٦/١٢/١٩٦٣) لەنامەیەکدا وەڵامی حکومەتی دایەوەو ئامادەیی خۆیانی بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆو پێشوازیکردنی شاندی حکومەت لەرانیە دەربڕی[٧]، بەڵام حکومەت داواکارییەکەی خۆی لەڕێگەی

---

[٥] بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٢٣.

[٦] هـ س، ل ١٢٣.

[٧] بڕوانە، مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل ١٢٤-١٢٥. دەقی هەردوو نامەکە لە (هـ س)دا هەیە، ل ١٢٥.

(عمیـد عبـدالعزیز حمیـد الجلبـی) فەرمانـدەی هێـزی فـائزەوە دووپاتکردەوە، بەوەی کەشاندێکی کورد سەردانی بەغداد بکەن، بەڵام وەڵامی سەرکردایەتی کورد بەنەرێی بوو[8]، چونکە هێشـتا ژمارەیـەك لەئەندامانی پێشووی شاندی کوردی تا ئـەو کاتـە هـەر لەزیندانـدا مابوون، هاوکات لایەنی کوردی ئامادەیی خۆیان بـۆ پێشـوازیکردنی هاتنی شاندی حکومەت بۆ کوردستان دووپاتکردەوە[9].

لە (١٩/١/١٩٦٤)دا سەرکردایەتیی کورد بیروڕای لەمەڕ ئـەو داخوازیانەی کەپێشکەشی شاندی حکومەتی کردبوو گۆڕیەوەو دواتـر (بارزانی) ئاگـادار کرایـەوە کـە لـە (٣٠/١/١٩٦٤)دا شـاندێکی حکومـەت دەگاتـە رانیـە[10]. شـاندەکە بەسـەرۆکایەتی پارێزگـاری سلێمانی (عمید عبدالرزاق محمود) بوو، (شێخ احمد بارزانی)شیان بۆ نێوانگیری لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، لـەکاتی دیـاریکراودا گەیشـتنە رانیەو شاندنی کوردیش لەپێشوازیاندا بـوو[11]، وتووێـژەکان تـا رۆژی

[8] بڕوانە، شلومو نکدیمون، الموساد فی العـراق ودول الجـوار انهیـار الامـال الکردیـة والاسرائیلیة، ط٢، ترجمة بدر عقیلـي، مطبعـة دار القـدس، بیروت، ١٩٩٨، ل١٠٦. (محمود الدرة) لـەم بارەیـەوە دەڵێـت:" حکومـەت فـەرمانیدا بـەڕاگرتنی کـردەوە سـەربازییەکان، وەپەیوەنـدی راسـتەوخۆی لەگـەڵ سـەرکردەکانی شۆڕشـدا بـەپێی سیاسەتی نوێی خۆی ئەنجام دا" محمود الدرة، س پ، ل ٣٥١.

[9] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٢٦.

[10] بڕوانە: هـ. س، ل ١٢٦.

[11] شاندەکەی حکومەت پێکهاتبوو لـە: پارێزگـاری سـلێمانی، عمیـد عبـدالعزیز الجلبی فەرماندەی هێزی فائز، عقید سالم فەرماندەی سـەربازگەی سـلێمانی، بـەڵام شاندەکەی کورد پێکهاتبوو لە: نـوری صـدیق شـاوەیس، جـەلال تاڵـەبانی، عقیـد عبدالکافي النبـوي، مسعود محمد، عباس مامەند ئاغا، بڕوانە: مسعود البـارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٢٦-١٢٧.

مۆرکردنی ڕێککەوتنی ئاگر بەستی نێوانیان لە (١٠/٢/١٩٦٤)دا درێژەی هەبوو[١٢]، لە ووتویژەکاندا خاڵی ناکۆکی سەرەکی نێوانیان لەسەر ناوەڕۆكو داڕشتنی ئەو بڕگەیە بوو کەپەیوەندیی بەجۆری مافەکانی گەلی کوردەوەیە کەبڕیار بوو لەدەستوری کاتییدا جێگیر بکرێت، حکومەت پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەداڕشتنی بڕگەکە بەم شێوەیە بێت"، دەوڵەت دان بەمافە نەتەوەییەکانی کوردەکاندا دەنێت"، بەبێ ئەوەی جۆری ئەو مافە نەتەوەییانە دەستنیشان بکات لەئاکامدا حکومەت بەبۆچوونەکەی شاندی کوردی قایل بوو، ڕێککەوتنەکە مۆرکراو ئاگربەست ڕاگەیاندرا[١٣]. بەپێی هەندێك سەرچاوە لەلایەنی کوردەوە خودی (بارزانی) دانوستانەکانی ئەنجام دەداو لەو بارەیەشەوە لەگەڵ (عبدالسلام عارف)دا ڕێککەوتبوو، ڕێککەوتنەکەی بەناوی خۆیەوە ئیمزا کرد نەك وەکو سەرۆکی پارتی[١٤]

---

[١٢] بڕوانە: س، ج. ادمونز، س پ، ل ١٤.

[١٣] مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٢٧-١٢٨. لەم بارەیەوە (الموصلی) دەڵێت:"یەکەمین کارێك کەحکومەتی نوێ بەسەرۆکایەتی طاهر یحیی ئەنجامیدا ڕاگرتنی شەڕبوو لەباکووردا بەپێی ڕێنمایی هەردوو سەرۆك عبدالناصر، بن بیللا"، منذر الموصلي، القضية الكردية في العراق: البعث والاكراد، دار المختار، دمشق، ٢٠٠٠، ل ل ١٧٠. محمد احسان لەم بارەیەوە دەڵێت:"عبدالسلام عارف گوێڕایەڵی عبدالناصر بوو، هەروەها بارزانی لەلایەن وڵاتانی وەکو ئەمریکاو یەکێتیی سۆڤێتو میسرەوە بۆ ڕێکەوتن ڕێنوێنی کرا". محمد احسان، کوردستان ودوامة الحرب، منشورات دار آراس للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠١، ل ٤٣. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٢٦.

[١٤] بڕوانە: د. سعد ناجی جواد، س پ، ل ١٠٥.

حکومەتو بارزانی لەم بارەیەوە بەجیا بەیاننامەیان راگەیاند[15]، کەلێرەدا تەوەرە سەرەکیەکانی بەیاننامەکەی حکومەت پوخت دەکەینەوە:

-دانپێدانان بەمافە نەتەوەییەکانی (برا) کوردەکانو جێگیرکردنی لەدەستوری کاتیدا.

-ئازادکردنی زیندانییە رامیارییەکانو دەرکردنی لێبوردنی گشتیو گێڕانەوەیماڵو موڵکی دەستبەرسەرداگیراوی کوردان.

-گێڕانەوەی دامودەزگاکانی کارگێڕی خۆجێیەتی بۆ ناوچەکانی باکوور.

-گێڕانەوەی فەرمانبەران بۆ سەر کارەکانیان.

-هەڵگرتنی ئابلۆوقەی ئابووری لەسەر ناوچەکە.

-دەستکردن بەئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە.

-قەرەبووکردنەوەی ئەو هاووڵاتیانەی کەزیانیان پێگەیشتووە لەئاکامی دروستکردنی هەردوو بەنداوی دوکانو دەربەندیخاندا.

-حکومەت ئەو رێوشوێنانە دەگرێتە بەر کەئاسایشو هێمنیی ناوچەی باکوور دەستەبەر دەکاتو هاووڵاتیان بگەڕێنەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆیانو کورد لەوە دڵنیا دەکرێنەوە کەحکومەت مافە رەواکانیان وەکو هاووڵاتیانی تری عیراق دابین دەکات، لەکۆتاییدا

---

[15] بۆ دەقی هەردوو بەیاننامەکە بڕوانە، شازین هێرشو نزار محەمەد، بەڵگەنامە، پارتی دیموکراتی کوردستان (باڵی مەکتەبی سیاسیو باڵی بارزانی) لەچەندین بەڵگەنامەی مێژووییدا ١٩٦٤-١٩٧٠، (کۆکردنەوەو ئامادەکردن)، ب٢، چ٢، ئۆفسێتی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ل ٢١-٢٣. محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٥١-٣٥٣. منذر الموصلي، س پ ، ل، ١٧١. د. سعد ناجي جواد، المسألة الكردية في العراق ١٩٥٨-١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ل ل ١٠٥-١٠٦.

هاتووه کەپێویستە وەزارەتەکان هەنگاو بنێن بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی بەیاننامەکە.

لەدوای راگەیاندنی رێککەوتنی ئاگربەستی (١٩٦٤/٢/١٠) چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کەئەوە زەمینە بۆ دانوستانو خستنەڕووی پرۆژەی تەواو بۆ چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی کورد بڕەخسێنێت بەڵام بەدواکەوتنی ئەو بابەتە، گومانو نیگەرانی لەوە پەیدابوو کەلەوانەیە رێککەوتنەکە بەندی نهێنی تێدابێت، چونکە ناوەڕۆکی رێککەوتنەکە پتر بۆ ئاگربەستو هێورکردنەوەی بارودۆخەکە بوو، هیچ پرۆژەیەکی تەواوی لەبارەی چارەسەرکردنی ریشەیی پرسەکەوە لەخۆنەگرتبوو، بەڵام (بارزانی) لەڕوونکردنەوەکەیدا ئەمەی رەتکردەوەو گوتی" بەر لەمە بەئاژانسی دەنگوباسی عیراقیم گوتبوو کەرێککەوتنی ئاگروەستاندنو گێڕانەوەی ئاشتی بۆ ناوچەکانی نیشتمان هیچ بەندێکی نهێنی تیا نییە، وائێستەش هەمان قسە بۆ ئاژانسی ناوبراو دووپات ئەکەمەوە.. لەپاشان ئەوانەی وتم دووپاتیان ئەکەمەوەو دەڵێم ئێمە بەدڵێکی پاکەوە چوینەتە ئاشتیو رێکیەوەو باوەڕیشمان وایە کەخێرویستیو نیازپاکی بەرامبەری لەوانەن کەهەموو لێکدانەوەیەکی خراپ راست بکەنەوە بەئیزنی خوا"[١٦].

رێککەوتنی (١٩٦٤/٢/١٠) پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردایەتیی پارتی بەرەو ئاڵۆزیی پتر برد[١٧]، ناکۆکیو رەخنەکانی

---

[١٦] شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ٢٤.

[١٧] شلومۆ نکدیمون دەڵێت: "لێکترازانی ریزی کوردەکان زیادی کرد.. ئیبراهیم ئەحمەد، تاڵەبانی لەگەڵ مستەفا بارزانیدا لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی کوردەکان ناکۆك بوون..."، شلومو نکدیمون، س پ، ل ١٠٦.

باڵی بیرۆی رامیاری لەسێ تەوەری سەرەکیدا بوو، وەکو لەبەیاننامەکەی (١٩/٤/١٩٦٤)یاندا دەردەکەوێتو بریتیە لە[١٨]
یەکەم: شێوازو رێوشوێنی ئەنجامدانو مۆرکردنی رێککەوتنەکە.
دووەم: ناوەڕۆکی خاڵەکانی رێککەوتنەکەو کاریگەرییان لەسەر چارەنووسی گەلی کوردو مافەکانی لەعیراقدا.
سێیەم: ناکۆکی لەسەر جێبەجێکردنی رێککەوتنەکە.
سەبارەت بەتەوەرەی یەکەمیان:
١-رەخنەیان لەبارزانی گرت کەرێککەوتنەکەی بەناوی خۆیەوە مۆرکرد رەزامەندیانی لەو بارەیەوە وەرنەگرتووە[١٩].
٢-بارزانی پەلەی کرد لەمۆرکردنی رێککەوتنەکەو چاوەڕێی ئاکامی دەستپێشخەرییەکی سەرۆك (عبدالناصر) نەکرد بۆ ناوبژیوانی لەگەڵ حکومەتدا[٢٠]. واتا لەدەستدانی کارتێکی گرنگ هەر بۆ گرەنتی یان شایەتحاڵیبوون بەسەر مۆرکردنی رێککەوتنەکەوە، لەکاتێکدا کە(بارزانی) پێشتر داوای گرەنتی نێودەوڵەتی یان هەر هیچ نەبێت عەرەبی لە (عبدالسلام) کردبوو.
تەوەرەی دووەم سەرجەم ئەو رەخنەو تێبینیانە دەگرێتەوە کە لەسەر ناوەڕۆکی هەردوو بەیاننامەکەی(عارف)و (بارزانی)دا هاتووە، بۆ نمونە:
١-بەیاننامەکەی حکومەت دان بەگەلی کوردو نیشتمانەکەیو مافە نەتەوەییەکانیدا نانێتو لەبری ئەوە، زاراوەکانی، براکوردەکان،

---

[١٨] بۆ دەقی بەیاننامەکە بڕوانە: شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ل ٢١-٥١.
[١٩] بڕوانە، هـ س، ل ٤٣.
[٢٠] بڕوانە، هـ س، ل ٤٣.

باکووری عیراق، مافی هاونیشتمانێتی گشتیو یەکسانی بەرامبەر بەیاسای بەکارهێناوە[21].

دیارە ئەمە لەلایەك لەگەڵ واقعو راستییە مێژووییەکاندا دژەو لەگەڵ ئامانجەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورددا یەکناگرێتەوە.

٢-ناوەڕۆکی بەیاننامەکە لەگەڵ ئامانجو دروشمەکانی بزووتنەوەکەدا لەمەڕ پێکهێنانی سستمی فەرمانڕەوایىو ژیانی رامیاری فرە پارتایەتیو دەستەبەرکردنی ئازادییەکان لەعیراقدا یەکناگرێتەوە، چونکە هیچ ئاماژەیەکی لەو بارەیەوە لەخۆنەگرتووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دواتریش سەرۆك کۆمار لەراگەیاندنەکانیدا زۆر بەتووندی لەدژی ئەو پرسە دەدوا[22].

٣-رەخنەگرتن لەو بەندانەی کەباس لەئازادکردنی بەندکراوەکانو قەرەبووکردنەوەیانو فەرمانڕەوایی یاساو دابینکردنی ئاسایشو ئارامیو رێگەدان بەحکومەت تاوەکو هەنگاوەکانی ئاساییکردنەوەی دۆخەکە ئەنجام بدات، کەبەشێکیان تۆمەتی ناراستەوخۆن بۆ گەلی کوردو بزووتنەوەکەیو بەشەکەی تری پاساو هێنانەوەیە بۆ سیاسەتەکانی دواتری حکومەت لەکوردستاندا[23].

---

[21] بڕوانە، شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ٢٦. شایانی ئاماژەپێدانە (بارزانی) لەبەیاننامەکەیدا لەبری (گەلی کورد)و (کوردستان)وشەی (براکانم)و (هەرێم)ی بەکارهێنا، بڕوانە، هـ س، ل ٢٦، پەراوێزی ژمارە (١)ی سەرچاوەکە.

[22] بڕوانە، هـ س، ل ٢٧-٢٩.

[23] بۆ وردەکارییەکانی بڕوانە، هـ س، ل ل ٢٩-٣١.

٤-حكومەت لەبەياننامەكەداو لەچوارچێوەی پاساو هێنانەوە بۆ مۆركردنی رێككەوتنەكە، بزووتنەوەكەی كوردو سەركردايەتييەكەی بەياخيبوونو هەڵپەرستو خائينو دارودەستەی كۆلۆنياليزمو دوژمنی ئيسلام لەقەڵەم داو بەهۆكارێكی سەرەكی خوێنڕشتنی بێتاوانانی ناوزەدكرد[٢٤].

حكومەت قايل نييە كەداخوازیو مەرجەكانی سەركردايەتی پارتی بەڕادەيەك بێت كەخۆی بەشێوەی لاواز يان بەزيوو ژێركەوتوو بێتە پێش چاو، لەم بارەيەوە (بارزانی) بەديهێنانی ئەو خواستەی حكومەتی بەكارێكی پێويست زانی، هەر لەبەرئەوە ناوەڕۆكی هەردوو بەياننامەكە نە ئۆتۆنۆمیو نە ناوەندێتی لەخۆ نەگرتبوو!.

سەبارەت بەتەوەرەی سێيەم كەتايبەتە بەهەڵسەنگاندنو بەراوردكردنی رادەی جێبەجێكردنی پابەندێتيەكانی حكومەتو لايەنی كوردی بەپێی بەندەكانی رێككەوتنەكە، دەشێت لەچەند خاڵێكدا پوختی بكەينەوە[٢٥]:

١-(بارزانی) ديلەكانی حكومەتی ئازادكرد، بەڵام حكومەت لەبەرامبەر ئەوەدا بەنيوە ناچڵی زيندانیو گيراوەكانی كوردی ئازادكرد[٢٦].

---

[٢٤] بڕوانە، هـ س، ل ل ٤٧-٤٨.

[٢٥] بۆ تێكڕايی ئەو رەخنانەی كە لەبەياننامەكەدا هاتووە، بڕوانە، هـ س، ل ل ٣١-٣٦.

[٢٦] شايانی ئاماژە بۆكردنە كە لەكۆبونەوەيەكی (ئەنجومەنی سەركردايەتیی شۆڕش)ی عيراقدا كە (عقيد عبدالرزاق محمود)ی پارێزگاری سلێمانی ئامادەی بوو، گلەيی لەحكومەت كردو رەخنەی لێگرت، چونكە داخوازيەكانی (بارزانی)

٢-حکومەت ویستی دامودەزگاکانی میری بگێڕێتەوە بۆ کوردستان. لەم بارەیەوە (بارزانی) جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەپێویستە لەلایەن کوردەوە هەموو ئاسانکاریەکی بۆ بکرێت، تەنانەت بەچۆڵکردنی ناوچە ئازادکراوەکانیش ئەگەر حکومەت داوای بکات، بەبێ هیچ مەرجێك‌و نابێت شەڕ لەگەڵ حکومەتدا هەڵگیرسێتەوەو ئەگەر پێویستی کرد دەبێت پێشمەرگە لەچەند شوێنێکی دیاریکراو بکشێتەوە.

٣-حکومەت نەك هەر چارەسەری کێشەی ئاوارەو زیانلێکەوتووەکانی کوردی نەکردوە بەڵکو پرۆسەکانی راگواستنی کوردو بەعەرەبکردنی کوردستان لەسەردەمی بەعسەوە درێژەی هەبوو[27].

٤-دڵنیایی لەئەندازە بەدەرو بڕوای پتەوی (بارزانی) بەرامبەر بەنیازپاکی حکومەت!، بەپێچەوانەی تێڕوانینی حکومەت بوو بۆ سەرکردایەتی پارتی بەخودی (بارزانی)شەوە[28].

شاندێکی شەش ئەندامی باڵی بیرۆی رامیاری‌و کۆمیتەی ناوەندی سەردانی (بارزانی)یان کردو دیدو بۆچوون‌و نیگەرانی خۆیان لەو بارەیەوە خستەڕوو، بەڵام ناوبراو لەسەر هەڵوێستی خۆی‌و جێبەجێکردنی بێ مەرجی پابەندێتیەکانی خۆی بەخاڵەکانی

---

جێبەجێ نەکردووە، بەڵام لەسەر ئەو هەڵوێستە سەرزەنشت کرا، بەتایبەتی لەلایەن (عبدالکریم فرحان)ەوە، بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ل ١٥٩-١٦٠.

[27] بڕوانە، شازین هێرش‌و نزار محەمەد، س پ، ل ل٣٠، ٣٩-٤٠.

[28] بۆ وردەکارییەکانی دیدو بۆچونەکانی هەردوو لایەنەکەی ناو سەرکردایەتی پارتی، بڕوانە، ﻫ س، ل ل ٣٤-٣٥.

رێککەوتنەکەوە لەگەڵ حکومەتدا سوربوو[29]. (بارزانی)هۆکارەکانی مۆرکردنی رێککەوتننامەکەی بۆ دوو خاڵ گێڕایەوە[30]:

١-گەلی کورد تاقەتو توانای شۆڕشی نەماوە.

٢-حکومەتیش توانااو تاقەتی نەماوە.

لەبەرامبەردا شاندەکە پشتگیریی لەپاساوەکانی (بارزانی) نەکردو بۆچوونی پێچەوانەی خستەڕوو، بەتایبەتیش لەبارەی خاڵی یەکەمیانەوە، هەروەها جەختیان لەسەر قۆستنەوەی بێهێزی حکومەت کردەوەو قایل نەبوونی خۆیان بەرێککەوتنێکی لەو چەشنە لەگەڵ حکومەتدا دەربڕی، بەتایبەتی کەحکومەت لەبارێکدایە توانای هێرشکردنی بۆ سەر کوردستان نەماوە.

لەئاکامی ئەو دیدارەدا شاندەکە پرۆژەیەکی هەموارکراوی خستە بەردەم (بارزانی) تاوەکو پێشکەش بەحکومەتی بکاتو دانوستانی لەسەر بکرێت، بەڵام ناوبراو بەوە قایل نەبوو، لەبەرئەوە شاندەکە بێ ئەنجام گەڕایەوە شوێنی خۆی[31].

لەئاکامی لێکدانەوەی ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی حکومەتدا کەبەواژۆی سەرۆك کۆمار (عارف) بوو چەند تێبینیەکمان لەلا گەڵاڵە بوو، کە سەرلەبەری لەبەرژەوەندی حکومەتدابوو، گرنگترینیان ئەمانەن:

١-ئاماژە بەبوونی گەلی کوردو مافە نەتەوەییەکانی وەکو گەلێکی جیاواز لەعەرەب نەکرا، هەروەها ناوی کوردستان نەهاتووە،

---

[29] بڕوانە، شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ٣٥.

[30] بڕوانە، هـ س، ل ٣٥.

[31] بڕوانە، شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ٣٦، ٥٠-٥١.

بەوەش حکومەت خۆی لەدانپێدانان بەتایبەتمەندی نەتەوەیی گەلی کوردو مافەکانیو نیشتمانەکەی بورد.

٢-لەجێگیرکردنی بڕگەی تایبەت بەگێڕانەوەی دامودەزگاکانی حکومەت بۆ کوردستان، بەتایبەتی ئەوانەی سروشتیو ئامانجی سەربازیو رامیاریو هەوالگریان هەیە ئامانجێکی سەرەکی خۆی پێکا، بەجۆرێك کەهەرگیز لەرێگەی شەڕەوە ئەوەی بۆ بەدەست نەدەهات.

٣-شەرعیەتدان بەحکومەتو دەستکرانەوەی بۆ هەر رێوشوێنو هەنگاوێك کەبیگرێتەبەر بۆ کۆنترۆلکردنی ناوچەکانی کوردستانو خۆقایمکردن تێیداو چەکداماڵینی کوردو ساردکردنەوەی گیانی بەرەنگاریو خۆبەختکردن لەناویاندا، لەژێر پاساوی دابینکردنی ئارامیو ئاسایشی ناوچەکەدا، لەکاتێکدا ئەو ئامانجەی بەرێوشوێنی نادیپلۆماسیانە بۆ بەدینەهات.

٤-بەلێنی حکومەت بەدابینکردنی مافەکانی گەلی کورد وەکو هاوولاتیانی تری عیراق، واتا مافەکانی هاوولاتیبوون، لەلایەك نکۆلیکردنە لەمافە تایبەتیەکانی هاوولاتیانی کوردو، لەلایەکی ترەوە گوزارشتکردنە لەو بڕوایەیان بەجۆرو ئەندازەی مافەکانی کورد کەپێشتر لەوتوێژەکانیاندا لەگەڵ شاندی کوردیدا جەختیان لەسەر دەکردەوە بەوەی کەدەولەت دان بەمافی هاوولاتیبوونی کورداندا دەنێت.

٥-بەیاننامەکە هیچ چوارچێوەیەکی زەمەنی بۆ جێبەجێکردنی هەموو بڕگەکانی لەخۆنەگرتبوو، لەبەرئەوە جێبەجێکردنەکەی لەژێر رکێفی حکومەتو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەبوو.

هەر بەو شێوەیەی پێشوو، دەشێت گرنگترین تەوەرەکانی بەیاننامەکەی سەرکردایەتی‌ی کوردی کەبەواژۆی (بارزانی) بوو لەچەند خاڵێکدا پوخت بکەینەوە:

١-بۆ بەدەنگەوە هاتنی ئارەزووی سەرۆك کۆمار لەبەدیهێنانی یەکڕیزی نیشتمانی‌و ڕێگرتن لەخوێنڕشتن‌و کۆتاییهێنان بەشەڕی براکوژی‌و سەلماندنی نیازپاکی‌ی حکومەت، بڕیارماندا کە دەستپێشخەری لەئاگربەست بکەین‌و داوا لەبراکانمان بکەین کەبچنەوە لای ماڵ‌و کاروکاسبی خۆیان.

٢-ئەم هەنگاوەی کورد بوار بۆ حکومەت دەرەخسێنێت کەهەنگاوبنێت بۆ گێڕانەوەی ژیانی ئاسایی‌و هێمنی‌و ئاسایش بۆ ناوچەکەو دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ دانپێدانانی حکومەت بەمافە نەتەوەییەکانی هاووڵاتیانی کورد لەچوارچێوەی گەلی عیراق‌و یەکێتی نیشتمانیدا، چەسپاندنی برایەتی عەرەب‌و کوردو سەروەری یاساو دابینکردنی ئاسایش‌و سستم لەناوچەکەدا هەموو کێشەیەکی ئاڵۆز چارەسەر دەکات.

لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی لایەنی کوردیدا چەند تێبینیەکمان لەلا گەڵاڵەبوو، گرنگترینیان بریتین لەمانە:

١-سەرلەبەری ناوەڕۆکی بەیاننامەکە دانپێدانانە بەنیازپاکی‌و کارچاکی سەرۆك کۆمار لەمەڕ پاراستنی یەکێتی ریزەکانی گەل‌و ڕێگرتن لەخوێنڕشتنی بێتاوانان‌و شەڕی براکوژی، کەواتا پێچەوانەکەشی راستە، بەو شێوەیە سەرکردایەتی کورد لەو رووەوە خۆی تاوانبار کردو حکومەتی وەکو خاوەن ماف نیشاندا.

٢-(بارزانی) بەمەبەستی دەربڕینی نیازپاکی‌و ئاشتیخوازیی گەلی کورد دەستپێشخەری لەئاگربەستدا کرد، لەکاتێکدا وا پێویست بوو کەهەنگاوێکی لەو چەشنە لەلایەن حکومەتەوە بنرێت.

٣-یەکگرتنەوەی ناوەڕۆکی داواکاریی هەردوو لایەنەکە لەمەڕ دەستبەرداربوونی پارتی لەخەباتی چەکداریو دوورکەوتنەوە لەژیانی رامیاری، لاسەنگ کردنی تای تەرازووی هێزەکانی بەقازانجی حکومەت دەگەیاند، بەبۆچوونی ئێمە ئەو هەنگاوەی سەرکردایەتی پارتی بۆ ئەو هەلومەرجە دروست نەبوو، وەپێگەی کوردی لەدانوستانەکەدا بێهێزتر کرد، چونکە هێزی چەکداری کورد لەسەر ئاستی نێوخۆیی عیراق فاکتەری سەرەکی بوو، لەپاڵ هۆکاری تری دەرەکیدا، کەحکومەتەکانی عیراقی ناچارکردووە بەگرتنەبەری رێگەچارەی دیپلۆماسیانە.

٤-سەرکردایەتی پارتی لەبەیاننامەکەدا بەناراستەوخۆ خەباتی چەکداری گەلی کوردی بەئاستەنگ لەبەردەم گێڕانەوەی ژیانی ئاساییو ئارامیو ئاسایشی ناوچەکە خستەڕوو، نەك سیاسەتەکانی حکومەت لەدژی گەلی کورد! بەتایبەتیش شاڵاوە سەربازییەکانی بۆ سەر کوردستان تا ئەو کاتەش هەر درێژەی هەبوو. لەبەر ئەوە دروست وابوو کەبەیاننامەکە جەخت لەسەر پێچەوانەی ئەوەی کەدەربڕیبوو بکاتەوە. بەوەش رەوایی بەخەباتی رامیاریو چەکداری گەلی کوردو ناڕەوایی بەسیاسەتەکانی حکومەت لەدژی ئەم گەلە دەدا.

٥-لەبەیاننامەکەدا، هاوشێوەی بەیاننامەکەی حکومەت، ناوی گەلی کوردو نیشتمانی کوردستان نەهاتووە، بەڵکو هەر ئەو زاراوەو چەمکانەی کە لەبەیاننامەکەی حکومەتدا هاتبوو بەکارهێناوەتەوە. بەوەش ئەو جۆرە دەربڕینە دۆزی نەتەوەیی گەلی کوردی هێنایەوە ناو چوارچێوەی ئەو چەمکی هاووڵاتیبوونەی کە لەبەیاننامەکەی حکومەتدا هاتبوو، نەك مافی نەتەوەیی گەلێکی جیاواز.

٦-سەرکردایەتی پارتی سەروەری یاساو دابینکردنی ئاسایشو سستمی لەناوچەکەدا بەکلیلی چارەسەرکردنی سەرجەم کێشەکان دەزانی، بەهەرە ئالۆزە کەشیانەوە، کەچی دروست وابوو کەسەرکردایەتیی کورد لەپێشدا گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا بکات لەبارەی جۆری ئەو دەستورو یاساو بڕیارانەی کەفەرمانڕەوایی عیراقی بەکوردستانیشەوە پێدەکرێتو لەسەر باشترینیان ڕێککەوتنی لەگەڵدا بکات، ئەو کاتە جێی خۆی بوو کەبۆچوونی لەو چەشنە بخاتەڕوو، چونکە سەرلەبەری ئەو یاسایانەی کەفەرمانڕەوایی گەلانی عیراقیان پێدەکرا، ڕەواییان نەبوو، نەڕەوایی میللیو نەڕەوایی دەستوری.

لەئاکامی ڕێککەوتنەکەدا، هەردوولایەنەکە چەند هەنگاوێکیان بەئاراستەی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، لەچەشنی ئازادکردنی گیراوەکانی یەکتری* و قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووانی دروستکردنی هەردوو بەنداوەکەی کوردستان لەلایەن حکومەتەوە[٣٢]، لەگەڵ

---

* لەڕاستیدا هەنگاوەکانی هەردوو لایەنەکە لەبارەی ئازادکردنی بەندو گیراوەکانەوە لەیەك ئاستدا نەبوو، بۆ نمونە (بارزانی) لەبروسکەی ژمارە (٣٤)ی (٢١/٢/١٩٦٤)دا جەخت لەسەر جێبەجێکردنی بەپەلەی ئەم بابەتە دەکاتەوەو دەڵێت:"هەموو ئەو بەندە میریانەو ئەهلییانەی بەهۆی شۆڕشەکەمانەوە گیراون بەر بدرێن بەبێ قەیدو شەرت وەرامی جێبەجێکردنی ئەم بروسکەیە بدەنەوە دەست بەجێ"، شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ. ل ٣٢. بەڵام بیرۆی رامیاریی پارتی لەگەڵ ئەوەدا نەبوو کەئەو هەنگاوە بەوشێوەیە جێبەجێ بکرێت، چونکە بەڕای ئەوان" هێشتا حکومەت نیوەی ژمارەی ئەوانی لەهەزارەها گیراوە بێ تاوانەکانی کوردستانی بەرنەدابوو" هـ س، ل ٣٢.

[٣٢] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٢٨-١٢٩.

ئەوەشدا حکومەت لەچوارچێوەی سیاسەتەکانی خۆیدا بۆ ئەو قۆناغە جەختی لەسەر جێبەجێکردنی ئەو بەندانەی ڕێککەوتنەکە دەکردەوە کەبەلای خۆیەوە زۆر گرنگبوون، وەکو پەلەکردن بۆ گێڕانەوەی دامودەزگاکانی حکومەت بۆ کوردستان* و گێڕانەوەی ئەو چەکە قورسانەی کە لەشەڕەکاندا دەست پێشمەرگە کەوتبوون، وەکو لەنامەیەکی حکومەتدا لەو بارەیەوە دەردەکەوێت**، هەر بۆ ئەو مەبەستەش حکومەت دووجار شاندی خۆی لەرۆژانی (١١/٣/١٩٦٤)و (١/٥/١٩٦٤)دا ناردە لای سەرکردایەتیی پارتی[٣٣]، (تالەبانی) لەم کۆبونەوەیەدا پرۆژەکەی بیرۆی رامیاری

---

* مایەی تێبینیە کە (بارزانی) بەشێوەیەکی نائاساییو بەبێ بەستنەوەی ئەو هەنگاوەی بەهەنگاوەکانی حکومەتەوە لەبەرامبەردا، ئاسانکاریی نواند، هەر بۆ نمونە لەبروسکەی ژمارە (٨٧)ی (٢/٣/١٩٦٤)دا هاتووە، "بروسکەتان ١٣٨ رۆژی ١/٣، (١) هێزی حکومەت ئەگەر ویستی بگەڕێتەوە ئەو شوێنانەی کەئێوە تێیدان داواتان لێ ئەکەم کەماوەیان بدەن. (٢)لەکاتی هاتنی هێزی حکومەتا بۆ ناوچەکەتان پێویستە شوێنەکانی خۆتان بەربدەنو بکشێنەوە دواترەوە..٣) ئەگەر شوێنتان تەنگە هێزەکانتان بکشێننەوە بۆ لای من. ٤) هەڵگیرسانی شەڕ لەبەینی ئێوەو حکومەتا ئەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەبەینی منو ئێوەشا. بەپەلە لەوەرگرتنو جێبەجێکردن ئاگادارمان بکەن". شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ٣٣.

** بۆ دەقی نامەکە بڕوانە، هـ س، ل ٤٠.

[٣٣] شاندی یەکەم پێکهاتبوو لە: عمید رەشید موسلح وەزیری ناوخۆ، لیوا عبدالرحمن عارف بریکاری سەرۆك ئەرکانی سوپاو ابراهیم فیصل الانصاری فەرماندەی تیپی دووەمو سعید قحطان فەرماندەی تیپی چوارەمو عبدالرزاق محمود پارێزگاری سلێمانی، بەڵام شاندی دووەم پێکهاتبوو لە: عبدالرحمن عارفو ابراهیم فیصل الانصاریو یاوەرەکانیان، بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٣٠.

خستەبەردەم نوێنەرانی حکومەت، بەڵام (طاهر یحیی) بەبیانووی جوداخوازیو دروستکردنی دەوڵەتی کوردییەوە پرۆژەکەی رەتکردەوەو (بارزانی)ش هەر لەچوارچێوەی ناکۆکیو دووبەرەکی نێوانیاندا رایگەیاند کە ئەوە پرۆژەی ئەوو میللەت نییە![٣٤]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (طاهر یحیی) داوای لە (بارزانی) کرد کەپارتی هەڵوەشێنێتەوەو چەك دابنێنو ئەفسەرە هەڵاتووەکانی ناو سوپای عێراقی کەسەر بەپارتی کۆمۆنیستی عێراق بوون بدەنەوە دەست حکومەت، بەڵام (بارزانی) بەو داواکارییە قایل نەبوو، هەرچەندە بەتووندیش بەرپەرچی نەدانەوە[٣٥]، هەر لەدرێژەی هەوڵە دیپلۆماسیەکاندا شاندێکی حکومەت بەسەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران (طاهر یحیی) لە (٢/٦/١٩٦٤)دا گەیشتە رانیەو لەگەڵ شاندی کوردیدا وتوویژیان لەبارەی دەستوری کاتیی عێراقەوە کرد کە (٤/٥/١٩٦٤) بڵاوکرابووەوە بەتایبەتی لەبارەی هەڵوێستی دەستورەکەوە لەمافەکانی گەلی کورد بیروڕایان گۆڕیەوەو لەئاکامدا (طاهر یحیی) بەڵێنی هەمووارکردنی دەستورەکەیدا بەجۆرێك بەراشکاوی باس لەبوونی گەلی کوردو مافەکانی بکات، بەڵام بەڵێنەکەی نەبردە سەر[٣٦].

---

[٣٤] بڕوانە: ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٥٧.

[٣٥] بڕوانە: هـ س، ل ل ١٥٧-١٥٨

[٣٦] شاندەکەی حکومەت پێکهاتبوو لە: طاهر یحیی ی سەرۆك وەزیران، عمید رشید مصلح وەزیری ناوخۆ، ابراهیم ئەلئەنساری فەرماندەی تیپی دووەم، هادی خماس بەڕێوەبەری هەواڵگری سەربازیو عبدالرزاق سید محمود پارێزگاری سلێمانی، شاندی کوردی پێکهاتبوو لە: مصطفی بارزانی، ئیبراهیم احمد، جەلال تاڵەبانی، وەژمارەیەك لەسەرۆك خێڵەکان، بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٣٠-١٣١.

لەو هەلومەرجەدا هەر وەکو چۆنو وتووێژەکانی نێوان حکومەتو سەرکردایەتیی کوردی ئومێد بەخش نەبوون، هەر بەو شێوەیەش باری سەرکردایەتیی کوردیو ناکۆکی نێوان هەردوو باڵەکەی پارتی بەڕادەیەك بوو کەلێکترازانە مێژووییەکەی ناو سەرکردایەتیی پارتی ساڵی (١٩٦٤)ی لێکەوتەوە[٣٧]. بەبۆچوونی ئێمە گرنگترین هۆکارەکانی روودانی ئەو لێکترازانە بریتین لەم خاڵانە:

١-جیاوازیان لەڕووی ژینگەو پەروەردەی کۆمەڵایەتیو باری رووناکبیریو ئایدۆلۆجیەوە.

٢-جیاوازیان لەتێگەیشتنیان بۆ ژیانی پارتایەتیو رۆڵی پارت لەبزووتنەوەی نەتەوەیی گەلی کورددا.

٣-جیاوازیان لەدیدو بۆچووندا لەبارەی چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ سیاسەتەکانی حکومەتی عیراق بەرامبەر بەگەلی کوردو شێوازی هەڵسوڕاندنی سەرکردایەتیی کورد بۆ کاروباری بزووتنەوەکەی بەگشتیو پرۆسەکانی دانوستانکردن لەگەڵ حکومەتدا بەتایبەتی.

٤-ململانێ لەپێناو سەرکردایەتی کردنو دەسەڵاتداو، نزمی ئاستی هەستکردنیان بەبەرپرسێتیی مێژوویی لەبەرامبەر ناسکی قۆناغەکەدا.

---

پرۆژەکەی حکومەت کەوتووێژی لەسەرکرا لەپێنچ خاڵ پێکهاتبوو، بۆ دەقی پرۆژەکە بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ل ٢٥٨-٢٥٩.

[٣٧] لەبارەی وردەکارییەکانی تایبەت بەو لێکترازانەی ناو پارتی بۆ نمونە بڕوانە، دیڤید ادامسن وجرجیس فتح الله، الحرب الكردية وانشقاق عام ١٩٦٤، ط٢، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ١٩٩٩. منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٧٦-١٧٨، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ل ١٤٣، ١٨٣.

٥-رۆڵی نێگەتیڤی فاکتەری دەرەکی، بەتایبەتیش سیاسەتی حکومەتەکانی عیراق‌و ئێران‌و تورکیاو سوریاو دەستێوەردانیان لەکاروباری ناوخۆیی بزووتنەوەکەو هاندانی هەردوو لایەنە ناکۆکەکە بەئاراستەی ئاڵۆزترکردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان.

شایانی ئاماژەپێدانە کەناکۆکییەکان هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە تا دوا قۆناغەکانی پەرەسەندنی کاریگەری نێگەتیفیان لەسەر باری ناوخۆیی گەلی کوردو بزوتنەوەکەی‌و سەرکردایەتیەکەی بەجێهێشت، هەر بەو شێوەیەش لەسەر تێکڕای هاوکێشەی ململانێکەیان لەگەڵ حکومەتەکانی عیراقداو لەوێشەوە لەسەر باروپێگەی دانوستانکاری کورد لەبەرامبەر دانوستانکاری حکومەتی عیراقدا. لەو بارەیەوە دەشێت گرنگترین وێستگەکانی پەیوەندییەکانی نێوان دووباڵەکەی پارتی بەم شێوەیە پوخت بکەینەوە:

١-لە (١٧/٣/١٩٦٤)دا وتوویژی چڕوپڕ لەنێوان (بارزانی‌و ابراهیم احمدو عزیز شەمزینی‌و عمر مصطفی ) لەبارەی رێککەوتنی ئاگربەستەکەی (١٠/٢/١٩٦٤) ئەنجام دراو بەپێی هەندێك سەرچاوە لەئاکامدا پێکهاتن لەسەر قایل بوون بەو رێککەوتنە[٣٨]،

---

[٣٨] لەراستیدا پێناچێت کەگفتوگۆکانی نێوانیان بەپێکهاتن لەسەر رێزگرتن لەرێککەوتنی ئاگربەستەکەی رۆژی (١٠/٢/١٩٦٤) کۆتایی هاتبێت، چونکە لەگەڵ ئەو زانیاریانەی کەباڵی بیرۆی رامیاری پارتی لەبارەی ئاکامی سەردانەکەی (ابراهیم احمدو یاوەرانی) بۆ لای (بارزانی) خستوویەتیە روو، یەکناگرێتەوە، بۆ نمونە لەوبارەیەوە هاتووە:"لەبەرئەوەی کەمەلا مانەوەی وەفدەکەی قەڵادزێ لەژێر چاودێری خۆیا خراپ بەکارئەهێنا بۆ هاویشتنی گەلێ هەنگاوی تێکدەرانەی وا کەبۆ بەجێ گەیاندنی بەڵێنەکانی حکومەت پێویستن. وە لەبەرئەوەش بارزانی

بەڵام هێشتا (بارزانی) هەر بەچاوی بڕواو متمانەوە نەیدەڕوانییە (ابراهیم احمد).

لەدرێژەی ئەو بەد گومانییەدا، دواتر (بارزانی)، بڕیاریدا لەسەر لابردنی ژمارەیەك لەفەرماندەكانی پێشمەرگە كە لایەنگری باڵی بیرۆی رامیاری بوون، لەبەرامبەریشدا (ابراهیم احمد) كۆنفرانسی پارتی (كۆنفرانسی شەشەمی ماوەت)ی لە (٤/٤/١٩٦٤) دا بەستو تێیدا بڕیار لەسەر هەڵپەساردنی سەرۆكایەتییەكەی (بارزانی) بۆ پارتی دراو هاوكات شاندێكیان نارده لای (بارزانی) بۆ نێوانگیریو دۆزینەوەی رێگەچارەیەكی مام ناوەنجی، بەڵام هەوڵەكە بێ ئەنجام بوو.[٣٩]

٢-بیرۆی رامیاری لەبەیاننامەكەیدا كە لە(١٩/٤/١٩٦٤)دا بەناوی (رێكەوتنەكەی مشیر- بارزانی خۆبەدەستەوەدانە یان ماف وەرگرتنە؟!) بڕیارەكانی كۆنفرانسەكەی بڵاوكردەوە، كەتێیدا بەتوندی لەدژی رێككەوتنەكەو هەڵوێستی (بارزانی) لەو بارەیەوە وەستا[٤٠].

---

قبوڵی نەكرد كەئەو پرۆژە چاككراوەیەش بەحكومەت بدات كەوەفدەكە پێشكەشی كرد، بۆیە بەناچاری قەڵادزێی بەجێهێشتو گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی كۆنفرانسەكەی پارتی لێكرابوو تاوەكو داستانی رێككەوتنەكەی مشیر-بارزانیو فرمانەكەی خۆی بۆ بگێڕێتەوە.." شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ٣٦.

[٣٩] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٣٦-١٣٨. منذر الموصلی، س پ، ل ١٧٨.

[٤٠] بۆ دەقی بەیاننامەكە بڕوانە، شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ل ٢١-٥١.

**لەبەرامبەریشـــدا (بـــارزانی) داوای بەســـتنی کـــۆنگرەی پـــارتیی لەماوەیەکی دیاریکراودا کرد[41].**

**٣-لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لێکترازان روویداو کاریگەری لەسـەر بارودۆخی گشتی لەکوردستاندا بەجێهێشت.**

**دواتر لە (٢٤/٤/١٩٦٤)دا هەوڵە خۆماڵییەکانی ناوبـژیوانیو پێکهێنانەوەیان بەشـێوەیەکی کـاتیی سـەری گـرتو لەسـەر چـەند خاڵێك رێککەوتن، بەڵام سـەرەنجام جێبـەجێ نـەکران[42]، بـووە هـۆی ئەوەی کەگرژیو ئاڵۆزیەکانی نێوانیان درێـژە بکێشـێتو (بـارزانی) کۆنگرەی شەشەمی پارتی لـەرۆژانی (١-٩/٧/١٩٦٤) دا بەسـتو چەند بڕیارێکی لێکەوتەوە کەگرنگترینیان بریتیبوون لـە: درێـژەدان بەئاگربەستو وتووێژکردن لەگەڵ حکومەتـدا، دەرکردنـی (ابـراهیم احمد)و سیازدە ئەندامی تر، هەڵبـژاردنی سـەرۆكو ئەنـدامانی تـری لیژنەی ناوەندی پارتی[43]. بەڵام لایەنگرانی باڵی بیرۆی رامیاری دانیان بەدروستیو رەواییی کۆنگرەکـەو بڕیارەکانیـدا نـەنا[44]، تووشـی بـێ هیـوایی بـوون لەپێکهاتنـەوە لەگـەڵ (بـارزانی)دا[45]. بـەو شـێوەیە**

---

[41] لەبارەی تێکڕای هەڵوێستی (بارزانی) لەبارەی بڕیارەکانی کۆنفرانسی ماوەتـەوە، بۆ نمونە بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٣٨.

[42] لەبارەی ئەو خاڵانەی کە لەسەری پێکهاتن، بڕوانە، مسـعود البـارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٤٠-١٤١.

[43] بۆ دەقی بڕیارەکانی کۆنگرەی شەشەمی پـارتی، بڕوانـە، شـازین هێـرشو نـزار محەمەد، س پ. ل ل ١٩٧-٢٠٠. ئیـبراهیم جـەلال، س پ، ل ل ١٦٢-١٦٣، منـذر الموصلی، س پ، ل ١٧٨.

[44] بڕوانە: ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٦٤، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٤٤.

[45] بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٦٣.

زەمینەی رووبەڕووبونەوەی چەکداری لەنێوانیاندا لەجاران سازتربوو، کەسەرەنجام بەئاودیوبوونی لایەنگرانی باڵی بیرۆی رامیاری پارتی بۆ ناو خاکی ئێرانو خۆبەدەستەوەدانیان بۆ دەسەڵاتدارانی ئەو وولاتە لەماوەی نێوان (٢٤/٧-٢/٨/١٩٦٤)دا شکایەوە[٤٦].

لەو هەلومەرجەدا هەریەکە لەحکومەتەکانی ئێرانو عیراق لەلایەن خۆیانەوە بەجیا هەوڵیان دەدا ئەو دەرفەتە بقۆزنەوە، بەتایبەتیش پاش ئەوەی سەرەتای سەرهەڵدانی کاری چەکداری لایەنگرانی باڵی بیرۆی رامیاری لەدژی هێزەکانی پارتی سەر بە(بارزانی) لەسەر سنوورەکانی کوردستانەوە دەرکەوت، حکومەتی ئێران سیاسەتێکی دووفاقی لەبەرامبەریان پەیڕەو کرد، لەلایەکەوە بڕێك پشتگیریو یارمەتی پێشکەش بەباڵی بیرۆی رامیاری کردو لەلایەکی ترەوە هەوڵی سازشکردنو بەدەستهێنانی دۆستایەتی لەگەڵ پارتیدا دەدا، هەر لەو سەرو بەندەدا (بارزانی) هەرەشەی ئاراستەی حکومەتی ئێران کرد کەپشتیوانی لەنەیارەکانی نەکات[٤٧].

---

[٤٦] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٤٦، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٠٧، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ل ١٦٧-١٧٧.

[٤٧] لەوبارەیەوە بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٧٧. مسعود البارزانی. ب٣، س پ، ل ل ١٤٢-١٤٣، ١٤٨. لەبارەی هاوکاری ئێرانەوە بۆ لایەنە کوردیەکان لەو قۆناغەدا (عبدالکریم فرحان) دەڵێت: لەکۆبوونەوەیەکدا کەسەرۆك کۆماری عیراق ئامادەی بوو پێشنیازم کرد کەوەزیری دەرەوە سەردانی ئێران بکات، پاش ئەوەی کەدڵنیابووین لەپشتیوانیکردنی شۆڕشگێرە کوردەکانو چەکدارکردنیان لەلایەن ئێرانەوە. بڕوانە: عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١٦٠.

## باسی دووەم
## باری دەستوریی گەلی کورد لەسایەی یاسای ژمارە ٦١ی ساڵی ١٩٦٤ی ئەنجومەنی نیشتمانیی سەرکردایەتیی شۆڕش

لەگەڵ ئەنجامدانی کودەتای سەربازی بەسەر بەعسیەکاندا لە (١٨/١١/١٩٦٣)دا، ئەنجومەنی نیشتمانیی سەرکردایەتیی شۆڕش بەواژۆی سەرۆکەکەی (عبدالسلام عارف) بەیاننامەی ژمارە (١)ی دەرکرد[٤٨].

ناوەرۆکی بەیاننامەکە فەرمانڕەوایی تاکڕەوی رەهای لەرووی دەستوری‌و کردارەکیەوە بۆ (عبدالسلام) جێگیر کردو بوو بەدەروازەیەکی فەرمی بۆ دیکتاتۆریەت لەسەردەمی نوێدا[٤٩].

ئەمە وێڕای ئەوەی کەفەرمانڕەواکان رێوشوێنی نادیموکراسیان گرتەبەر بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات‌و، دانان‌و هەموارکردنی دەستورەکە. بەپشتبەستن بەیەکەمین بەیاننامە، دەستوری (٢٢/٤/١٩٦٤) کە لەئامادەکردن‌و بڕیار لەسەردان‌و پەسەندکردنی سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی وەزیران بوو دەرچوو[٥٠].

---

[٤٨] بۆ دەقی بەیاننامەکە بڕوانە، الوقائع العراقیە، ژمارە (٨٩٢)، لە (١٥/١٢/١٩٦٣)دا. ئەم بەیاننامەیە تەنها راگەیاندنێکی رامیاری بەگۆڕانی حکومەت‌و جێگرتنەوەی لەلایەن حکومەتێکی نوێوە نەبوو، بەڵکو رێکخستنی چەند کاروبارێکی لەخۆ گرتبوو کەسروشتی دەستورییان هەیە. بڕوانە د. رعد الجدة، س پ، ل ٧٥.

[٤٩] بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٨٦.

[٥٠] بڕوانە، د. رعد الجدة، س پ، ل ٧٥. دەقی دەستورەکە لە (الوقائع العراقیە)، ژمارە (٩٤٨)ی (٩/٥/١٩٦٤)دا بڵاو کرایەوە. دەرکردنی دەستورەکە لەلایەن

**دەسەڵاتدارانی عیراق لە (١٨/١١/١٩٦٣) تا دەرکردنـی دەسـتوری (٢٢/٤/١٩٦٤)، هیچ هەنگاوێکیان نەنا بۆ ڕێکخسـتنێکی بـاری دەسـتوری وڵات، جگــە لــەدەرکردنی یەکــەمین بەیاننامــەی ڕۆژی یەکەمی کودەتاکە[٥١].**

**دەستورەکە جگە لەبنەما یاساییە دەستوریەکان، بنەمای یاسـای ئاسایی لەخۆ گرتبوو وەکو بەندی (٩، ١٠)، کەدەکرا لەچوارچـێوەی یاسا ئاساییەکاندا، یان فەرعەیەکاندا ڕێکبخرێت[٥٢].**

**لەبارەی مافە دەستوریەکانی گەلی کـوردەوە، لەڕاسـتیدا نـە ئـەم دەستورەو نە بەیاننامەکانی پێشووتری حکومەتو نـە لێدوانــەکانی بەرپرسانی، هــیچ ئاماژەیــەکی بــۆ گــەلی کــوردو مافــەکانی لــەخۆ نەگرتبوو[٥٣].**

---

سەرۆك کۆمارو ئەنجومەنی وەزیرانەوە دژە لەگەڵ ئەرکو دەسـەڵاتەکانی ئەنجومـەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕشدا کەدەسەڵاتی یاسادانانەو گرنگترین دەسـەڵاتەکانی بریتیە لەیاسادانان. بڕوانە، د. حمید الساعدي، س پ، ل ١٧٦.

بڕوانە، د. رعد الجدة، س پ، ل ٧٥.

بڕوانە، هـ س، ل ٧٥.

بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٨٧.

## باسی سێیەم
## باری دەستوریی گەلی کورد لەسایەی دەستوری کاتیی (١٩٦٤/٤/٢٩)ی عیراقدا

بەمەبەستی پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕیانەی کە لەدەستورەکەی (٢٢/٤/١٩٦٤)دا هاتووەو[54] کارکردن بەئاراستەی جێبەجێکردنی رێککەوتنی نێوان هەردوو سەرۆك کۆماری میسرو عیراق لەسەر پێویستی رێکخستنەوەی سستمی دەستوری لەمیسرو عیراقدا پێش ئەنجامدانی هیچ هەنگاوێکی پێکەوە گرێدانی هەردوو دەوڵەتەکە[55]، پرۆژەی دەستوری کاتیی عیراق لە (٢٩/٤/١٩٦٤) لەلایەن لیژنەیەکی حکومەتەوە بەسەرۆکایەتی سەرۆك کۆمار دارێژراو ئەنجومەنی وەزیران رەزامەندی لەسەر دەربڕیو پاشان سەرۆك کۆمار پەسەندی کردو دەریکردو، تا رۆژی دەرکردنی دەستوری (٢١/٩/١٩٦٨) کاری پێکرا[56]. ئەم دەستورە دەسەڵاتی فراوانی بەسەرۆك کۆماردا، دەسەڵاتی ئاسایی و لەئاسایی بەدەر، بەجۆرێك کەدامودەزگاکانی تری حکومەت رۆڵی پەراوێزییان بۆ مایەوە[57].

---

54 بڕوانە، د. رعد الجدة، س پ، ل ٨٣.

55 بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٨٨.

56 بڕوانە: د. حميد الساعدي، س پ، ل ل ١٧٨-١٧٩.

57 بڕوانە، هـ س، ل ل ١٨٠-١٨١، ١٨٣. شایانی ئاماژە پێدانە کە بۆ پتر چەسپاندنی دەسەڵاتی تاکڕەوی سەرۆك کۆمار، لەرۆژی (٨/٩/١٩٦٥)دا هەڵوەشانەوەی یاسای (ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش) راگەیەندراو دەسەڵاتەکانی دران بەئەنجومەنی وەزیران!؟، بڕوانە، هـ س، ل ١٨٣.

(عبدالسلام عارف) یەکێك بوو لەسەرۆکە توندڕەوەکان کە لەگەڵ گرتنەبەری ڕێگەچارەی سەربازی بوو بۆ یەکلاکردنەوەی دۆزی کورد[58]، تەنانەت بەدەربڕینی ئامادەیی خۆی بۆ بەشداریکردنی ڕاستەوخۆ لەشەڕدا[59] ئەوەی سەلماند، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیی ئاگربەستو ئەنجامدانی وتووێژی دەربڕی لەگەڵ سەرکردایەتیی پارتیدا، بەمەبەستی بەدەستهێنانی کاتو چەسپاندنی پێگەی دەسەڵاتەکەیو خۆسازدانەوە بۆ خولێکی تری ململانێی سەربازی، سەرەنجام ڕێککەوتنی ئاگربەستی (١٠/٢/١٩٦٤)ی لێکەوتەوەو بڕگەی یەکەمی بەیاننامەکەی سەرۆك کۆمار باس لەجێگیرکردنی مافە نەتەوەییەکانی کورد لەدەستوری کاتی عیراقدا دەکات*.

بەڵام حکومەت بەڵێنەکانی خۆی لەم بارەیەوە بەجێ نەهێنا، بەجۆرێك کە لەدەستوری (٢٩/٤/١٩٦٤)دا جگە لەبەندی (١٩) کە لەچوارچێوەی دەروازەی سێیەمی تایبەت بەمافو ئەرکە گشتیەکانداو بەشێوەیەکی تەمومژاویو سەرپێیی ناوی کوردو مافە نەتەوەییەکانی هێناوە**، هیچ بەندێکی تایبەتی بۆ گەلی کوردو

---

58 بڕوانە، د. سعد ناجي جواد، س پ، ل ١٠٤.

59 بڕوانە، عبدالكريم فرحان، س پ، ل ل ١٦٠-١٦١.

* دەقی بڕگەی یەکەم: "دانپێدانان بەمافە نەتەوەییەکانی برا کوردەکانمان لەچوارچێوەی گەلی عیراق لەیەکێتییەکی نیشتمانی برایانەداو جێگیرکردنی ئەمە لەدەستوری کاتیدا"، بۆ دەقی ئەم بڕگەیە، بڕوانە، حبیب محمد کریم، س پ، ل ٢٤٧. مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ١٢٨.

** بەندی نۆزدە: "عیراقییەکان لەمافو ئەرکە گشتییەکاندا یەکسانن بەبێ جیاکاری بەهۆی ڕەگەز یان ڕەسەن یان زمان یان ئایین یان هەر هۆیەکی ترەوە. ئەم دەستورە دان بەمافە نەتەوەییەکانی کوردەکاندا دەنێت لەناو گەلی عیراقدا

مافەکانی تەرخان نەکردووە، کەئەمەش پاشەکشەیە لەدەسکەوتە دەستورییەکانی پێشووتری کورد، بۆ نمونە بە بەراوردکردن لەگەڵ بەندی سێیەمی دەستوری کاتی عیراقی ساڵی (١٩٥٨)دا[٦٠].

سەرکردایەتیی کورد لەبەیاننامەکەی (١١/١٠/١٩٦٤)دا کەپێشکەش سەرۆك کۆماریان کرد داوای هەموارکردنی بڕگەی کۆتایی بەندی (١٩)یان کرد کەتێیدا بەدەقی ئاشکرا دان بەمافەکانی گەلی کورددا لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عیراقدا بنێت، بەڵام حکومەتی عیراق لەپاش شکستهێنانی ڕێوشوێنی سەربازی، لە (٨/٩/١٩٦٥)داو لەچوارچێوەی پرۆسێسی هەموارکردنی دەستورەکەدا، بەندی (١٩)ی بەشێوەیەکی نیوەچڵی هەموار کرد[٦١].

---

لەیەکێتییەکی نیشتمانی برایانەدا". بڕوانە: د. رعد الجدة، س پ، ل ٨٦. ئەم بەندە هەموار کرا بەپێی بەندی یەکەم لەدووەمین هەموارکردن لە (٨/٩/١٩٦٥)دا. بڕوانە، هـ س، ل ٨٦.

60 بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ. وە بۆ دەقی بەندی سێیەمی دەستوری کاتی (١٩٥٨)ی عیراقی، بڕوانە، د. رعد الجدة، س پ، ل ٦١.

61 بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٩٧. لەسەرەتادا دوا بڕگەی دەقەکە بەم شێوەیە بوو: "ئەم دەستورە دان بەمافە نەتەوەییەکانیان لەناو یەکێتی عیراقدا دەنێت"، بەڵام دوای هەموارکردنی بەم شێوەیە داڕێژرایەوە: "عیراقییەکان لەماف و ئەرکە گشتییەکاندا یەکسانن بەبێ جیاکاری بەهۆی توخم یان رەسەن یان زمان یان ئایین یان هەر هۆیەکی ترەوە، ئەم دەستورە دان بەمافە نەتەوەییەکانی کوردەکان دا لەناو گەلی عیراقدا لە یەکێتییەکی برایانەدا دەنێت". د. رعد الجدة، س پ، ل ٨٦. لەراستیدا تەنانەت ئەم هەموارکردنەش لەئاستی ماف و خواستەکانی گەلی کورددا نەبوو، چونکە "داڕشتنە نوێیەکی ئەو بەندە لەپاش هەموارکردنی بەکردەوە کوردی

وێـڕای بەنـدی (١٩)، ژمارەیـەکی تـری بەنـدەکانی دەسـتورەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەریی نیگەتیڤیان لەسەر گەلی کـوردو مافەکانی بەجێهێشـتووە، گرنگترینیـان بەنـدەکانی (١، ٢، ٣، ٧٨، ٧٩) کە بەم شێوەیەیە:

لەبەندی یەکەمـدا*، بەشـێوەیەکی دەسـتوریو بەچـەند جۆرێـك نکۆڵی لەگەلی کورد کراوەو مافەکانی پێشێل کراوە، لەوانـە دانـانی کـەلتوری عـەرەبیو گیـانی ئیسـلامی بەبناغـەی ئـەو دەوڵەتـەی کەدیموکراتو سۆسیالیستی دەبێـت، وێـڕای ئـەوەی کەدامەزرانـدنی دەوڵەتێکی لەو چەشنە ئاستەمە لەسایەی سستمێکی فـەرمانڕەوایی تاکڕەو کەپشت بەسسـتمی تـاك پـارتی (یـەکێتیی سۆسیالیسـتی) دەبەستێتو هەروەها دەستورێکی لەو چەشـنەی کـەئاماژەی پێکـرا،

---

لەهەموو مافێکی نەتەوەیی سەربەخۆ داماڵی، چونکە دانی بەمافە نەتەوەییەکانی کورددا نا بەبێ ئەوەی دەستنیشانی مـاکی ئـەو مافانـەو بنـەما یاسـاییەکانی بـۆ ڕێکخستنی پرۆسێسکردنەکەی لەواقیعدا بکات، چ لەسەر بنچینەی نـا ناوەنـدێتی هەرێمی یان ئۆتۆنۆمی یان فیدرالیدا بێت..." شۆڕش حسن عمـر، س پ، ل ل ٩٧-٩٨. بۆ دەقی یاداشتنامەکە بڕوانە، شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ل ٢٤٠-٢٤٤. مسـعود البـارزانی، س پ، ل ل ٥١٩-٥٢٦. س ج. ادمـونز س پ، ل ل٣٨-٥٠.

* بەندی یەکەم: "کۆماری عیراق دەوڵەتێکی دیموکراسـی سۆسیالیسـتیەو ڕیشـەی دیموکراسیەتەکەیو سۆسیالیسـتیەکەی لەکـەلتوری عـەرەبیو گیـانی ئیسـلامەوە سەرچاوە دەگرێت. گەلی عیراق بەشـێکە لەنەتـەوەی عـەرەبو ئامـانجی یـەکێتیی گشتگیری عەرەبیەو حکومەت پابەندە بەکارکردن بۆ بەدیهێنانی لەنزیکترین کاتـدا کە بەیەکگرتن لەگەڵ کۆماری یـەکگرتوی عەرەبیـدا دەسـت پێـدەکات". د. رعـد الجدة، س پ، ل ٨٥.

پشتبەستن بەکەلتوری عەرەبیو ئیسلامی لەبارەی دیموکراسیەوە بۆ خۆی جێگەی پرسیارە، ئەمە سەرباری ئەوەی کەفەرامۆشکردنی ئایینو کەلتوری گەلانی تر لەعیراقدا. بەهەمان شێوە ئەو بڕگەیەی کەجەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەگەلی عیراقی بەشێکە لەنەتەوەی عەرەبیو ئامانجی بەدیهێنانی یەکێتیی عەرەبی سەرتاسەرییە، کەئەمەش نە لەگەڵ راستییە مێژووییەکانو نە لەگەڵ باری ئێستای پێکهاتەی ئیتنیکی لەعیراقو ئاواتو ئامانجی گەلانیدا یەک دەگرێتەوە[٦٢]. سەرکردایەتی کوردی لەبڕگەی چواردەمینی یاداشتنامەکەی (١١/١٠/١٩٦٤)دا پێشنیازی کرد کەدەقی ئەو بڕگەیە بەم شێوەی دابڕێژێتەوە "گەلی عەرەبی لەعیراقدا بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب"[٦٣]. پێشنیازی زیادکردنی بەندێکی کرد لەبارەی پەرەپێدانی نەتەوەی کوردەوە لەهەموو رووەکانەوە بەهەمان ئەندازەی پەرەسەندنی نەتەوەی عەرەب[٦٤]، هەروەها دابینکردنی مافەکانی ئەو کوردانەی کە لەدەرەوەی سنوری ویلایەتی کوردستاندا دەژینو[٦٥]، جێبەجێکردنی داخوازیەکانی گەلی کورد لەباشوور لەباری هاتنەکایەوەی هەر چەشنە یەککگرتنێکی عەرەبیدا[٦٦].

---

[62] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە، بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٩٢.

[63] دەقی یاداشتنامەکەی رۆژی (١١/١٠/١٩٦٤)ی سەرکردایەتی کوردی، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٥١٩-٥٢٦، پاشکۆی ژمارە (٢٠)ی سەرچاوەکە.

[64] بڕگەی شازدەیەمینی یاداشتنامەکە، بڕوانە، ھ س. ل ٥٢٦.

[65] بڕگەی شازدەیەمینی یاداشتنامەکە، بڕوانە، ھ س. ل ٥٢٦.

[66] بڕگەی حەڤدەمینی یاداشتنامەکە، بڕوانە، ھ س، ل ٥٢٦. بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ٩٣.

بەنـدی دووەم بـاس لەیەکپارچـەییی خـاکی عـیراق دەکـات*.

ناوەرۆکی ئەم بەندە بیانوو گرتنە بۆ سەرکوتکردنی کوردو هەڕەشـەی کورد بۆ سـەر یەکپارچـەییی خـاکی عـیراق، گوایـە جیاکردنـەوەی باشـووری کوردسـتان ئامـانجی دروشمـی راگەیەنـدراوی بزوتنـەوەی رزگاریخوازی نەتەوەییی کوردە، لەکاتێکـدا کـورد هەمیشـە پـرۆژەو داخوازییەکانی لەچوارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا خستۆتە روو[٦٧].

بەندی سێیەم باس لەئایینی دەوڵەتو زمانی فـەرمی دەکـات**، ناوەرۆکی ئەم بەندە چەند تێبینیەك هەڵدەگرێ گرنگترینیان ئەمانەن:

١-دانانی ئیسلام بەئایینی فەرمی دەوڵەتو بنـەمای بنچـینەیی دەستورەکەی، نکۆڵی کردنە لەئایینەکانی تـری نـاو عـیراقو، هـیچ رۆڵێکیـان لەبنـەما دەسـتوریو یاسـاییەکاندا نابێـت، ئەمـەش پێشێلکردنی مافی بڕواداارنی ئایینەکانی ترە، وێڕای ئـەوەی لەگـەڵ بنەماکانی دەوڵەتی دیموکراتیو عەلمانیدا دژ دەوەستێتەوە، بەتایبەتی لەگەڵ ئامانجو دروشمەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورددا.

٢-دانانی زمانی عەرەبی بەتاکە زمانی فەرمی دەوڵەت، نکـۆڵی کردنـە لەهـەبوونی زمانـەکانی تـری وەکـو کـوردیو پێشـێلکردنی مافێکی یاسایی پێشتر سەلمێندراوی گەلی کوردە. ناوەرۆکی ئەم بەندە گوزارشت لـەزاڵبوونی رەوتـی شۆڤێنێسـتی دەسـەڵاتدارانی عـەرەبی

---

* دەقـی بەنـدی دووەم: "کۆمـاری عیراقـی دەوڵـەتێکی خـاوەن سـەروەری تـەواوەو دەستبەرداربوون لەهیچ بەشێك لە خاکەکەی ناکرێت". د. رعد الجدە، س پ، ل ٨٥.

67 بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ل ٩٣-٩٤.

** دەقـی بەنـدی سـێیەم: "ئیسـلام ئـایینی دەوڵەتـەو بنـەمای سـەرەکی دەستورەکەیەتیو زمانی عەرەبی زمانـە فەرمیەکەیـەتی". د. رعـد الجـدە، س پ، ل٨٥.

عیراق لەو قۆناغەدا دەکات، بەمەبەستی خۆسەپاندنو سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی گەلانی تری عیراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی. ئەم هەنگاوە نکۆڵی کردنو پاشەکشەکردنە لەلایەن حکومەتەوە لەبەڵگەنامە یاساییو دەستورییەکانی پێشووتری دەوڵەتی عیراق، بۆ نمونە[٦٨]:

-بەندی (١٧)ی یاسای بنچینەیی عیراقی ساڵی ١٩٢٥.

-یاسای زمانە ناوچەییەکان لەعیراقدا ساڵی ١٩٣١.

راگەیاندنی عیراقی لە ١٩٣٢/٨/٣٠.

-دەستوری عیراق ١٩٥٨/٧/٢٧.

-بڕگەی یەکەمی بەیاننامەی حکومەت لە (١٩٦٤/٢/١٠)دا.

سەبارەت بەبەندی (٧٨و ٧٩) کەتایبەتن بەسوپای عیراقو پێکهاتە سەربازیو نیمچە سەربازییەکان لەولاتدا[*]، لەراستیدا پرسێکی ئاساییو بەڵکو چارەنووسسازە لەولاتێکدا کە لەبارێکی ئاساییداو لەسایەی سستمێکی فەرمانڕانی دیموکراسیدا دەژیتو دەستەبەری سەرجەم مافە رامیاریو مەدەنیەکانی گەلەکەی بەهەموو پێکهاتە جیاوازیەکانیەوە کردووە، کەخاوەنی یەك سوپای نیشتمانی بێتو رێگە بەدروستبوونی پێکهاتەی سەربازیو نیمچە سەربازی تر نەدرێت، بەلام ئەم راستیە لەباری دەوڵەتی عیراقدا بەدی ناکرێت، لەبەر ئەوە لەگەلی کورد چاوەڕوان نەدەکرا کەدەستبەرداری هێزی

---

[68] بۆ وردەکاریەکانی بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ل ٩٥و دواتری

[*] دەقی بەندی (٧٨): "تەنیا دەوڵەت هێزە چەکدارەکان دادەمەزرێنێت کەسوپاو پۆلیسو ئاسایشو دەرەك لەخۆ دەگرێت". وە دەقی بەندی (٧٩): "بۆ هیچ دەستەیەك یان گروپێك نییە پێکهاتەی سەربازی یان نیمچە سەربازی دامەزرێنێت". د. رعد الجدة، س پ، ل ٩٢.

چەکداری تایبەت بەخۆی بێت، مەگەر تایبەتمەندییەکانی لەناو سوپای عیراقدا پارێزراو بێت هەتا ئەو کاتەی مافەکانی دەستەبەر دەکاتو ئامانجەکانی بزوتنەوەکەی بەدی دەهێنێت، هەر لەبەر ئەم هۆیە سووربوونی حکومەتەکانی عیراق لەوتووێژەکاندا لەسەر هەڵوەشانەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستانو قایل نەبوونی سەرکردایەتیی کوردی بەو داخوازییە، هەمیشە یەکێك بووە لەخاڵە ناکۆکییە سەرەکییەکانی سەرنەگرتنی وتووێژەکانی نێوانیان.

لەبەرامبەر ئەوەدا حکومەتی عیراقی بۆ قۆستنەوەی ئەو بارودۆخە لەدژی حکومەتی ئێرانو تێوەگلاندنی گەلی کورد لەشەڕێکی گەورەتردا، شاندێکی خۆی نارده لای (بارزانی) لەچوارتاو ئامادەیی حکومەتیان بۆ هاوکاریکردنی ناوبراو لەدژی دەستێوەردانی ئێران دەربڕی[٦٩]. لەو هەلومەرجەدا سەرکردایەتیی پارتی هەنگاوێکی نا بەئومێدی پتر سەلماندنی نیازپاکی خۆیان بۆ حکومەت لەبارەی ئامادەییان بۆ وتووێژکردنو گرتنەبەری ڕێگەچارەی ئاشتیانە لەنێوانیاندا، لەڕێگەی بڕیارێکی کۆمیتەی ناوەندییەوە لە (١٥/٨/١٩٦٤)دا بەدەستهەڵگرتن بەشێوەیەکی کاتیی لەدروشمی (ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانو دیموکراسییەت بۆ عیراق)[٧٠].

---

[69] شاندەکە پێکهاتبوو لە: سەرۆك ئەرکان، فەرماندەی تیپی دووەم، بەڕێوەبەری هەواڵگری سەربازی، وەپارێزگاری سلێمانی، بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٤٨.

[70] بڕوانە: محمد احسان، س پ، ل ل ٤٣-٤٤.

-هەر لەچوارچێوەی هەوڵەکاندا بۆ ڕێکخستنەوەی پارتیو هێزی پێشمەرگەو کاروباری ناوچە ئازادکراوەکان لەداوی کشانەوەی دەزگا کارگێڕییەکانی حکومەت لە (٤/١٠/١٩٦٤)ەوە، لەلایەن سەرکردایەتیی پارتییەوە چەند هەنگاوێك نرا، لەوانە، بڕیاردان هەر لەو ڕۆژەدا لەسەر پێکهێنانی (ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش) (بڕوانە: هـ س، ل ٤٤، لەبارەی وردەکاریەکانی ئەنجومەنەکەو بیرۆی جێبەجێکردنەکەوە،

---

بڕوانــه: مســعود البــارزاني، ب٣، س پ، ل ل ١٤٩-١٥٠. شــاياني ئاماژەپێدانــه كەئەنجومەنەكە لەرۆژاني (٧-١٧/١٠/١٩٦٤)دا زنجیرەیەك دانیشتنی ئەنجامداو چەند بڕیــارێكی لێكەوتــەوە كــەدواتر لەبەياننامەكــەی پارتيــدا لــه (٢٥/١٠/١٩٦٤)دا راگەیەندرا، بۆ دەقەكەی بڕوانە: شازين هێرش‌و نزار محەمەد، س پ، ل ل ٢٥٢-٢٥٣)، و بیرۆی جێبــەجێكردن‌و دەركردنــی (دەســتوری ئەنجومــەنی ســەركردايەتی‌ی شۆڕشــی كوردســتانی عــيراق) لــه (٩/١٠/١٩٦٤)دا ((بــۆ دەقــی "دەســتور"ەكــه پــاش دەســتكاریكردنی لەچــوارەمین كۆبونــەوەی ئەنجومەنەكــەدا لــه (٢٣/٩/١٩٦٣)دا، بڕوانە: مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل ٥٠٢-٥١٦. شــاياني ئاماژەپێكردنــه كــه (ادمون غريب) بەهەڵە ناوی ئەنجومەنەكەو لیژنــەی راپەڕاندنەكــەی بــه (پەرلــەمان‌و ئەنجومەنی وەزیــران بــردووە). لــەو بارەیــەوە بڕوانــه: ادمــون غریــب، س پ، ل ٨٨)).

گرنگترین تەوەرەكانی دەستورەكە لەچەند خاڵێكدا چڕ دەكەینەوە:

١-دەستورەكە لەپێشەكییەك‌و بیست‌و شەش بەند پێكهاتووە.

٢-گەلی عیراق لەهەردوو گەلی ســەرەكی عــەرەب‌و كــوردو كەمینــەكانی توركمــانی‌و ئاشــوری‌و ئەرمــەنی‌و هــی تــر پێكــدێت، پێویســته كۆمــارێكی دیموكراســی دوور لەچەوساندنەوەی نەتەوەیی دابمەزرێت، دان بەمافە نەتەوەییەكانی گەلی كورددا لەســەر بنچــینەی ئۆتۆنــۆمی بنرێــت. مەبەســتیش لــەدامودەزگاكانی تایبــەت بەناوچــەكە نەدامەزراندنی دوو دەسەڵاتییە لەكوردستانداو نەجیاكردنەوەیەتی لەعیراق.

٣-لەبارێكدا هەر پرۆسەیەكی یەكبوون یان یەكگرتنی عەرەبی بێتە كایەوە، پێویســته پرس بەگەلی كورد بكرێت‌و رێوشوێنەكانی گەشەسەندنی نەتەوەیی بەهاوشێوەی ئــەوەی نەتەوەی عەرەب بۆ دابین بكرێت، ئەگینا بەناچاری رێوشوێنی دەستەبەركردنی ئازادی‌و پێشكەوتنی خۆی دەگرێتەبەر.

٤-گەلی كورد پشتیوانی لەكەمینــەكانی كوردســتان دەكــات‌و ئــەم دەســتوره دان بەمافــه كەلتوری‌و كارگێڕی‌و ئازادییە دیموكراتییەكانیان هاوشێوەی هاوڵاتیانی كورد دادەنێت.

٥-ئامــانج لــەدەركردنی دەســتورەكە رێكخســتنی دەســەڵاتەكانە بەچەشــنێك كــەبتوانێت راپەڕاندنی ئەركەكانی سەركردایەتی‌ی بزووتنەوەكەو دەركردنی یاساو سستم بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری كوردستان لەهەموو بوارەكاندا بگرێتە ئەستۆ.

٦-ناوەرۆكی دەستورەكە تەرخانكراوە بۆ رێكخستنی دەستوریی (ئەنجومەنی ســەركردایەتی‌ی شۆڕش) لەرووی پێكهاتەو پسپۆڕی‌و دەسەڵاتەكانی‌و رێكخســتنی دامودەزگــاو كاروبارەكــانی تری كوردستان لەڕووی رامیاری‌و سەربازی‌و كارگێڕی‌و دارایی‌و دادەوە.

## باسی چوارەم

## دوایین هەوڵە دیپلۆماسییەکانی پێش هەڵگیرسانی شەڕی بەهاری ساڵی (١٩٦٥)

(ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕش) لەدەستپێکی چالاکییە دیپلۆماسییەکانیداو بەواژۆی سەرۆکەکەی (بارزانی)، لە (١١/١٠/١٩٦٤) دا یاداشتێکی ئاراستەی سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیران کردو لەرێگەی نێردراوەکانییەوە (عەگید صدیق‌و شوکت عقراوی) گەیندرانە دەستی سەرۆك وەزیران[71]. یاداشتەکە لەچەند خاڵێکدا پوخت دەکەینەوە:

١-نزیکەی ساڵێکە وتووێژەکان درێژەیان هەیەو حکومەت هیچ هەنگاوێکی کردارەکی بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی گەلی کورد نەناوەو رادەی بڕوا بەیەکتری نەبوون فراوانتربووەو گەلی کورد هەست بەپیادەکردنی شێوەیەك لەشێوەکانی سیاسەتی ئەپارتاید دەکات، بڕی بودجەی تەرخانکراو بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ قەبارەی وێرانکاری‌و پێداویستییەکانی گەشەپێدانیدا یەکناگرێتەوە.

٢-لەسایەی رێککەوتنەکەدا پرۆسەکانی راگواستنی کوردو بەعەرەبکردنی کوردستان درێژەی هەیە.

---

[71] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٥٢. شلومونکدیمون، س پ، ل ١٠٩. (الموصلی) ناوی (صالح یوسفی)ش دەهێنێت، بڕوانە: منذر الموصلي، س پ، ل ١٧٩. وەبۆ دەقی یاداشتەکە بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٦٠-٣٧١. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٥١٩-٥٢٦. شازین هێرش‌و نزار محەمەد، س پ، ل ل٢٤٠-٢٤٤. س ج. ادموندز، س پ، ل ل١٤، ٣٨-٥٠.

٣-حکومەت سیاسەتی پاوانکردنی دەسەڵاتو چالاکی پارتایەتیو دوورخستنەوەی گەلی کورد لەبەشداریکردنی ئازادانە لەو بوارانەدا پەیڕەو دەکات، ئەو سیاسەتە ئەوە دەگەیەنێت کەدەبێت کورد ببێت بەعەرەب، کوردبوونی خۆی لەدەست بدات.

٤-هەرچەندە لەماوەی ئاگربەستەکەدا تا ئەوساتە، وتووێژی نێوانیان درێژەی هەبووە، بەڵام لەو دواییەدا سەرۆك وەزیران چارەسەری دۆزی نەتەوەیی کوردو دانپێدانان بەمافە سەلمێندراوەکانیدا بەمافی ئۆتۆنۆمیشەوە، بەهاتنەکایەوەی پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوەوە بەستۆتەوە، ئەو هەنگاوەش خۆدزینەوەیە لەچارەسەرکردنی کێشەکان، بەچەشنێك خۆدزینەوە بۆتە ڕێبازی حکومەت.

٥-پێویستە حکومەت داخوازی بەپەلەی گەلی کورد کەئۆتۆنۆمییە لەچوارچێوەی کۆمارێکی عیراقی دەستوری دیموکراسیدا جێبەجێ بکات، بەهاوشێوەی ئەو دەوڵەتانەی کەفرە نەتەوەن.

٦-فەرامۆشکردنی ناوەڕۆکی یاداشتەکە، گومان پتر دەکاتو پەیوەندییەکانو بارودۆخەکە بەرەو ئاقارێك دەبات کە لەبەرژەوەندیی گشتیی گەلانی عیراقدا نابێت.

٧-ئومێد دەخوازین کەحکومەت شاندێکی دەسەڵات پێدراو ئامادە بکات بۆ وتووێژکردن لەگەڵ شاندی کورددا، بەمەبەستی گەیشتن بەچارەسەرێکی یەکجارەکی کێشەکان.

## یەکەم: داخوازییەکانی کوردو لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنمان

تەوەرەیەکی سەرەکی یاداشتەکە بۆ خستنەڕووی داخوازییەکانی تایبەت بەمافەکانی گەلی کورد تەرخانکرابوو، کە لەچەند خاڵێکدا چڕیان دەکەینەوە:

١-هەمواركردنی دوابڕگەی بەندی نۆزدەی دەستوری كاتیی عیراقو دارِشتنەوەی بەم شێوەیە: "ئەم دەستورە دان بەمافەكانی گەلی كورددا دەنێت لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی یەكێتیی عیراقدا". لەراستیدا ئەم داواكارییە كرۆكی ئامانجو دروشمی بزوتنەوەكەیەو لەزۆربەی وتووێژەكاندا جەختی لەسەركراوەتەوە.

٢-پێكهێنانی ولایەت یان پارێزگای كوردستان لەو ناوچانەی كەكورد بەنیشتمانی خۆی دەزانێتو دامودەزگای یاسادانانو جێبەجێكردنو دادوەری تایبەت بەخۆی هەبێتو دەسەڵاتی بەرِێوەبردنی ناوچەكەیان هەبێت لەو سنوورەی كەلەگەڵ دەستوری وڵاتدا دژ نەوەستێتەوە، ئەم داخوازییە بۆ بەرجەستەكردنی چەمكی ئۆتۆنۆمی كوردستانە لەبواری دامودەزگاكانیو دەسەڵاتەكانییەوە.

٣-دەسەڵاتەكانی دامودەزگاكانی ئۆتۆنۆمی هەموو ئەو بوارانە دەگرێتەوە كە لەدەسەڵاتی حكومەتی ناوەندیدا نییە.

٤-چارەسەركردنی بەپەلەی كێشەی راگواستنو بەعەرەبكردنی ناوچە كوردییەكان.

٥-داخوازییەكانی تایبەت بەكاروباری داراییو كارگێڕیو مافە كەلتوریو زمانەوانییەكانی گەلی كورد.

٦-داخوازییەكانی تایبەت بەئازادكردنی زیندانیانی رامیاریو دەركردنی لێبوردنی گشتی.

٧-هەڵوەشاندنەوەو چەككردنی ئەو چەكدارانەی كەحكومەت پشتگیریان دەكات.

٨-هەمواركردنی بەندی یەكەمی دەستوری كاتیی عیراق كەتێیدا هاتووە، "گەلی عیراق بەشێكە لەنەتەوەی عەرەبی "گۆڕینی بۆ" گەلی عەرەبی لەعیراقدا بەشێكە لەنەتەوەی عەرەب".

٩-زیادکردنی بەندێك لەدەستورەکەدا تایبەت بێت بەگەشەپێدانی نەتەوەیی کورد بەهەمان ئاستی گەشەسەندنی نەتەوەیی عەرەب لەعیراقدا لەهەموو رووەکانەوە.

١٠-دابینکردنی مافی یەکسانی بۆ ئەو کەمینە کوردیانەی کە لەدەرەوەی سنووری ویلایەتی کوردستاندا دەژین.

١١-لەباری بەشداربوونی عیراق لەهەر پرۆسەیەکی یەکگرتنی عەرەبیدا، کوردستان دەبێتە هەرێمێکی یەکسان بەهەرێمەکانی تری ناو یەکێتییەکە لەڕووی ئەرك‌و مافەکانەوە بەناوی هەرێمی کوردستانەوە.

حکومەتی عیراقی لەسەردەمی یەکەمین کابینەی (طاهر یحیی)دا هەڵوێستێکی ئەوتۆی لەبارەی یاداشتنامەکەی (١١/١٠/١٩٦٤)ی سەرکردایەتی‌ی پارتی دەرنەبڕی*، بەڵام لەسایەی دووەمین کابینەیدا

---

* لەم بارەیەوە (ئەدمۆندز) دەڵێت: "حکومەت وەڵامی ئەمەی لەمانگی یازدەدا دایەوە بەداواکردنی هەڵوەشاندنەوەی هێزە چەکدارەکان‌و، دانوستانەکان بچڕان‌و.." س ج. ادموندز، س پ، ل ١٤. لەراستیدا حکومەت لەمانگی دوازدەداو لەرێگەی ناردنی شاندێکەوە بۆ لای (بارزانی) هەڵوێستی خۆی دەربڕی، وەکو دواتر دەیخەینە روو. (نکدیمون) لەبارەی هەڵوێستی (طاهر یحیی)وە دەڵێت، ناوبراو پاش بوونی بەسەرۆك وەزیران هەوڵیدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی باکوور بەپێی رێککەوتنەکە، بەڵام هەر زوو دەرکەوت کەنیازەکان بەئەندازەی پێویست راستەقینە نین‌و تا وای لێهات دەنگی بخاتە پاڵ ئەوانەی کەدەیانگوت کوردەکان بەوەندە واز ناهێنن کەپێیان دەدرێت، بەڵکو داوا لەحکومەت دەکەن کەزیاتریان بداتێ. بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٠٩.

هەر لەم هەلومەرجەدا لێکترازانی ریزەکانی پارتی‌و دابەشبوونی بۆ دووبەرەی دژ بەیەك، باری کوردی لەدانوستانەکاندا بێهێزتر کرد، وەکو دواتر روون دەبێتەوە،

نامەیەکی لە (٣/١٢/١٩٦٤)دا کە بەناوی (صـبحی عبدالحمیـد) وەزیری نێوخۆوە بوو، بەشاندێکی حکومەتدا بۆ (بارزانی) نـاردو لـە (٧/١٢/١٩٦٤)دا شاندەکە وتووێـژیان لەگەڵـدا ئـەنجام داو چـەند خاڵێکیان خستەڕوو[٧٢]، کرۆکی نامە ڕەخنەئامێزەکەی سەرۆك وەزیران لەچەند خاڵێکدا چڕ دەکەینەوە:

١-حکومــەت هۆکــاری ســەردانی نــەکردنو بەســەرنەکردنەوەی کوردستانی گێڕایەوە بۆ ئەو بارە ناجێگیرو نائارامیو پێشێلکاریانەی کەپێشمەرگە لەکوردستاندا هێناویەتیە کایەوە.

٢-حکومەت سەرکردایەتیی کوردی بەوە تاوانبار کرد کە لەپاش تێپەڕبوونی دە مانگ بەسەر ڕێککـەوتنی ئاگربەسـتەکەدا، هێشـتا

---

چونکە لـەو ماوەیـەدا بـەکردەوە دوو (پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان) بەدیـدەکرا، یەکەمیان بەسەرۆکایەتی (بارزانی)و دووەمیان بەرابەرایەتی بیرۆی رامیاری، بڕوانە: ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ١٧٩.

ئەو دووبەرەکییە کۆمەڵێك دیاردەی ناشیرینو ترسناکی بەدوای خۆیدا هێنـاو دواتـر وەکو نەریتێکی بەردەوام درێژەی کێشا، بۆ نمونە، پەنابردنە بـەر یارمـەتی وەرگـرتن لەداگیرکەرانی کوردستان بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێی نێوان، و هاندانی پێشمەرگە بۆ بەگژداچوونی هاوولاتیـانی کـوردو ئەنجامـدانی ڕەفتـاری نابـەجێ لەگەڵیانـداو تیرۆرکردنی رامیاری، و بەکارهێنانی وشەو ڕستەی نابەجێو ناوو نـاتۆری داتاشـراو لەململانێی رامیارییاندا، بڕوانە: ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ل ١٨٤-١٩٠.

[72] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٥٢-١٥٣. محمـود الـدرة، س پ، ل ٣٧٢. منذر الموصلي، س پ، ل ١٨٢، د. سـعد نـاجي جـواد، س پ، ل ١١٧. وەبـۆ دەقی نامەکەی (طاهر یحیی) بۆ (بارزانی) بڕوانە: محمـود الـدرة، س پ، ل ل ٣٧٢-٣٨٤. مسعود البـارزانی، س پ، ل ل ٥٢٩-٥٣٣.

هەر پابەندنەبوونە بەو خاڵەی کەتایبەتە بەچەکدانانی پێشمەرگەو گەڕانەوەیان بۆ سەر ژیانی ئاسایی خۆیان.

٣-بەرپرسانی حکومەت ئامادەن دیدار لەگەڵ (بارزانی)دا بکەن هەر کاتێك ناوبراو مەرجەکانی ڕێککەوتنەکە جێبەجێ بکات.

٤-حکومەت زۆرێك لەخاڵەکانی بەیاننامەکەی سەرۆك کۆماری جێبەجێکردەوەو جێبەجێکردنی خاڵەکانی تریش بەندە بەپابەندبوونی لایەنی کوردییەوەو ڕەخساندنی بارودۆخی ئارامی لەکوردستاندا.

٥-پێویستە وتووێژەکانی نێوان حکومەتو سەرکردایەتی‌ی کورد لەچوارچێوەی ڕێککەوتننامەکەی (١٠/٢/١٩٦٤)دا دەرنەچێت، هەروەها پێویستە یاداشتنامەی وا نەنێرن کەداواکاری لەتوانابەدەری لەخۆ گرتبێت. هەروەها داواکاری خۆبەڕێوەبردن لەبەیاننامەکانی تایبەت بەئاگربەستدا نەهاتووە، لەبەرئەوە باسکردنی ئەو جۆرە بابەتانە یارمەتیدەر نابێت بۆ هیچ گفتوگۆیەکی لۆجیکیانە.

٦-حکومەت پابەندبوونی خۆی بۆ هەردوو بەیاننامەکەی (١٠/٢/١٩٦٤)ی هەردوو لایەن دووپاتدەکاتەوەو داوای جێبەجێکردنی پابەندێتی لایەنی کوردی بەهەڵوەشاندنەوەی هێزی پێشمەرگە دەکات.

لەلێکدانەوەی ناوەرۆکی ئەو نامەیەدا وادەردەکەوێت کەمەبەستی حکومەت لەو قۆناغەدا بریتی بێت لە:

١-تۆمەتبارکردنی لایەنی کوردی بەجێبەجێ نەکردنی پابەندێتیەکانی ئەستۆی بەپێی ڕێککەوتنەکەی (١٠/٢/١٩٦٤)، وەبانگەشەکردن بۆ پابەندبوونی حکومەت لەوبارەیەوە، بەمەبەستی گوشارخستنەسەر کوردو لاوازکردنی باروپێگەی لەدانوستانداو ناچارکردنی بۆ کەمکردنەوەی داخوازیو مافەکانی.

٢-هەڵوەشاندنەوەی هێزی پێشمەرگەیکوردستانو داماڵینی بزووتنەوەی کوردی لەباڵە سەربازییەکەی تاوەکو لەکاتی ئاشتیدا پێگەو هەڵوێستی کورد لەدانوستاندا بێهێز بکات، هەروەها لەکاتی ململانێی چەکداریشدا بەئاسانترین شێوە کوردستان کۆنترۆڵ بکاتەوەو گەلی کوردو بزووتنەوەکەی ملکەچ بکات.

هەر لەو سەردانەدا، شاندەکە چەند خاڵێکیان وەك بۆچوونو پێشنیازی حکومەت خستەڕوو، کەپوختەکەی بریتییە لە[73]:

١-دانپێدانان بەنەتەوەی کورد وەکو راستییەکی چەسپاو، وەپابەندبوون بە بەعەرەب نەکردنی کوردەوە، رێگەدان بەخوێندن بەزمانی کوردی تا قۆناغی ناوەندی لە ناوچانەی کورد تێیدا زۆرینەن.

٢-بەشداریکردنی کورد لەفەرمانڕەواییدا بەهەمان شێوەی پێش ساڵی (١٩٦١) دەبێت بەبێ خۆکۆتکردن یان پابەندبوونێك.

٣-لەکاروباری دامەزراندندا، پرنسیپی یەکسانی پەیڕەو دەکرێتو، ئەنجومەنی راژە بەرپرسە لەو بوارەو رێگر نییە کەئەندامی کوردی تێدابێتو کارێکی ئاساییە کەوەزارەتەکان بۆ دامەزراندنی فەرمانبەران پتر بایەخ بەخەڵکی ناوچەکە بدەن.

٤-زمانی عەرەبی تاکەزمانی فەرمییە لەوڵاتدا.

---

[73] شاندەکەی حکومەت پێکهاتبوو لە: (صبحی عبدالحمید) وەزیری ناوخۆ، فەرماندەی تیپی دووەم، موتەسەریفی سلێمانی. بۆ دەقی پێشنیازەکانی حکومەت بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٧٦-٣٧٧. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٥٣٢-٥٣٣.

٥-پێویسته هێزی پێشمەرگە هەڵوەشێتەوەو ڕێوشوێنی بژێوی‌و گوزەرانیان بۆ دابین بکرێت.

٦-حکومەت قەرەبووی زیانلێکەوتووەکان دەکاتەوە.

٧-چەکداماڵینی ئەو چەکدارانەی کە حکومەت یارمەتییان دەدات بەندە بەئاساییبوونەوەی بارودۆخی ناوچەکەوە.

٨-(بارزانی) ژمارەیەك کەسایەتی‌ی کورد دەستنیشان بکات تاوەکو حکومەت ژمارەیەکیان هەڵبژێرێت بۆ ئەندامێتی (ئەنجومەنی شورا) کەبڕیار بوو بەم زووانە پێکبهێنرێت.

لەئاکامی لێکدانەوەی ناوەڕۆکی ئەم چەند خاڵەدا چەند سەرنجێکمان لەلا گەڵاڵە بوو، گرنگترینیان ئەمانەن:

١-پاشەکشێ‌و نکۆڵیکردنی حکومەت دەگەیەنێت لەهەموو ئەو پرۆژەو بەڵێنانەی کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی بەعسەوە تا ئەو ساتە بەسەرکردایەتی‌ی کورد درابوو، بەهەمان شێوەش بەرامبەر بە بزووتنەوەی گەلی کوردو ئەو هۆکارانەی کە لەپشت بەرپابوونییەوە بوو.

٢-پێشنیازی حکومەت بۆ چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی‌ی کورد لەچوارچێوەی سەلماندنی نیوەچڵی چەند مافێکی زمانەوانی‌و کارگێڕی لاوەکی‌و بەڵێنی بەشداریکردنێکی ڕەمزی لە (ئەنجومەنی شورا)دا دەرناچێت، بەو شێوەیە حکومەت لەباسکردنی چەمکەکانی ئۆتۆنۆمی‌و ناناوەندی پاشگەزبووەوە.

٣-پێداگرتنی حکومەت لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و هاوکات پاساو هێنانەوە بۆ جێبەجێنەکردنی داخوازیی سەرکردایەتی‌ی پارتی بەهەڵوەشاندنەوەی ئەو میلیشیا

چەکدارانەی کەحکومەت پشتیوانییان لێ دەکات‌و بۆ دژایەتیکردنی کورد بەکاریان دەهێنێ.

پرۆژەکەی حکومەت لانی هەرە کەمی ماف‌و داخوازییەکانی گەلی کوردی لەخۆنەگرتبوو، لەبەر ئەوە چاوەڕوان نەدەکرا ببێتە بنچینەیەکی پتەو بۆ ڕێککەوتن، لەسەر ئەو بنەمایەش سەرکردایەتی‌ی پارتی لەبەرامبەر ئەوەدا لە (١٠/١/١٩٦٥)دا لەرێگەی ناردنی شاندێکی کوردیەوە بۆ بەغداد کەپێکهاتبوو لە (حبیب محمد کریم، هاشم عقراوی، و عەگید صدیق ئامێدی) بۆچوونەکانی لەچەند خاڵێکدا خستەڕوو کەپوختەی ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە[٧٤]:

١-دیاریکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەسەر بنەمای ڕێککەوتنەکەی (١٠/٢/١٩٦٤)دا.

٢-سەلماندنی پرەنسیپی بەشداریکردن لەفەرمانڕەوایی‌داو پێویستە ڕێوشوێنەکانی دەستنیشان بکرێت.

٣-داواکردنەوەی مافە زمانەوانی‌و کارگێڕی‌و داراییەکانی پێشوو.

٤-قایل بوون بەوەی کەکۆمیتەیەکی هاوبەشی هەمیشەیی حکومەت‌و کورد سەرپەرشتی جێبەجێکردنی پرەنسیپی

74 لەبارەی دەقی ئەو خاڵانەوە بڕوانە: محمود الدره، س پ، ل ل ٣٧٧-٣٧٨. منذر الموصلي، س پ، ل ١٨٣. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ٥٣٣، پاشکۆی ژمارە (٢٢)ی سەرچاوەکە، شایانی ئاماژەپێدانە کەپارتی لەپێش ئەو هەوڵەداو لەبەیاننامەکەی (٢٣/١٢/١٩٦٤)دا بەناونیشانی (لەبارەی پلانی حکومەت بۆ ئاوەدانکردنەوەی باکوور)، ئاماژەی بەدوو راستیدا، ١-حکومەت هێشتا رارایە لەبارەی ناوهێنانی دۆزی کورد بەناوی راستەقینەی خۆیەوەو سورە لەسەر ناوهێنانی بەکێشەی ئاوەدانکردنەوەی باکوورو ئەو بابەتانەی کەپەیوەندیدارن پێوەی.

بەشداریکردن لەدەسەلآتداو سەرپەرشتیکردنی ناوچەی کوردی بکات، و دەشێت بارەگای لەپایتەخت بێت.

٥-گەڕانەوەی عەرەبە هاوردەکانی سەردەمی بەعس‌و ڕێگەدان بەهاتنەوەی کوردەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان.

٦-دامەزراندنی بەشێك لەهێزی پێشمەرگە لەبواری پۆلیس‌و پاسەوانی سەرسنووردا.

٧-هەڵوەشاندنەوەو چەکداماڵینی میلیشیاکانی هاوکاری حکومەت.

لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی ئەو پێشنیازانەی لایەنی کوردیدا، چەند تێبینی‌و ئەنجامێکمان لەلا گەڵاڵە بوو، گرنگترینیان ئەمانەن:

١-سەرکردایەتی‌ی پارتی گەڕانەوەی بۆ بڕیارەکانی ڕێککەوتننامەی ئاگربەستی (١٠/٢/١٩٦٤)ی نێوانیانی بەبنچینەی دیاریکردنی مافەکانی گەلی کورد دەزانێ.

٢-سەرکردایەتی‌ی پارتی لەژێر فشاری حکومەت‌و هەلومەرجەکەدا بەگشتی، وەبەمەبەستی درێژەدان بەوتووێژەکان‌و ڕێگرتن لەهەڵگیرسانەوەی جەنگ، داخوازییەکانی خۆی لەئۆتۆنۆمی‌و ناناوەندێتییەوە گۆڕی بۆ پرنسیپی بەشداریکردن لەفەرمانڕەوایی‌دا.

٣-پرۆسەی ڕاگواستنی کوردو بەعەرەبکردنی کوردستان درێژەی هەبووەو کۆتاییهێنان بەو پرۆسەیەو سڕینەوەی شوێنەوارەکانی داخوازییەکی سەرەکی سەرکردایەتی‌ی پارتی بووە.

٤-دەستبەرداربوون لەداخوازی مانەوەی هێزی پێشمەرگە وەك یەکەیەکی تایبەت یان سەربەخۆ، قایل بوون بەدامەزراندنیان لەبواری پۆلیس‌و پاسەوانی‌سنووردا، کەئەمەش پاشەکشەیە لەداخوازی‌و هەڵوێستەکانی پێشووتر لەوبارەیەوە.

شاندی کوردی لەبەغداد لەنامەیەکیدا کە لە(١٦/١/١٩٦٥)دا بۆ (بارزانی) ناردبوو دواهەنگاوەکانی پرۆسەی وتووێژەکانی نێوانیانی روونکردەوە، کەلێرەدا پوختەکەی بەم شێوەیە دەخەینە روو[٧٥]:

١-شاندی کورد لە (١١/١/١٩٦٥) دا کۆبوونەوەو وتووێژیان لەگەڵ وەزیری ناوخۆ (صبحی عبدالحمید)دا ئەنجامداو گەیشتنە چەند ئەنجامێك:

أ-فەرمانبەرانی ناوچەی کوردنشین لەموتەسەریف بەخوارەوە لەکورد دەبن.

ب-بەشێوەیەکی گشتی گواستنەوەی فەرمانبەران هەر لەناوخۆی ناوچەکەدا ئەنجام دەدرێت.

ت-بەشداریکردنی کورد لەپۆستە حکومییەکاندا لەوەزیرو بەرەو خوار بەرێککەوتن لەسەر رێژەیەکی دادپەروەرانە دەبێت.

پ-هەمووارکردنی دەستوری کاتیی عیراق لەسەر بنەمای دانپێدانان بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەسەر بنچینەی پرنسیپی بەشداریکردن لەفەرمانڕەواییدا)، هەروەها لەسەر بنچینەی ئەوەی (گەلی عەرەبی لەعیراقدا بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب).

ج-سەلماندنی زمانی کوردی وەك زمانی فەرمی لەدامودەزگاکانی ناوچەکەدا، خوێندنیش بەزمانی کوردی تا قۆناغی دواناوەندی دەبێت.

ح-سەبارەت بەباری پێشمەرگەش، ئەوانەی لەبواری پۆلیسدابوون لەدامودەزگاکانی ناوچەکەدا بەکاربخرێن، ئەوانەی لەسوپادا بوون بچنە ناو تیپی دووەمەوەو ئەوانیتر بچنەوە سەرکاری پێشوویان.

---

[75] بۆ دەقی نامەکە بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٥٢٧-٥٢٨.

خ-سەبارەت بەرێکخستنی رامیاری گەلی کوردیش، دواتر لەسەری رێکدەکەون.

د-حکومەت لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاو نەهێشتنی راگواستنو بەعەرەبکردنو قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکانەوە، نیازی هەیە هەنگاوبنێتو ئەو کارەش بەپرسێکی کۆتایی هاتوو دەژمێردرێت.

ژ-چارەنووسی ناوچەکان لەسەر بنچینەی رێژەی دانیشتوان یەکلادەکرێتەوەو پێشنیازکراوە بۆ پێکهێنانی (وەزارەتی کاروباری کوردی) کە کاروبارەکانی کارگێڕیو کەلتوریو فێرکردن لەکوردستاندا بگرێتە ئەستۆ.

هەردوو لایەنەکە رێککەوتن لەسەر ئەوەی کەهیچیان دەسەڵاتی بڕیاردانی کۆتاییان نیە، بەڵکو دەسەڵات لەلای سەرکردایەتی هەردوو لایانەو مەبەستیش لەو وتووێژانە تەنها راگۆڕینەوەیە.

هەر لەنامەکەدا هاتووە کەوەزیری ناوخۆ پاش سڵاوی بۆ سەرکردایەتیی پارتی، داوا دەکات کەپێویستە بەهەموان رێگە بەدرێژەکێشانی کاری سەرپێچیکردنو وروژێنەر نەدەنو حکومەتیش لەلایەن خۆیەوە کاری پێویست لەو بارەیەوە ئەنجام بدات.

٢-لە (١٦/١/١٩٦٥)دا شاندەکە سەردانی سەرۆك وەزیرانیان هەر بۆ دیدەنی کرد، و ناوبراویش پاش ناردنی سڵاو بۆ سەرکردایەتیی پارتی، بەڵێنیدا کەهەموو توانایەکی خۆی بخاتە گەڕ بۆ چارەسەرکردنی یەکجارەکی دۆزی کورد.

هەر لەنامەکەدا هاتووە کەئەنجومەنی وەزیران لەکۆبوونەوەی (١٧/١/١٩٦٥)ی خۆیدا گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتە دەکاتو، هەروەها لەبەرنامەدایە کە لەسێ شەممەدا کۆبوونەوە لەگەڵ

کۆمیتەیەکی وەزاریدا ئەنجام بدرێت کە لە(صبحی عبدالحمید)و دوو وەزیری تر پێکهاتووە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی وردتر بابەتەکە تاوتوێ بکەن، لەکۆتاییدا ئاماژە بەوەکراوە کەشاندەکە بەرێککاری لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکاندا کاردەکەن.

لەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی ئەو نامەیەدا چەند راستییەك ئاشكرا دەبێت کەدەکرێت بەم شێوەیە بیانخەینە روو:

١-وتووێژەکانی نێوانیان بۆ چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد لەباشووردا لەچوارچێوەی پرنسیپی بەشداریکردن لەفەرمانڕەواییدا ئەنجامدراو سەرەنجام گەیشتنە جۆرێك لەلێکتێگەیشتن لەسەر پرنسیپە گشتییەکان، کە بەبەراورد لەگەڵ پێشنیازەکانی پێشووی حکومەتدا کە لە (١٧/١٢/١٩٦٤)دا پێشکەشی کردبوو، لەچەند تەوەرێکیدا. بەگۆڕانێکی رێژەیی لەهەڵوێستەکانی حکومەتدا دەژمێردرێت، بۆ نمونە لەبواری داخوازی هەموارکردنی چەند دەقێکی دەستورەکەدا، کەراستەوخۆ پەیوەندیان بەمافەکانی گەلی کوردەوە هەیە، وێڕای مافە رامیاریو زمانەوانیو کارگێڕییەکانو پێودانگی دیاریکردنی ناوچە کوردییەکان، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بەسەرکەوتنی حکومەتی لەقەڵەم بدەین، چونکە توانی پرنسیپی بەشداریکردن لەفەرمانڕەواییدا لەبری ئۆتۆنۆمیو ناناوەندێتی بەسەر کورددا بسەپێنێت، ئەو چەمکەی کەهەر لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (قاسم)ەوە وەکو فۆرمێك بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد خرابووە روو.

بەلام لەخاڵی تایبەت بەچارەنووسی هێزی پێشمەرگە، هەڵوێستی حکومەت نەگۆڕبوو، لایەنی کوردییش نەرمی زۆری نواند، سەرباری ئەوەش هێشتا حکومەت چارەنووسی سێ بابەتی بەهەڵپەسێردراوی

هێشتەوەو شاندی کوردی بەشێوەیەکی بەرایی پێی قایل بوو، کەبریتی بوون لە: باری رێکخستنی رامیاری گەلی کوردو هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاکانو پێکهێنانی وەزارەتێك بەناوی وەزارەتی کاروباری کوردییەوە لەبری ناوی وەزارەتی کاروباری باکوور.

٢-سەردانەکەی شاندی کوردی بۆلای سەرۆك وەزیران تەنانەت ئەگەر بۆ دیدەنیش بووبێت، بایەخی رامیاریو دیپلۆماسی خۆی هەیە، چ بۆ پێشبینیکردنو خوێندنەوەی نیازو باری سەرنجی بەرامبەر بێت، یان بۆ بەدەستهێنانی دۆستایەتیو هاوسۆزی بێت بۆ گرتنەبەری رێگەچارەی ئاشتیانە.

٣-لەئاکامی گەیشتنی هەردوو شاندەکەدا بەو ئەنجامە، تاوتوێکردنی بابەتەکە گەیشتە ئاستی ئەنجومەنی وەزیران، دیارە بایەخی ئەو کارەش لەوەدا دەبێت ئەگەر ئەنجومەنەکە بەجۆرێك بڕیار لەسەر بابەتەکە بدات کە بەئاراستەی چارەسەری ئاشتیانەو دادپەروەرانەی کێشەکە کۆتایی بێت، بەڵام ئەگەر هەڵوێستی حکومەت بەپێچەوانەوە بێت، ئەو کاتە ئامانجو سیاسەتەکانی حکومەت لەوبارەیەوە بەشێوەیەکی روونتر بۆ سەرکردایەتیی کوردیو رای گشتی ئاشکرادەبێت.

٤-هەر لەمیانەی ئەو پرۆسەیەدا، نیازی دووبارەکردنەوەی دانیشتنەکان لەگەڵ وەزیری ناوخۆو فراوانترکردنی چوارچێوەکەی بەبەشداریکردنی دوو وەزیری تر. لەدوای کۆبوونەوەکەی ئەنجومەنی وەزیرانەوە، هێمایەکە بۆ بەردەوامبوونو بەرەو پێشچوونی پرۆسەکە.

له (١١/٢/١٩٦٥)دا وەزارەتی ناوخۆ نووسراوێکی ئاراستەی موتەسەریفی سلێمانی کردو رای حکومەتی لەبارەی چارەسەری

دۆزەکەوە تێدا خستەڕوو، کەدەکرێت ناوەرۆکەکەی بەم شێوەیە پوخت بکەینەوە[٧٦]:

١-ئاگادارکردنی (عەگید صدیق) لەڕای حکومەت لەبارەی ئەو کێشەیەوە کەهەر بەو شێوەیەیە وەکو پێشتر لەپازدە خاڵدا پێشکەش بەشاندی کوردی کرابو، بۆ ئەوەی لەلایەن خۆیەوە بیگەیەنێتە (بارزانی).

٢-هەروەها ئاگادار بکرێتەوە کەداخوازییەکەیان لەبارەی زیادکردنی وەزارەتێك بەناوی وەزارەتی کاروباری کوردییەوە کەهەموو لیواکانی باکووری لەهەموو رووەکانەوە پێوەببەسترێتەوە، پەسەند نییە، بەڵکو پێویستە هەر بەناوەکەی پێشوو‌بێت‌و بارەگاکەی لەبەغداد بێت. رێگە نادرێت بەدامەزراندنی لیوای نوێ یان بچراندنی قەزایەك‌و لکاندنی بەلیوایەکی ترەوە، هەروەها هێشتنەوەی یاخیبووە چەکدارەکان (هێزی پێشمەرگە) وەکو هێزێکی سێیەم بەهیچ شێوەیەك پەسەند نییە.

لەلێکدانەوەی ناوەرۆکی نووسراوەکەی وەزارەتی ناوخۆدا، سێ تێبینیمان لەلا گەڵاڵە بوو:

١-تێنەگەیشتنی حکومەت لەناوەرۆکی پرۆژەکەی شاندی کوردی کەپێشتر پێشکەشی کردبوو، راستتر بڵێین خراپ لێکدانەوەی پرۆژەکە، بەپێچەوانەی رووە راستەقینەکەی خۆیەوە، ئەوەش بەمەبەستی

---

[76] بۆ دەقی نامەکە بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٨٣-٣٨٤. مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ٥٣٦. هەروەها بۆ دەقی پازدە خاڵەکەی حکومەت بڕوات: محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٨٠-٣٨١، مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ٥٣٤.

**سەپاندنی گوشاری زیاتر بۆ سەر لایەنی کوردیو ملکەچکردنیان بۆ قایل بوون بەمەرجەکانی حکومەت.**

**٢-قایل نەبونی حکومەت بەپێبەخشینی هیچ چەشنە کەسایەتییەکی یاسایی یان وێژەیی رامیاری یان تەنانەت کارگێڕیش بەکوردستانو دامودەزگاکانی.**

**٣-سوربوونی حکومەت لەسەر بەدیهێنانی ئامانجێکی سەرەکی خۆی لەپرۆسەی دانوستانەکاندا کەبریتییە لەهەڵوەشاندنەوەو چەکداماڵینی هێزی پێشمەرگەی کوردستان.**

**لەبەر ئەو هۆیانە سەرکردایەتیی پارتیو شاندی دانوستانکار بەپرۆژەکەی پێشووی حکومەتو ناوەرۆکی نوسراوەکەی وەزارەتی نێوخۆ قایل نەبوون.**

**(الموصلی) لەم بارەیەوە دەڵێت: "کوردەکان بەپێشنیازەکانی حکومەت قایل نەبوونو لەوتوویێژەکانی داهاتوویاندا سوور بوون لەسەر ئەو داخوازییانەی کە لەیاداشتنامەکەدا هاتبوو"[77].**

---

[77] منذر الموصلي، س پ، ل ١٨٣.

شایانی ئاماژەپێدانە کە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عیراق) لەدووەمین کۆبوونەوەیدا لە (١٣-١٧/٢/١٩٦٥)دا چەند بڕیارێکی لەبارەی دەستورو یاسای ئەنجومەنەکەوە دەرکرد کە بەشێوەیەکی گشتی بۆ دەوڵەمەندکردنی ناوەرۆکەکەی بوو، هەروەها گوزارشتی لەتوندکردنی هەڵوێستی سەرکردایەتیی پارتی دەکرد لەرێگەی سەرلەنوێ بەرزکردنەوەی ئاستی داخوازیەکان لەڕووی ناوەڕۆکەوە بۆ ئاستێکی باڵاتر، بەبەراورد لەگەڵ داخوازییەکانیان کە لەدوای رووخانی حکومەتی بەعسەوە هەمیشە لەداکشاندابوو، لێرەدا پوختەی چەند خاڵێکیان دەخەینەڕوو: "پێویستە کۆمارێکی عیراقی بەبێ هیچ شێوە چەوساندنەوەیەکی نەتەوایەتی پێکبهێنرێتو دان بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی

هەر لەسەر ئەو بنچینەیە (بارزانی) لە (١٨/٢/١٩٦٥)دا نامەیەکی لەو بارەیەوە ئاراستەی موتەسەریفی سلێمانی کردو تێبینییەکانی خستەڕوو، کەلێرەدا ناوەڕۆکەکەی پوخت دەکەینەوە[٧٨]:

١-ئەو پێشنیازو داخوازیانەی کە لەرێگەی شاندی کوردییەوە پێشکەش بەحکومەت کران، شتی واقعیو کردارەکینو هیچ زیادەڕەوییەکیان تێدا نییەو لایەنی کەمی ئامانجەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، یان هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی تر لەجیهاندا بەرجەستە ناکات.

٢-شاندی کورد داوای دامەزراندنی وەزارەتێکی بەناوی وەزارەتی کاروباری کوردییەوە نەکردووە کەهەموو لیواکانی باکووری لەهەمو ڕووەکانەوە پێوە بەندبێت، بەڵکو داوای گۆڕینی ناوی وەزارەتی کاروباری باکوور کراوە کە بەناوی وەزارەتی کاروباری کوردییەوە دەبێت ئەرکی سەرپەرشتیکردنی کاروبارەکانی کارگێڕیو ڕووناکبیری لەناوچەی کوردیدا بگرێتە ئەستۆ، لەبەر ئەوە پێویستە حکومەت جیاوازی نێوان هەردوو دەربڕینەکە ڕەچاو بکات.

٣-ئەو خاڵانەی کەحکومەت بۆ چارەسەرکردنی (کێشەی باکوور) دایناوە، زەحمەتە بتوانین پێی قایل بین، چونکە پابەندێتیەکانی بۆ

---

کورددا لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی بنرێت.. وەبوونی سوپای شۆڕشگێری کوردستان گرەنتییەکی پێویستە بۆ مانەوەی کورد کەهەڕەشەی لەسەرە.. وەلەباری ئەنجامدامی هەریەکبوونو یەکێتییەکی نێوان عیراقو هەر وڵاتێکی تردا، گەلی کورد خۆی بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆی دەدات. "بۆ دەقی بڕیارەکانی ئەنجومەنەکە، بڕوانە: شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ل ٢٧٠-٢٧١. بەڵگەنامەی ژمارە (٣٧)ی سەرچاوەکە.

[78] بۆ دەقی نامەکە بڕوانە: محمود الدرة، س پ، ل ل ٣٨٤-٣٨٥. منذر الموصلي، س پ، ل ل ١٨٣-١٨٤.

ئێمه پتره لەمافەکان، لەبەرئـەوه هەولـدان بـۆ سـەپاندنیان بەسـەر ئێمـەدا جۆرێکـە لەئەسـتەمیو زیـادڕەوی کەپێشـتر بەرپرسـانی حکومـەت سەرکردایەتی کوردیان پـێ تۆمـەتبار دەکـرد، لەبەرئـەوه کـورد خوازیـاره کەحکومـەت چـاو بەپێشـنیازو داخوازییەکانیـدا بخشێنێتەوه بەجۆرێك لانی کەمی داخوازییەکانی بزووتنەوەکەی کورد دابـین بکـاتو شـکۆی دەولـەت بپارێزێـتو یـەکێتیی نیشـتمانی بچەسپێنێت.

کەواتە ئامانج لەناردنی ئەو نامەیە روونکردنەوەی سـێ تـەوەرەی سەرەکی بوو:

١-گەلی کورد لانی کەمی داخوازییـەکانی خسـتۆتە روو، لەبـەر ئەوه چیتر بواری دەستبەرداربوونی مافی تر نەماوه.

٢-روونکردنەوەو راستکردنەوەی چەواشـەکارییەکانی حکومـەتو رێگرتن لەپتر قۆستنەوەی لەلایەن حکومەتەوه بۆ چەواشـەکردنی رای گشـتیی نـاوخۆیی، بەتایبـەتیش لـەنێو رەوتـە شۆڤێنیسـتو توندڕەوەکانی سوپاو حکومەتدا.

٣-سـەرکردایەتیی کـورد ناچـێتە ژێـر بـاری پێشـنیازەکانی حکومەتو هەولەکانی سەپاندیان بەسەریدا، لەبـەر ئـەوه پێویسـتە لەسەر حکومەت کە بەسیاسەتو پێشنیازەکانیدا بچێتەوه.

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کەسەرکردایەتیی پارتی لـەو نامەیـەدا دەرگای لەسەر وتووێـژکردن لەگـەڵ حکومەتـدا دانەخسـت، بـەڵکو سنوورو چوارچێوەی گشتی هەڵوێستی بزووتنەوەکەی لەمەڕ ناوەرۆكو شـێوازی چارەسـەرکردنی ئاشـتیانەی کێشـەی نێوانیـان دیـاریکردو سنوورەکانی سازشکردنی رونتر خستەروو.

حکومـەت وەڵامـی نامەکـەی نەدایـەوه، بـەڵکو لـەبری ئـەوه نامیلکەیەکی بەناونیشانی (حکومەتی نیشتمانیو کێشەی بـاکوور)

بڵاوکـــــردەوە، کـــە لــــەبری راوبۆچـــوونی فــــەرمی خـــۆی خســـتیەروو[*]،کەســـەرلەبەری نکـــۆڵی کردنـــە لەگـــەڵی کـــوردو نیشتمانەکەی‌و مافە رەواکانی‌و تۆمەت خســتنە پــاڵ بزووتنەوەکـەو ســەرکردەکانێتی بـەجوداخوازی‌و بـەکرێگیراوی دوژمنــانی عــەرەب‌و ئاژاوەگێڕی‌و ...هتد.

هەر لەمانگی ئازاردا پـێش هەڵگیرسانەوەی شــەڕی کوردسـتان، (تاهیر یەحیا)ی ســەرۆك وەزیــران نامەیــەکی بــە(مســعود محمــد)ی وەزیری دەوڵەتدا بۆ (بارزانی) ناردو تێیــدا ئــارەزووی حکومــەتی بــۆ ئاشــتی دەربــڕی، لەبەرامبــەردا (بــارزانی) لەنامەیەکیــدا کــە لــە (١٢/٣/١٩٦٥)دا بە (شفیق ئاغا)و (ســردار حەمــە ئاغــا)دا بــۆ نــاوبراوی نــارد، پێشــنیازەکانی لایــەنی کــوردی لــەبارەی پرنســیپی بەشداریکردن لەفەرمانڕەوایی‌دا خستەڕوو، دیارە ئەمە دواهەوڵی خۆ دوورگرتن بوو لەرووبەرووبوونەوەی سەربازی لەگەڵ حکومەتدا[٧٩].

---

[*] (الموصلي) لــەبارەی ئــەو نامیلکەیــەوە دەڵێــت: "تــەنها ئاماژەپێــدان بەچــەند بڕگەیەکی بەسە بۆ خستنەرووی بیرۆکەیەك لەسەر ناوەرۆکەکەی‌و سروشتی ئاڵۆزیی بارودۆخەکەو چۆنێتی مامەڵەکردنی حکومەت لەگەڵ مەسەلەکاندا بەهەڵوێســتی دژبەیەك‌و ورووژێنەرو دوور لەنەرمی نواندن‌و راستگۆیی لەچارەسەرکردنی دۆزێکــی هەستیاری وەکو ئەمەدا.." منذر الموصلي، س پ، ل ١٨٤

[79] بڕوانــە: مســعود البــارزاني، ب٣، س پ، ل ٥٣٤. پــارتی لەبروســکەی ژمــارە (٥٢٦)ی (١٢/٣/١٩٦٥)دا دوابــاری پەیوەندییــەکانی لەگــەڵ حکومــەت‌و هەڵوێستی هەندێك لەوڵاتان لەم بارەیەوەو رێنماییەکانی پارتی بۆ ئەندامانی تێـدا رونکــردەوەو، لێــرەدا نــاوەرۆکی چــەند خــاڵێکی هەڵبــژاردەی پوخــت دەکەینــەوە: "لەهەموو کاتێکدا شەڕ مومکینە دووبارە ببێتەوە.. تــا ئێســتا ٤-٥ شــەڕ بــووە.. وەزیری دفاعی ئەمریکیش تصریحی داوە کەپێویستە قضیە ی کوردی بەسلمی حــەل بکرێت‌و.. ئێستا ضغط هەیە لەسەر عیراق لەلایەن سۆڤێت‌و جمهوریــەتی عــەرەبی

دەکرێت لێرەدا پوختەی پێشنیازو داخوازییەکان کە لەدەقی نامەکەی بارزانیدا هاتبوو لەچەند خاڵێکدا بخەینەروو[80]:

١-دووپاتکردنەوەی داخوازیەکانی پێشووی سەرکردایەتیی کوردی کە لەچەندین بۆنەی تردا دەربڕیبوو، لەبارەی مافە کارگێڕییەکانو کاروباری فەرمانبەرانی کوردو بەشداریکردنی کورد لەدامودەزگاکانی حکومەتی ناوەندیداو مافە زمانەوانییەکانو گەڕانەوەی دامودەزگاکانی کارگێڕی خۆجێییەتیو قەرەبووکردنەوەو ئازادکردنی زیندانییە رامیارییەکانو دەرکردنی بڕیاری لێبوردنی گشتیو هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاو چارەسەرکردنی کێشەی بەعەرەبکردنو چارەنووسی هێزی پێشمەرگەی کوردستانو پێکهێنانی لیوای دهۆك.

٢-مافی گەلی کورد لەپێکهێنانی رێکخراوی سیاسیی تایبەت بەخۆیو هاوکاریکردن لەگەڵ رێکخراوە عەرەبییە مۆڵەتدراوەکاندا.

٣-هەمووارکردنی دەستوری کاتیی عیراق ساڵی (١٩٦٤) لەسەر بنچینەی ئەوەی کەتەنها گەلی عەرەبی لەعیراقدا بەشێکە لەنەتەوەی عەرەبو دەستورەکە مافە نەتەوەییەکانی کورد لەسەر بنچینەی بەشداریکردنی راستەقینە لەفەرمانڕەوایی‌دا لەچوارچێوەی یەکێتیی عیراقدا بسەلمێنێت.

---

متحدەو هەندێك دەوڵەتی تر بۆ حەلکردنی مەسەلەکە بەشێوەی سلمیو شەڕ نەکەنەوە لەگەڵ کورد.. پێویستە پارتیمان بەو جۆرە ئیش بکات کەشەڕ دەبێتەوە" و.. هتد. بۆ دەقی بروسکەکە بڕوانە: شازین هێرشو نزار محەمەد، س پ، ل ل ٢٦٧-٢٦٨، بەڵگەنامەی ژمارە (٣٥)ی سەرچاوەکە.

[80] بۆ دەقی نامەکەی (بارزانی) بۆ (طاهر یحیی) لە (١٢/٣/١٩٦٥)دا، بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٥١٧-٥١٨، پاشکۆی ژمارە (٢٠)ی سەرچاوەکە.

٤-دیاریکردنی ناوچەی کوردەکان لەسەر بنچینەی سنووری جوگرافیایی کوردستانی عیراق.

٥-سەرکردایەتی‌ی کورد کاردەکات لەپێناوی دۆزینەوەی رێگەچارەی ئاشتییانەو ئەم پێشنیازە بەبنچینەیەکی واقعی‌و پەسەند بۆ ئەو مەبەستە دەزانێت.

ئەوەی لەناوەرۆکی ئەم نامەیەدا تێبینی دەکرێت پێداگرتنی سەرکردایەتی کوردییە لەسەر ئەو داخوازی‌و پێشنیازانەی کە لەماوەیەکی نزیکی بەر لەم نامەیەدا پێشکەشی حکومەتیان کردبوو، بەڵام حکومەت پەسەندی نەکرد، هەرچەندە لایەنی کورد لەو نامەیەدا داخوازی ئۆتۆنۆمی، یان ناناوەندێتی نەکردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا حکومەت ئامادەی سەلماندنی ئەو ئاستە نزمەی ماف‌و خواستانەی گەلی کوردی نەبوو، لەبەرامبەریشدا سەرکردایەتی‌ی پارتی ئامادەیی سازشکردنی لەوە پتری نەنواند، چونکە ئەنجامدانی کارێکی لەو چەشنە بزووتنەوەکەی لەکرۆکی ئامانجە سەرەکییەکانی دادەماڵی، لەبەرئەوە لەدوای ئەم هەنگاوانەوە، کۆتایهاتنی پرۆسەی وتووێژەکان‌و هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەلایەن حکومەتەوەو جارێکی‌تر بەلاوەنانی رێوشوێنە دیپلۆماسییەکان‌و گرەوکردنی لەسەر بەکارهێنانی هێزی سەربازی بۆ سەپاندنی مەرجەکانی خۆی بەسەر بزووتنەوەی کورددا کارێکی چاوەڕوان کراوبو لەلایەن سەرکردایەتییەکەیەوە، هەرلەبەر ئەو هۆیەبوو، لێرە بەدواوە بەگەرمی ئامادەکاریان بۆ بەرگریکردن لەدژی شاڵاوەکانی سوپای عیراقی دەستپێکرد.

بەم شێوەیە ئەو راستییە دەردەکەوێت کەناوەندی دەسەڵات‌و بڕیار لەحکومەتی عیراقدا بڕوای بەسەلماندنی مافە رەواکانی گەلی کورد نەبوو، هەر لەبەرئەوەیە ئامادەیی ئەوەی تێدانەبوو هیچ پرۆژەیەك یان

**هەنگاوێکی کردارەکی بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەو دادپەروەرانەی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد ئەنجام بدات، لەبەرامبەریشدا سەرکردایەتی‌ی پارتی پابەندبوو بەسازش نەکردن لەسەر پێشنیازەکانی خۆی کەلانی کەمی مافو داخوازییەکانی گەلی کوردی دەنواند، ئەوەش لەسەر بنچینەی ئەو راستیەی کەخاڵەکانی جیاوازی نێوان دیدوبۆچوونو پرۆژەکانی هەردوولایەن بەرادەیەك قووڵ بوو کەهیوای دانیشتنەوە لەسەر مێزی وتووێژ جارێکی تر لەئارادا نەمابوو، تا خولێکی تری ململانێی نێوانیان ئەو هەلومەرجە بەبارێکی تردا نەگۆڕێت، ئەو خولەی کەماوەی نێوان مانگی (٣/١٩٦٥-٢٩/٦/١٩٦٦)ی خایاند، کەرۆژی راگەیاندنی بەیانی رێککەوتنەکەی نێوانیان بوو.**

## باسی پێنجەم
## جەنگی حکومەت لەدژی کوردو شوێنەوارە سیاسییەکانی

لەئەنجامی بەنبەست گەیشتنی وتووێژەکانی سەرکردایەتیی کوردو حکومەتی عیراقەوە بەهۆی هاودژیانەوە لەڕووی ئایدیاو بەرژەوەندیو هەڵوێستەوە، شەڕی نێوانیان جارێکیتر لەمانگی شوباتی ساڵی (١٩٦٥)ەوە هەڵگیرسایەوە[٨١]، چونکە لەو ماوەیەی رابردودا حکومەت هیچ هەنگاوێکی یاساییو رامیاری راستەقینەی بەئاراستەی دانپێدانانو بەدیهێنانی لانی کەمی ئامانجو داخوازییەکانی کورد نەنا، دیارە ئەوەش لەبڕوای نەگۆڕی دەسەڵاتدارانی ناوەندی بڕیار لەحکومەتەکانی عیراقەوە سەرچاوەی گرتووە، کەهەمیشە گرەو لەسەر بەکارهێنانی رێگەچارەی سەربازی دەکەن بۆ سەرکوتکردنی گەلی کوردو بێبەشکردنی لەمافە نەتەوەییەکانی.

لەو هەلومەرجەدا حکومەتی ئێران هەوڵیدا بارەکە بەبەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە بەمەبەستی پتر فشار خستنە سەر حکومەتی عیراقو بێهێزترکردنی هەردوو لایەنە ناکۆکەکەی ناو عیراق، لەبەرئەوە نێردراوی خۆی رەوانەی لای (بارزانی) کردو دواتر بڕێک چەکو

---

[81] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦١. بۆ وردەکارییەکانی تایبەت بەشەڕەکانی ساڵی (١٩٦٥)ی نێوان حکومەتو کورد، بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٥٥-١٨٣. محسن دزەیی، احداث عاصرتها، ج٢، ط٢، مطبعة وزارة التربیة، منشورات دار ئاراس، اربیل، ٢٠٠٢، ص ص ١٠٢-١١٣.

تەقەمەنی پێشکەش کردو ڕێگـەی بەچارەسـەرکردنی بریـندارەکانی کورددا لەنەخۆشخانەکانی ئێراندا[82].

بەڵام لەبەرئەوەی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی ئاشتیخوازەو هاوکات بارودۆخەکەش لەزۆربەی رووەکانەوە بۆ کوردو بـاری هەڵگیرسـانەوەی شەڕ لەبارنـەبوو، (بـارزانی) لەمیانـەی هەوڵەکانیـدا بـۆ ڕێگـرتن لەبەرپابوونی شەڕو تەشەنەنەکردنی، نامەی بۆ دەسەڵاتدارانی میسرو سوریا نارد بۆ ئەوەی نێوانگیریان لەگەڵ حکومەتـدا بکـەن[83]، بـەڵام ئەو هەوڵەی بێ ئاکام بوو.

لەسەرەتای مـانگی تـەمموزی سـاڵی (١٩٦٥)دا گۆڕانکارییـەکی ڕێـژەییو کـاتیی بەئاراسـتەی یەکخسـتنەوەی سـەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی روویدا، بەپێکهاتنەوەی (بارزانی)و ئەندامانی تری سـەرکردایەتیی پـارتی، (ابـراهیم احمـد)ی سـکرتێری پێشـووی لێدەرچـێت کـە لـەئێران مایـەوە[84]، بـەڵام هـەر لەسـەرەتای سـاڵی (١٩٦٦)ەوە جارێکی تر خۆیان لەدوو بەرەی دژبەیەکدا بینییەوە.

لەبەرامبەردا دووبـەرەکیو ململانێـی نێـوان باڵـە رکابـەرەکانی حکومـەتی عێراقیـدا لەپەرەسـەندندابوو، بەتایبـەتی لـەنێوان (عبدالسـلام عـارف)ی سـەرۆك کۆمـارو (طـاهر یحیـی)ی سـەرۆك وەزیرانـدا کەسـەرەنجام لـە (٣/٩/١٩٦٥)دا ناچـارکرا دەسـت

---

[82] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٥٥-١٥٦. بەڵام لەکاتی شەڕەکانی مانگی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٦٦)دا جۆرێك لەساردی کەوتە پەیوەندییـەکانی نێوانیانەوە، و (بارزانی) حکومـەتی ئێرانـی بـەوە تۆمـەتبار کـرد کەرێککـەوتنی نێوانیانی جێبەجێ نەکردووە. بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٦٨.

[83] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٥٦.

[84] بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٦٦.

لەکاربکێشیێتەوەو لەبری ئەو (عمید روکن عارف عبدالرزاق) لە (٦/٩/١٩٦٥)دا دانراو پێکهێنانی حکومەتیان پێسپارد[85]، بەلاّم ناوبراو لەئاکامی هەولێکی کودەتای سەرنەکەوتوودا کە لە (١٦/٩/١٩٦٥)دا ئەنجامیدا، بۆ میسر هەلّهات[86].

لەبەرئەوە لە (٢١/٩/١٩٦٥)دا (عبدالرحمن بزاز)یان لەبری ئەو راسپارد بۆ پێکهێنانی حکومەت[87].

(خدوری) لەوبارەیەوە دەلّێت: "لەوانەیە ئارەزوی عارف بۆ تێکشاندنی گروپی یەکێتیخوازەکان لەناو سوپاداو دواتر چەسپاندنی دەسەلاّتی تاکرەوی خۆی پالّی پێوەنابێت بۆ دامەزراندنی فەرمانرەواییەکی مەدەنی لەولاّتدا"[88].

سەرۆك کۆمار لەو نووسراوەیدا کەبۆ ئەو مەبەستە بۆ (بزاز)ی نارد، ئامانجەکانی حکومەتی نوێی بەچەند خالّێك دەستنیشانکرد*.

---

[85] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٢٣-٣٢٥. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٦٨-١٦٩.

[86] بڕوانە: محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٣. د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٣٥، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل١٦٩.

[87] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل١٦٩.

[88] هـ س، ل ٣٣٨.

* پوختەی خالّەکان بریتییە لە: ١-بوژاندنەوەی باری گەل لەسایەی (سۆشیالیستیەکی عەرەبی ژیرانە)دا. ٢-چاکسازی لەبواری سستمی دەستوریو یاسای هەلّبژاردنو دامەزراندنی سستمێکی پەرلەمانی. ٣-سەروەریی یاسا. ٤-پارێزگاریکردن لەیەکپارچەیی خاکی عێراق وەك هەنگاوێکی پێویست بەرەو یەکێتیی نەتەوەیی عەرەب. ٥-کارکردن بەئاراستەی دانانی (یەکێتیی سۆشیالیستی عەرەبی) بەبناغەیەکی نیشتمانی بۆ کۆکردنەوەی هەموو هێزە

سیاسەتی حکومەتـەکانی عـیراق کەبـەبیانووی کارکردنیـان بـۆ بەدیهێنانی ئەو چەشنە ئامانجانە پیادە دەکرا، هەمیشـە نیگـەرانیان لەلای گەلی کوردو سەرکردایەتییەکەی دروستکردووە.

بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەریان لەسەر گەلەکـەو مافـەکانی بەجێهێشتووە، چونکە لەژێر پاساوی ئـەو ئامانجانـەدا هـەر چەشـنە داخوازیەکی کوردیان بۆ ئۆتۆنۆمی یـان ناناوەنـدێتی رامیـاری یـان کارگێڕی بەئامانجی جوداخوازیو هـەوڵی پارچەپارچـەکردنی عـیراق لێکداوەتەوە، لەچوارچێوەی چەمکی سەروەری یاسـاو یەکسـانیبوونی هاوولاتیاندا تایبەتمەندی نەتەوەیی گەلی کوردو مافەکانی فـەرامۆش کراوە، لەژێر ناوی کۆکردنەوەی هێزو توانا نیشـتمانییەکاندا هـەوڵی سەپاندنی سستمی فەرمانڕەوایی تاکڕەویو تاکپـارتیو رەتکردنـەوەی چەمکی ژیانی سیاسیی فرەیی دراوە، بانگەشەی بەهێزکردنی سوپای عیراق، لایەك ئەگەرەکانی بەکارهێنانەوەی بەگوڕتری لەجاران لەدژی گەلی کورد بەهێزتر دەکـرد، وەلەلایـەکی تـرەوە دەبـووە ئاسـتەنگێك لەبەردەم بەدیهێنانی داخوازییەکانی سەرکردایەتیی کوردی لـەبارەی پێویسـتی پاراسـتنی تایبەتمەنـدی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان لەچوارچێوەی سوپای عیراقدا، هەر بەهەمان شـێوەش لـەبارەی هـەر هـەنگاوێکی عیراقـەوە کـە بەئاراسـتەی هەرچەشـنە یـەکگرتنێکی عەرەبی بێت. ئەگەر لەپێشدا باروپێگـەی یاسـاییو سیاسـیی گـەلی کوردی تێدا رەچاو نەکرێت.

---

نیشـتمانیەکان. ٦-پەرەپێـدانی توانـا سـوپاییەکانی عـیراق. ٧-پابەنـدبوون بەراگەیاندنەکەی (٢٥/٥/١٩٦٥) لەبارەی سەرکردایەتیی رامیـاری یـەکگرتووی نێوان میسرو عیراقەوە. بۆ دەقی ئەو خالآنە بڕوانە: هـ س، ل ل ٣٣٨-٣٣٩.

حکومەتەکەی (بزاز) لەسەر ئاستی نێوخۆدا جەختی لەسەر بەدیهێنانی ئارامیو حوکمی یاسا دەکردەوەو بەڵێنی گێڕانەوەی ژیانی پەرلەمانی بۆ وڵات دەدا[89]. و هاوکات کۆتایهێنان بەجەنگی کوردستان یەکێك بوو لەو بابەتە سەرەکیانەی کەجێگەی بایەخی ئەو حکومەتەبوو، لەبەرئەوە لەوبارەیەوە بەڵێنی ئەوەیدا کەحکومەت چی لەتوانادا بێت بیکات بۆ "گێڕانەوەی ئاشتی تەواوەتی بۆ هەموو ناوچەکان لەعیراقداو دابینکردنی یەکپارچەیی خاکەکەی"[90]. هەر لەبارەی کوردەوە حکومەت رایگەیاند، "لەکاتێدا کەحکومەت دان بەمافە نەتەوەییەکانی برا کوردەکانماندا دەنێت، ئەو مافانەی کە لەدەستوری کاتیدا دەقی لەسەرداوە، ئەوا حکومەت بەراستگۆییو دڵسۆزییەوە ئارەزووی کارکردنی هەیە بەپێی دەقەکانی دەستورەکە.. یاسای نوێی کارگێڕی ناوچەیی ناسنامەی نەتەوەیی کوردی دەسەلمێنێتو هاووڵاتیانمان لەباکور بەهرەمەند دەکات لەپارێزگاریکردنی زمانو کەلتوری روناکبیریان، و ئەنجامدانی چالاکی ناوچەییان کەلەگەڵ یەکێتی وڵاتدا دژ ناوەستێتو بەهیچ شێوەیەك رێگە بۆ لەدەستدانی هیچ بەشێك لەخاکی نیشتمان خۆش

---

[89] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٤٠. (محسن دزەیی) لەم بارەیەوە دەڵێت: "بەزاز تاکە مەدەنی بوو کەپۆستی سەرۆك وەزیرانی لەدوای ساڵی ١٩٥٨ گرتە دەستو بیروبۆچوونی بەبەراورد لەگەڵ سەرکردەکانی سوپادا دیموکراسیو لیبرالی بوو، وەسیاسەتەکەی بەلای گەلی عیراقەوە بەگشتی پەسەند بوو". محسن دزەیی، س پ، ل ١٣١. بەبۆچوونی ئێمە ئەم هەڵسەنگاندنە یەك لایەنەیەو پشت بەرووکەشی کەسایەتی بەزازو سیاسەتە راگەیەندراوەکەی بەستراوە، نەك نێوەڕۆكو ئامانجو رووی راستەقینەی ئەو سیاسەتە وەکو دواتر تیشکی دەخەینە سەر.

[90] د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٤٠.

ناکات"[91]. هەرچەندە لەناوەرۆکی ئەم دەربڕینەدا ئاماژە بەدانپێدانانی حکومەت بە (مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد)دا کراوە، بەڵام لەراستیدا ڕاگەیاندنەکە لەچوارچێوەیەکی بەرتەسکی فۆرمی مافە کارگێڕیو زمانەوانیو کەلتورییەکان دەرنەچوو، هیچ ئامانجو ناوەرۆکێکی یاساییو رامیاری لەخۆ نەگرتبوو کەگوزارشت لەرووی راستەقینەی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد لەباشووردا بکات.

هێشتا جەنگی حکومەت لەدژی گەلی کوردستان درێژەی هەبوو، کاتێك (عبدالسلام عارف) لە (١٣/٤/١٩٦٦)دا بەهۆی ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی ئەو هیلیکۆپتەرەی کە لەقورنەوە بەرەو بەسرەی دەبردن، گیانی سپارد[92].

---

[91] د. مجید خدوری، س پ، ل ل ٣٤٠.

[92] بڕوانە: ھ س، ل ل ٣٤٩-٣٥٠.

-History. www.Findarticles.com.

-Iraq،History. www.infoplease.com.

## باسی یەکەم
## سیاسەتی حکومەت بەرامبەر بەگەلی کوردو هەڵویستی کورد بەرامبەر بەو سیاسەتە( ١٩٦٦/٤/١٧-١٩٦٦/٦/٢٩ )

له (١٧/٤/١٩٦٦)دا (عبدالرحمن عارف)ی برای (عبدالسلام عارف) لەکۆبوونەوەیەکی هاوبەشی نێوان ئەنجومەنی وەزیرانو ئەنجومەنی بەرگریی نیشتمانیداو لەپرۆسەی هەڵبژاردنێکی رواڵەتیدا کە لەنێوان سێ پاڵێوراودا بۆ سەرۆك كۆماری عیراق ئەنجامدرا، هەڵبژێردرا[1].

(بزاز) لە (١٨/٤/١٩٦٦) دا داوای دەست لەكاركێشانەوەی پێشكەش بەسەرۆك كۆماری نوێ كردو هەر لەو رۆژەدا ئەویش (بزاز)ی بۆ پێکهێنانەوەی حکومەت راسپارد[2]، و لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا داوای لەكورد كرد كەپارێزگاری لەیەكپارچەیی وڵات بكەنو هاوكاری برا عەرەبەكانیان بن لەدابینكردنی سەلامەتی نیشتمانو بەرزكردنەوەی ئاستی هەموو توێژەكانی گەل[3]. هەروەها هەر یەك لەسەرۆك كۆمارو سەرۆك وەزیران بەیاننامەیان ئاراستەی

---

[1] بڕوانە: محسن دزەیی، س پ، ل ل ١٣٨-١٣٩. د. مجید خدوری، س پ، ل ل ٣٥٢-٣٥٣. پاڵێوراوەکان بریتی بوون لە: (عبدالرحمن عارف)ی سەرۆك ئەركانی سوپا، (عبدالرحمن بزاز)ی سەرۆك وەزیران، (عبدالعزیز العقیلی) وەزیری بەرگری، لەیەکەمین پرۆسەی دەنگدانەکەدا دوو پاڵێوراوەکەی یەکەم، دەنگیان یەکسان بوو، بەڵام دواتر (بزاز) كشایەوە، یان ناچار كرا كەبكشێتەوەو بەو شێوەیە (عارف) بوو بەسەرۆك كۆمار. بڕوانە: محسن دزەیی، س پ، ل ل ١٣٨-١٣٩.

[2] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦٢. محسن دزەیی، ص پ، ل ١٣٩.

[3] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦٢. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٧٣.

**گەلی عـیراق کـردو لـە (١٩٦٦/٤/٢٠)دا بەیاننامەکـەی سـەرۆك کۆمار لەئیزگەوە راگەیەندراو تێیدا دەربڕی کەبڕوای بەو پرنسـیپانە هەیە کەپێشتر براکەی بانگەشەی بـۆ دەکـرد. بەتایبـەتی سـەروەریی یاساو یـەکێتیی نـاوخۆیی‌و خۆشـگوزەرانی کۆمەڵایـەتی[4]. سـەرۆك وەزیران لەو کۆنگرە رۆژنامەنووسـییەی کـە لـە (١٩٦٦/٤/٢٣)دا ئەنجامیـدا، جـەختی لەسـەر گوتـەکانی سـەرۆك کۆمـار لـەبارەی پێویستی هاوکاریکردن‌و پارێزگاریکردن لەیـەکێتی ریزەکـانی گـەل کـردەوەو رایگەیانـد کەهـەموو داخوازییـەکانی کـورد، تـەنها جیابوونەوەی لێدەرچێت دێنە دی![5].**

**لە (١٩٦٦/٤/٢٨)دا سەرۆك کۆمار لەرێگەی راسپاردنی (زەید احمد عوسمان)ەوە داوای لە (بـارزانی) کـرد کەوتووێـژ ئـەنجام بـدەن، لەبەرامبەردا (بارزانی) ئەو بیرۆکەیەی بـەلاوە پەسـەند بـوو[6]، بـەڵام**

---

[4] بڕوانـە: د. مجیـد خـدوری، س پ، ل ٣٥٤. لەراسـتیدا سـەرۆکی کۆچـکردو (عبدالسلام عارف) بەدرێژایی ساڵانی فەرمانڕانی خۆی هـیچ بەڵگەیـەکی لەسـەر بڕوابوونی بەو پرنسیپ‌و ئامانجانە پێشکەش نەکرد، هیچ هەنگاوێکی کردارەکی بـۆ بەدیهێنانیان پێشکەش نەکرد، هیچ هەنگاوێکی کردارەکی بـۆ بـەدیهێنانیان نـەنا کەشایەنی ئاماژەپێدان بێت، لەبەرئەوە ئـەو دەربڕینـەی (عبـدالرحمن عـارف)یـش لەوبارەیەوە جێگەی ئومێدو بایەخی کورد نەبوو، بـەڵکو رادەیـەکی کـەم هیوایـان لەسەر رێبازی سەرۆك وەزیران هەڵچنیبوو، وەکو رووداوەکانی دواتر دەریانخست.

[5] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦٢.

[6] بڕوانە: مسـعود البـارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٧٣-١٧٤. دیـارە سـێ فاکتـەری سەرەکی لەپشت قایل بونی (بارزانی)ەوە بوو بەپرنسیپی وتووێژکردن کەبریتین لـە: ١-قووڵتربوونەوەی دووبەرەکی نێوان سەرکردایەتیی پارتی کە لەدوو سـەنگەری دژ بەیەکدا دەجەنگان‌و (بارزانی) بەئومێدبوو کە لەو رێگەیەوە دەستکراوەتر بێـت بـۆ لەناوبردنی نەیارەکانی بەشێوەیەك لەشێوەکان.

**دواتــر هــەر (عــارف) خــۆی لــەژێر فشــاری بــاڵی تونــدڕەوی نــاو دامــەزراوەی سەربازیدا وتووێژکردنی رەتکــردەوەو پلانــی ســەربازیی ئامادەکراوی بــۆ داگیرکردنــەوەی کوردســتان پەســەند کــردو پاشــان بەکردەوە پرۆسەکانی لەژێر ناوی (پشــتم بــەخوا بەســت) ئەنجامــدا[٧]، کــەتا راگەیانــدنی بەیاننامەکــەی رۆژی (٢٩/٦/١٩٦٦) درێــژەی هەبوو.**

---

ب-خراپتربوونی باری ئــابووریو گــوزەرانی دانیشــتوانو پێشــمەرگە لەکوردســتاندا لەئاکامی ئەو جەنگە وێرانکەرەی حکومەتدا.

ت-لەو بارودۆخەدا کە (بارزانی) چاوەڕوانی ســەرکەوتنێکی یەکلاکــەرەوەی بەســەر سوپای عیراقدا نەدەکرد کەتەرازووی هێزەکان بەیەکجاری بگۆڕێت.

[7] بڕوانە: جمال نەبەز، کوردستانو شۆڕشەکەی، وەرگێڕانــی لەئەڵمانییــەوە: کــوردۆ، بنکەی چــاپەمەنی ئــازاد، ســوید، ١٩٨٥، ل ٢٦٥. مســعود البــارزانی، ب٣، ل ل ١٧٣-١٧٤. محسن دزەیی، س پ، ل ١١٦، د. سعد ناجی جواد، س پ، ل ١٢٨. لەم هەلومەرجــە ناســکەدا ســەرکردایەتیی پــارتی تووشــی بەهەڵــە لێکدانــەوەو هەڵسەنگاندنی دۆخەکەو سیاســەتی راســتەقینەی حکومــەتی عــیراق لەبەرامبــەر کورددا بوو، (مســعود بــارزانی) لــەم بارەیــەوە دەڵێــت: "ســەرکردایەتیی شــۆڕش زانیاریی وردی دەسکەوت لەبارەی نیازی حکومەتەوە بۆ هێرش بردنە ســەر هــەردوو ناوچەی بارزانو باڵەك لەیەك کاتدا، لەگەڵ ئەوەشــدا بۆچــوون وابــوو کەحکومــەت لەجێبــەجێکردنی پاشــگەز بووبێتــەوە بــەهۆی مردنــی (عــارف)و هەوڵــدانی بــۆ ئەنجامدانی دانوستان، لەبەر ئەوە شۆڕش ئامادەکاری تەواوی ئەنجام نەدا". مســعود البارزانی، ل ١٧٥. هەروەها (محسن دزەیــی)ش هــەمان نــاوەرۆکی ئــەو زانیاریانــەو بەهەڵە لێکدانەوەی سەرکردایەتییەکەی پارتی دەخاتە روو. بڕوانە: محسن دزەیی، س پ، ل ل ١١٦-١١٧.

## باسی دووەم
## دانوستانی نێوان کوردو حکومەتی عیراق و بەیاننامەکەی
## ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦

حکومەتی عیراق پاش ئەوەی لەوە دڵنیابوو کەنەك هەر ئامانجەکانی خۆی لەپرۆسیسە سەربازییەکاندا نەپێکاوە، بەڵکو لەهەندێك بەرەشدا شکستی گەورەی هێناوە وەکو شەڕەکانی چیای هەندرێن*، پەنای بردەوە بەر ڕێوشوێنە ئاشتییەکان، بەمەبەستی خاوکردنەوەی گرژیو ئاڵۆزیی بارودۆخەکەو سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەو دارشتنەوەی هاوکێشەی ململانێکە، هەر لەم روانگەیەوە بۆ وتووێژکردن "بەگەرمی روویان کردەوە بیرۆی رامیاری لەولاشەوە پەیوەندیان بە بارزانییەوە کرد بۆ هەمان مەبەست.. هتد"[٨].

لە (١٩٦٦/٦/٩)دا (تالەبانی) لەگەڵ (عارف)ی سەرۆك کۆمار کۆبووەو ناوبراو بەڵێنیدا کەیاسایەك دەربکات مافەکانی کورد لەخۆ بگرێت[٩].

سەرەتا حکومەت لەگەڵ سەرکردایەتیی پارتی باڵی بیرۆی سیاسیی پێشوو لەسەر پرۆژە دوازدە بەندییەکەی (بزاز) پێکهاتبوو و چاوەڕێی هاتنی نوێنەری (بارزانی) بوون تا ئەویش پێی قایل بێت‌و دواتر رابگەیەندرێت[١٠].

---

* بۆ وردەکارییەکانی شەڕەکان بڕوانە: محسن دزەیی، س پ، ل ل ١١٦-١٢١، ١٢٤. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٧٤-١٨٣. حوسێن محەمەد عەزیز، کوردو شۆڕش‌و هەلی مێژوویی، چ٢، ب ش، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ٢٠٣.

8 بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢١٤. شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٤.

9 بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٨. جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٧٠.

10 بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢١٥.

حکومـــەت لـــە (١٥/٦/١٩٦٦)دا دەســـتەیەکی لەچـــەند کەسایەتییەکی کوردی لەبەغدادەوە رەوانـەی لای (بـارزانی) کـرد[*]، وەك هەنگاوێکی بەرایی بۆ ناردنی شـاندێکی میللـی فـراوانتر دوای ئەوە.

لە (١٦/٦/١٩٦٦)دا سەرکردایەتیی پارتی باڵی بیرۆی سیاسیی پێشوو لەگەڵ حکومەتـدا لەسـەر پرۆژەکـەی (بـزاز) رێککـەوتنیان مـۆرکردو دواتـر راگەیەنـدرا[11]. لـە (١٨/٦/١٩٦٦)دا حکومـەت شاندێکی میللیی لەعەرەبو کوردو تورکمان نـاردە لای (بـارزانی) لەگەڵاڵە، و ئەوەیان دەربڕی کەحکومەت ئامادەی وتووێژە بۆ گەیشتن

---

[*] ئەندامانی ئەو دەستە نێردراوە لەم کەسایەتیانە پێکهاتبوون: عەمیدی خانەنشین مجید علی، احمد کمال، اکرم جاف، زید احمد عثمان، بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٤.

شایانی ئاماژەپێدانو بەراوردکردنە کە (ئیبراهیم جەلال) لەم بارەیەوە دەڵێـت: "لـە (١٣/٦/١٩٦٦)دا وەفدێکی بارزانی بەسەرۆکایەتی سکرتێری پارتی (حبیب محمد کریم)و ئەندامەتی نافذ جلال، صالح یوسفیو محسن دزەیـی چوونە بەغدا. وەفدەکەی بارزانی دەیانویست ٣ خاڵی تـر بخرێتـە سـەر ١٢ ماددەکـەی (بـزاز).. حکومـەتی عیراقی بەو (٣) خاڵەی وەفدی بارزانی قایل نـەبوو". ئیـبراهیم جـەلال، س پ، ل ل ٢١٥-٢١٦، بەراوردی بکە لەگەڵ: مسعود البـارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٤. دیـارە ناوهێنانی (محسن دزەیـی) وەکو ئەنـدامێکی ئـەو شـاندە لەچـەند سەرچـاوەیەکدا بەهەڵە هاتووە، بۆ نمونە لەوانە: ئیـبراهیم جـەلال، س پ، ل ل ٢١٥-٢١٦، حبیـب محمد کریم، س پ، ل ١٠٨. (محسن دزەیی) خۆی دەڵێت: ئەو ئەنـدامی ئـەو شـاندە نەبوو، بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٠.

[11] بڕوانـــە، ئیـــبراهیم جـــەلال، س پ، ل ٢١٦. بـــەپێی (نکـــدیمون): (تالـــەبانی) لەوکاتەی کەپەنای بۆ ئێران برد، پەیوەندی لەگەڵ (بزاز)ی سەرۆك وەزیراندا بەست. بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٨. جەمال نەبەز، س پ، ل ل ٢٧٠-٢٧١.

بەرێگەچارەیەکی ئاشتیو پێشنیازیان کرد کەشاندێکی کورد سەردانی بەغداد بکەن[12].

(بارزانی) ئارەزووی بەدەنگەوە هاتنی پێشنیازەکەی حکومەتی لەو بارەیەوە بەناردنی شاندێك بۆ بەغدادو گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا دەربڕی[13]. شاندەکە لە (٢٢/٦/١٩٦٦)دا سەردانی بەغدادیان کردو لەماوەی سێ ڕۆژی مانەوەیاندا بیروڕایان لەگەڵ گەورە بەرپرساندا گۆڕیەوەو دیدو بۆچوونی سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیرانیان لەو بارەیەوە بۆ (بارزانی) هێنایەوە،[14] پاش ئەوەی کەپلانێکی تەواویان لەبارەی ئاشتبوونەوەو ئاشتی پێشکەش بەحکومەتی عیراقی کرد[15].

بەپێی (ابراهیم جلال) ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنی (١٦/٦/١٩٦٦) کەپێشتر ئاماژەی پێدرا، مەترسیی لەلای (بارزانی) دروستکردو جۆرێك لەباری پشێوی لەناو ڕیزەکانی لایەنگرانیدا هێنایەکایەوە، لەبەر ئەوە دیسان شاندەکەی ناردەوە بەغدادو قایل بوونی خۆی

---

[12] شاندە میللیەکە پێکهاتبوو لە (لیوای خانەنشین ابراهیم الراوی) (دکتۆر کاظم شبر)، (باڵیۆزو شالیاری پێشوو علی حیدر سلیمان)، (ئەندازیارو دواتر شالیار احسان شێرزاد)، (رؤوف احمد قادر)، (دکتۆر محمد صالح محمود)، (نورالدین الواعظ)، و وەزیر(حسن عبدالرحمن). بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٤. هەروەها بەشداربوونی (زید احمد عثمان)و (لیوای خانەنشین عبدالمجید علی). بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٢٤. جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٧٠.

[13] بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ل ١٢٧-١٢٨.

[14] شاندەکە پێکهاتبوو لە: (حبیب محمد کریم) سەرۆكو ئەندامێتی (نافذ جلال)و (صالح یوسفی)و (علی عبدالله)، بڕوانە: مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٥. محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٠. شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٥.

[15] بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٨.

بەپرۆژەكەی (بزاز) راگەیاند![16] بەو شێوەیە دوای قایل بوونی هەردوو لایەنە كوردییەكە (بیرۆی رامیاریو بارزانی) بەو پرۆژەیە، لە (٢٩/٦/١٩٦٦)دا بەیاننامەی رێككەوتنەكە مۆركراو ئاگربەستی لەگەڵ سوپادا لێكەوتەوە[17]، كار بۆ ئاسایی كردنەوەی دۆخەكە كرا، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە كەپێش بڵاوكردنەوەی پرۆژەی چارەسەركردنەكە بەهاوبەشی، (بزاز) یەك لایەنە بەیاننامەكەی وەك

---

[16] بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢١٦ (فواد عارف) ئاماژە بە بەشداریكردنی (ادریس بارزانی) لەوتووێژەكانی ساڵی (١٩٦٦)دا دەكات، بڕوانە، فواد عارف، س پ، ل ٢٧٨. وەهەروەها لەبارەی پرۆژەكەی (بزاز)ەوە دەڵێت: لەكۆبونەوەیەكدا كە لەبارەگای ئەنجومەنی نیشتمانیو لەسەر بانگهێشتی (بزاز) بوو، هەریەك لە (فتاح شاڵیو مجید علیو احمد كمالو زید عثمان و عبدالرحمن مفتی) تێیدا بەشداربووین، پێشنیازم كرد كەپرۆژەكە بۆ سەركردایەتیی بزووتنەوەی كورد بنێردرێت بۆ ئەوەی تاوتوێی بكات، چونكە ئەو دەتوانێت بڕیار بدات پێی قایل بێت یان نەبێت. بڕوانە، ھ س، ل ل ٢٧٩-٢٨٠. ئەو پێشنیازەی ناوبراو دەنگ شوێنی خۆی گرت، كاتێك (بابەعلیو زید احمد عثمان) لەبارەی بەیاننامەكەوە سەردانی (بزاز)یان كردو دواتر (زید احمد عثمان) بۆ ئەو مەبەستە سەردانی (بارزانی) كرد. بڕوانە، ھ س، ل ل ٢٨١-٢٨٢. محسن دزەیی، س پ، ل ١٢٨.

[17] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٤. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢١٦. جەمال نەبەز، س پ، ل ل٢٧٠-٢٧١. د. سعد ناجی جواد، س پ، ل ل ١٣٠-١٣١. شایانی ئاماژەپێدانە كە (ئێران) بەوردی چاودێری پرۆسەی دانوستانەكەی دەكردو داوای لە (بارزانی) كرد كەشەڕ لەدژی حكومەتی عیراقی هەڵگیرسێنێتەوە، یان هیچ نەبێت پرسو رای لەگەڵدا بكەن لەبارەی ئەو هەنگاوانەی كەنیازی هەیە ئەنجامی بدات، دەسەڵاتدارانی ئێران بەردەوام بوون لەسەر فشار خستنە سەر (بارزانی) لەو بارانەوە. بڕوانە، شلومونكدیمون، س پ، ل ١٦٨-١٧١.

بەشێك لـەپرۆگرامی حکومەتەکـەی خـۆی ڕاگەیانـد. وەکـو دواتـر دەردەکەوێت.

بـەپێی (نکـدیمون)، (بـارزانی) پـاش ئـەوەی کـەزۆری لەگـەڵ بەرپرسانی عیراقدا گووت لەبارەی ئەوەی کەئەو تاکـە لایەنـە مـافی دانوسـتانکردنی لەگەڵیانـدا هـەبێت و ئـارەزووی ئەوەشـی دەکـرد (تاڵەبانی) بەیەکجاری لەناو بەرێت[18].

جێی سەرنجە کەهەرچەند ڕاگەیانـدنی بەیاننامەکـە ئاگربەسـتی لەگەڵ سوپای عیراقیدا لێکەوتەوە، بەڵام دووبەرەکیو شەڕی نێوخۆیی نێـوان باڵـەکانی سـەرکردایەتیی کـورد (بـارزانی-تاڵـەبانی) بەشێوەیەکی توندوتیژتر لەجاران تەشەنەی کرد[19].

---

[18] بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٨.

[19] لەبارەی وردەکارییەکانی ئەو قۆناغەوە، بۆ نمونە بڕوانە، ئیبراهیم جـەلال، س پ، ل ل ٢٢١-٢٢٨. مسعود البـارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٨٤، ٥٤٨. ئـەوەی مایـەی سەرنجە کە (بـارزانی) چـەکداماڵینی بەمـەرجێکی سـەرەکی ڕێککـەوتن لەگـەڵ حکومەتدا دانا، و حکومەتیش لەسـەرەتادا بەشـێوەیەکی بـەرایی‌و زارەکـی قایـل بوونی خۆی لەسەر ئەو داخوازییە دەربڕی، بەڵام لەدوازدە خاڵەکـەی بەیاننامەکـەدا جێگیر نەکرا، بەڵکو لەیەکێك لەسێ بەندە نهێنییەکەدا هات کەدواتر سەرلەبەریان جێبـەجێ نـەکران. بەبۆچـوونی ئێمـە پێداویسـتییەکانی سـەرکەوتن لـەململانێ سـەراپاگیرییەکەدا بەگشـتیو بـەهێزکردنی پێگـەی کـورد لەدانوسـتانەکانداو ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە باڵاکانی گەلی کـورد بەتایبـەتی وای دەخواسـت کـەگرەو لەسـەر سیاسـەتی پێکهاتنـەوەو کۆکردنـەوەی هـەموو هێـزو تواناکـانی کـوردو ئاراستەکردنیان بەرەو ئامانجە دیاریکراوەکان بکرێتو ڕێگـە لەحکومـەت بگیرێـت کەئەو باری دووبەرەکییەی نێو ریزەکانی گەلی کوردو سەرکردایەتیی بزووتنەوەکـەی بەقازانجی خۆی بقۆزێتەوەو لەپێگەیەکی بەهێزەوە دانوستان لەگەڵ کـورددا بکـاتو هەروەها لەهەموو ڕووەکانەوە واباشتربوو کە (بارزانی) زۆر بابەتی تـر وەك مـەرجی سەرەکی لەسەر حکومەت دابنێت، هەر بۆ نمونە وەك بـەدیموکراتیزەکردنی سسـتمی

لەبەر رۆشنایی بەیاننامەکەدا، لیژنەیەکی هاوبەش بەناوی (لیژنەی باڵای کاروباری باکوور)ەوە پێکهات بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەیاننامەیەو لەوبارەیەوە چەند هەنگاوێکی بەراییان ناو، کارەکانی زۆر بەسستی بەڕێوە دەچوو[٢٠]، بەڵام لەژێر کاریگەریی فشاری رەوتی

---

فەرمانڕەوایی‌و ژیانی رامیاری لەوڵاتداو دانانی دەستوری هەمیشەیی‌و سەلماندنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان‌و دیاریکردنی پشکی بەشداریکردن‌و دەسەڵاتی کورد لەحکومەتی ناوەندیداو راگرتنی پرۆسەی راگواستن‌و بەعەرەبکردنی کوردستان‌و دیاریکردنی پشکی کورد لەداهاتی نەتەوەیی عیراق بەگشتی‌و داهاتی پترۆل بەتایبەتی‌و.. هتد. ئەوەی لەو هەنگاوەی (بارزانی)دا تێبینی دەکرێت پتر زاڵبوونی گیانی تۆڵە سەندنەوەو پەراوێزکردنی بەرامبەر بووبێت، نەك هەنگاوێکی لۆجیکی‌و نەخشە بۆکێشراو لەسەر بنەمای باری راستەقینەی بزووتنەوەی کوردو پێداویستییەکانی ئەو قۆناغەی خەباتی رامیاری‌و پێشمەرگەیی.
لەبەرامبەریشدا سەرکردایەتی پارتی-باڵی بیرۆی رامیاری پێشوو، لەبری ئەوەی لێکدانەوەیەکی وردتری هەبێت بۆ هەلومەرجەکەو ئاکامە هەمەلایەنەییەکانی باری لێکترازانی ریزەکانی گەلی کوردو سەرکردایەتی بزووتنەوەکەی، و رەچاوکردنی سروشتی کەسێتی (بارزانی)و دیدگاکانی بۆ سەرکردایەتی کردن‌و ژیانی رامیاری‌و پارتایەتی لەکوردستانداو رۆڵی پارت لەو بوارەدا، و قایل بوون بەو سەرکردایەتییە بەهەموو کەموکوڕییەکانیەوە لەبواری سەرکردایەتیکردن‌و ئاراستەکردنی بزووتنەوەکەوە، و پێکهاتنەوە لەگەڵیدا بەهەر نرخێك بێت، کەچی لەپێگەیەکی بێهێزەوە رێگەی وتووێژکردن‌و پێکهاتنی لەگەڵ حکومەتدا گرتەبەر. بەوەش سەرەنجام تێکڕایی کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی هەڵوێستەکانی هەردوو لایان، بەقایل بوونیان بەپرۆژە لاوازەکەی (بزاز) بۆ چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد شکایەوە!.
[20] لیژنەکە پێکهاتبوو لە: (لیوای روکن کمال مصطفی عەلەمدار) سەرۆکی لیژنەکە، (عمید رکن عبدالمنعم المصرف) پارێزگاری هەولێر، عمید روکن (زکی

شـۆفێنیزمو تونـدڕەویی نـاو حکومــەتو سـوپادا، سـەرۆك وەزیـران ناچارکرا کە لە (٥/٨/١٩٦٦)دا دەست لەکارکێشـانەوە پێشـکەش بکات، وەك لەنووسراوی دەسـت لەکارکێشـانەوەکەدا هـاتووە کەئـەو کـارەی لەسـەر داوای سـەرۆك کۆمـاربوو[٢١]، بـۆ ئـەوەی ڕێگـە لەجێبـەجێکردنی کارنامـەی حکومـەتی (بـزاز) بەگشـتیو دەقـی بەیاننامەکە بەتایبەتی بگرن، فشارەکەیان بۆ سەر (عـارف) پـەرەی سەند تاوەکو سنوورێك بۆ هەوڵەکانی (بزاز) لـەو بارەیـەوە دابنێـت، ئەو کارەیان بەچەشـنێك سـەریگرت کـەناوبراو خۆیشـی چـووە پـاڵ بۆچوونی ئەوانی ترو بەو شێوەیە دەرفەت بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی حکومەتەکەی (بزاز) لەوبارەیەوە نەڕەخسا[٢٢].

شایانی ئاماژەپێدانە کە(بزاز) لەپاش دەست لەکارکێشانەوەکەیو هەر لەئاکامی درێژە کێشانی فشارەکانی پێشووتردا بۆ سەری، ئەستۆ پاکی لەبارەی پرۆژەکـەوە بـۆ خـۆیو تەنانـەت حکومەتەکـەی دوای

---

حسن حلمی) سەرکردەی تیپی یەکەمو (نافذ جلال)و (محسن دزەیی). بڕوانـە: محسـن دزەیـی، س پ، ل ل ١٣٦-١٣٧. مسعود البارزاني، ب٣، س پ، ل ل ١٨٤-١٨٥.

21 بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٨. بـەپێی (د. محمـد المشـهداني) نـاوبراو لـە (٦/٨/١٩٦٦) دەست لەکارکێشانەوەی ئەنجامدا، ل ل ٢٨٤-٢٨٥.

22 بڕوانە، شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ١٠٠. محسن دزەیی، س پ، ل ١٣١. د. مجید خدوري، س پ، ل ٣٦٥. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٢٣. شـلومونکدیمون، س پ، ل ١٧٣. عبدالکریم فرحان، س پ، ل ل ١٨٨-١٨٩ (فواد عـارف) لـەبارەی پێگـەی (بـزاز)و بەرنامەکەیـەوە دەڵێـت: (بـزاز) ئـەوەی ڕەچـاونەکرد کـەراگرتنی شـەڕ لەکوردستاندا لەبەرژەوەندی ژمارەیەك لەبەرپرسانی سوپادا نەبوو، لەبەرئەوە لـەکار خرا، چونکە پێگەی لەکۆی پێگـەی هـەموو بەرپرسـە سـەربازییەکانی سـەردەمی (عبدالسلام عارف) لاوازتر بوو. بڕوانە، فواد عارف، س پ، ل ٢٧٨.

**خۆیشی هێنایەوە کەهیچ ڕێککەوتننامەیەك لەنێوان حکومەتەکەی ئەوو کورددا نەبووەو بەرنامەی حکومەتەکەی هیچ بڕگەیەکی نهێنی تێدا نەبووە[٢٣]، کاتێك کەرایگەیاند ئەوە پرۆژەی حکومەتەکەی ئەو بوو، حکومەتەکەی (ناجی طالب) سەرپشکە لەخۆپابەندکردنو جێبەجێکردنی پرۆژەکە یان پێچەوانەکەی[٢٤].**

**هەرچەند ئەو پاساوە لەڕووی یاساییو کردارەکییەوە دروستە، چونکە بەرنامەی هەر حکومەتێك نەك بۆ حکومەتی دوای خۆی، بەڵکو تەنانەت بۆ خودی حکومەتەکەش پابەندێتی نییەو شیاوی هەمواركردن یان پاشگەزبوونەوەیە لێی*، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گومانێکی ڕەوا دەخاتە سەر نیازی حکومەتەکەی (بزاز) هەر لەسەرەتاوە سەبارەت بەوەی کەرێککەوتنەکەی وەك بەشێك لەبەرنامەی حکومەتەکەی بۆ سڕکردنی بارودۆخەکە لەکوردستاندا ڕاگەیاند، نەك وەك ڕێککەوتنێکی سەربەخۆو تایبەتمەند بەو بوارە، چونکە بنەماو شوێنەوارەکانی ڕێککەوتننامە لەهەموو ڕووەکانییەوە جیاوازە لەبەرنامەی حکومەت.**

---

[23] بڕوانە، جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٨١.

[24] لەو بارەیەوە بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٢٤. محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٢. جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٨٠.

* هەر لەڕووی دەستنیشان کردنو گونجاندنی یاسایی بەیاننامەکەوە (محسن دزەیی) بەجۆرێك باسی دەکات کە لەگەڵ پاساوەکەی (بزاز)دا لەوبارەیەوە یەکانگیرە، ئێمەش هەمان لێکدانەوەمان بۆی هەیە وەکو لەسەرەوەدا ئاماژەمان پێداوە، بەڵام لەگەڵ ئەو بۆچوونەی (دزەیی)دا نین کەپێی وایە (بزاز) بەراستی بوو بەیاننامەکە جێبەجێ بکات، چونکە هیچ بەڵگەو ئاماژەیەك بۆ ئەو نیازەی بەدیناکرێت، بەپێچەوانەوە سەرلەبەری مەسەلەکە پتر دابەشکردنی ڕۆڵە بەسەر سەرکردە عیراقییەکاندا یاخود لانی کەم ڕەنگدانەوەی جیاوازیی دیدو شێوەی کارکردنە لەنێوانیاندا بۆ هەمان مەبەستی دیاریکراو.

## باسی سێیەم
## لێکدانەوەی بۆچونەکان دەربارەی بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران و باری سەرنجمان

بەیاننامەکە لەپێشەکییەك و دوازدە خاڵ پێکهاتووە[٢٥]، وێڕای سێ بڕگەی تری نهێنیٚ کەشاندی کوردی پێی لەسەرداگرت و حکومەت پێی قایل نەبوو[٢٦].

لەبارەی بەیاننامەکەوە بیروڕای جۆراوجۆر گوتراوە، هەر بۆ نمونە، (مەلا بەختیار) لەوبارەیەوە دەڵێت: "پرۆژەکە زۆر لەئۆتۆنۆمی کەمترو زیاتریش کوردستانی لەقاڵبی عیراق و نەتەوەی عەرەبیش دەدا، بۆ تەسکینی دەروونیش، باسی (کوردستان) و (شۆڕش و پارتی)" نەکراوە..."، بەلێکدانەوەی (محسن دزەیی)" بەیاننامەکە

---

[25] بۆ دەقی بەیاننامەکە بڕوانە، جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٧١-٢٧٢. د. مجید خدوری، س پ، ل ل ٣٦٢-٣٦٥. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ٥٤٨-٥٥٠. وە بۆ پوختەی چەند بەندێکی بەیاننامەکە بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٦٥.
-History of Iraq، op، cit، www.Findarticles.com.

[26] ئەو سێ بڕگە نهێنییەی کەدواتر لەمانگی تەمووزی ساڵی (١٩٦٨)دا بلاوکرانەوە بریتی بوون لە: ١-ئازادکردنی هەمو زیندانییە رامیارییەکان. ٢-سەلماندنی مافی کارکردنی ئاشکرا بۆ پارتی. ٣-لکاندنی ئەو قەزایانەی کەلیوای موسڵ پێکدەهێنن بەلیوای نوێی دهۆکەوە. بڕوانە: شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ١٠٠ بەراوردی بکە لەگەڵ ئیبراهیم جەلال کەبەم شێوەیە سێ خاڵەکەی خستۆتەڕوو: "١-ناوەندی ئۆتۆنۆمی لەدهۆك بێت. ٢-تەنیا پارتی دیموکراتی کوردستان باسکی بارزانی لەکوردستاندا بەشێوەی قانونی بناسرێ. ٣-پارتی دیموکراتی کوردستان باسکی جەلالی لەکوردستاندا هەڵوەشێنرێتەوەو هەموو چەکدارەکانیشیان چەك بکرێن". ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢١٦.

چـەند بەنـدێکی تێـدابوو کەهەنـدێك لەداخوازییـەکانی کـوردی بەگوێرەی ئەو هەلومەرجە دابین کـرد، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لانـی کـەمی ئـەو داخوازیانـەی بەرجەسـتە دەکـرد.. لانـی کـەمی مافـە نەتەوەییەکانی کوردی لەخۆ نـەگرتبوو، بـەڵام بنچـینەیەکی خـراپ نەبوو لەو قۆناغەداو دەکرا پەرەی پێبـدرێت بەتایبـەتیش هـەمووان پێشوازیان لەهەر ئاگربەستێك دەکرد"[27]. (فؤاد عارف) راگەیانـدنی بەیاننامەکە بەهەنگاوێکی روونو بـاشو بەرەوپێشـەوە بـۆ هـەردوو لایەن هەڵدەسەنگێنێت، چونکە پێویستیان بەئاگربەستو پشـوویەك هـەبوو. هـەروەها سـەرکردایەتیی کـوردی دەیوسـت دەرفـەتێك بـۆ سەرۆکی نوێ بڕەخسێنێت تـاوەکو چارەسـەری دۆزی کـورد بکـات، و دواتـر وتووێـژەکان بەیاننامەکـەی لێکەوتـەوە[28]. بـەڕای هەنـدێك لەتوێـژەران کەئێمـەش پشـتگیرییان لێ دەکـەین، بەیاننامەکـە لەبەرنامەیەکی کار کەکۆمەڵێك بەڵێنی لەخۆگرتووە تێپەڕ ناکـاتو هـیچ بایـەخێکی لـەڕووی یاسـاییەوە نیـەو بـەکارێکی یاسـادانان ناژمێردرێـت، و حکومـەت هـیچ یاسـایەکی بـۆ جێبـەجێکردنی بڕگەکانی دەرنەکرد[29]. هەروەها لێکدانەوەکـەی (نکـدیمون) لەمـەڕ دیدو بۆچوونی (بزاز) لەبارەی شـێوازی مامەڵـەکردنی لەگـەڵ دۆزی کورددا جێگەی بایەخە کەدەڵێت: (بزاز) کەشوێنی (طـاهر ییحـی)ی گرتەوە بڕوای بەوە هەبوو کەئەستەمە بەیەك گورز کۆتایی بەکێشەی کوردی بهێنرێت، لەبەرئەوە هەوڵیدا کە لەگەڵیانـدا رێککـەوێت[30].

---

[27] محسن دزەیی، س پ، ل ١٣١.

[28] بڕوانە، فواد عارف، س پ، ل ل ٢٧٨-٢٧٩.

[29] بڕوانە. د. محمد عمر مولود. س پ، ل ١٦٧.

[30] بڕوانە، شلومونکدیمون، س پ، ل ١٤٦.

(جمال نەبەز)یش لەو بارەیەوە دەڵێت پرۆگرامەکە هیچی لەو مافە سەرەتاییانە زیاد نەکردووە کەکورد لەسەردەمی پاشایەتیدا هەیبوو[31].

بەرەچاوکردنی ئەو لێکدانەوەیەی (نکدیمون)و هەڵوێستی (بزاز) لەدوای دەست لەکارکێشانەوەکەی لە (١٩٦٦/٨/٦)دا لەبارەی جێبەجێنەکردنی بەیاننامەکەوە، دەردەکەوێت کەجیاوازییەکی ریشەیی لەدیدوبۆچوونو هەڵوێستی ناوبراودا لەبارەی گەلی کوردو دۆزە نەتەوەییەکەیەوە نییە لەگەڵ بەرپرسانی تری حکومەتەکانی عیرقیدا، بەڵکو جیاوازییەکە تەنها لەشێوازو رێوشوێنی مامەڵەکردنەکەدایە، بۆ گەیشتن بەهەمان ئامانجی دیاریکراو کەخۆی لەسەرکوتکردنو پەراوێزکردنی گەلی کوردو مافو خواستە نەتەوەییو دیموکراسییەکانیدا دەبینێتەوەو ناچارکردنێتی بەقایل بوون بەلانی هەرە کەمی ئەو مافانە*.

لەکاتێکدا حکومەت لەرێگەی مۆرکردنی رێککەوتنی ئاگربەستەکەو راگەیاندنی بەیاننامەکەوە توانی ئامانجەکانی خۆی لەراگرتنی شەڕی کوردستانو بەدەمەوەگرتنی سەرکردایەتیی کوردیو بەدەستهێنانی کاتو توانای پێویست بۆ خۆسازدانەوە بۆ خولێکی تری ململانێی رامیاریو سەربازی بپێکێت، کەچی هەردوولایەنە کوردییەکە لەو هەلومەرجەدا درێژەیان بەشەڕی یەکتریداو سەرەنجام وەك قەوارەیەکی بێهێز لەبەرامبەر حکومەتدا

---

[31] بڕوانە، جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٧٢.

* بەراوردی بکە لەگەڵ رای (فواد عارف)دا کە لەو بارەیەوە دەڵێت: بزاز"... بەشێوەیەکی زۆر بابەتیانە لەدۆزی کوردی گەیشتبوو، بە بەراورد لەگەڵ کەسایەتییە سیاسییەکانی عیراق لەو ماوەیەدا..". (فواد عارف)، س پ، ل ٢٧٨.

دەرکەوتن و لانی کەمی مافەکانی گەلی کوردیان بەدەست نەهێنا. هەر لەدرێژەی ململانێی نێوانیاندا هەردوو لایەنەکە (کۆنفرانس، کۆنگرە)یان بەست*، و لەبڕیارەکانی ئەو کارەیان ئەوە بەدی دەکرێت کەجگە لەجەختکردنەوەیان لەسەر داواکردن لەحکومەت کەبڕگەکانی بەرنامەکەی (بزاز) جێبەجێ بکات[32]، و پێشکەشکردنی یاداشتنامە بۆ سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیران[33]، تەنها سووربوونی خۆیان لەسەر درێژەپێدان بەسیاسەتی ناوزڕاندن یان لەناوبردن، یان دەرپەڕاندن، یان بەچۆکدادانی یەکتری دەربڕی[34].

بەو شێوەیەی شەڕی نێوانیان بەشێوەیەکی توندوتیژتر لەجاران تاسەرەتای ساڵی (١٩٦٩) درێژەی کێشا، لەکاتێکدا کە لەراگەیاندنی رێککەوتنی ئاگر بەستەکەی (٢٩/٦/١٩٦٦)ەوە تا سەرەتای ساڵی (١٩٦٩) بەکردەوە شەڕی نێوان کوردو حکومەتی عێراق راوەستا![35] هەوڵەکانی پێشووتری حکومەت لەوبارەیەوە لەپێناو هێنانەکایەوەی بارێکی لەو چەشنە لەنێوان کوردەکان

---

* سەرکردایەتیی پارتی باڵی بیرۆی رامیاری پێشوو لەرۆژانی (٢٨/٨-٢/٩/١٩٦٦) کۆنفرانسی بەستو سەرکردایەتیی پارتی باڵی (بارزانی)ش لەرۆژانی (١٥-٢١/١١/١٩٦٦)دا کۆنگرەی حەوتەمینی بەست. بڕوانە: ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٢٦. محسن دزەیی، س پ، ل ١٤٤. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٨٧-١٨٨.

32 بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٤٤.

33 بۆ دەقی یاداشتنامەکە بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل٥٥٥-٥٥٩.

34 بۆ بڕیارەکانی (کۆنفرانس، کۆنگرە)ی هەردوو لایەنی کوردی، بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ل ٢٢٥-٢٢٧. مسعود البارزانی، ب٣،س پ، ل ل ١٨٧-١٨٨.

35 بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٢٧.

خۆیاندابوو، سەرەنجام پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتی پەرتکەو زاڵبەیەی بەرامبەر بەکورد بەکاری هێنا سەری گرت. هەر لەئەنجامی ئەو دووبەرەکییەی نێوانیاندا، تا دەهات وابەستەییان بەهێزەکانی ترەوە پتر دەبوو، وەرەنگدانەوەی لەسەر ئەو پەراوێزی سەربەخۆییەی کەپێشتر لەسیاسەت و بڕیارەکانیاندا بەدی دەکرا، روونتر لەجاران دەرکەوت، ئەو بارە پتر خۆی لەجۆری پەیوەندی نێوان پارتی باڵی (بارزانی) لەگەڵ ئێران و پارتی باڵی بیرۆی رامیاری پێشوو لەگەڵ عیراقدا دەنواند.

لەپاش دەست لەکارکێشانەوەی (بزاز)، پێکهێنانی کابینەی نوێی حکومەت بە (عمید رکن ناجی طالب) سپێردرا، لەکوردەکاندا (احمد کمال قادر) بەوەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ئاوەدانکردنەوەی باکوور دامەزرێنرا، بەڵام هەر لەو قۆناغەدا بەیاننامەکە هەڵپەسێردراو هیچ هەنگاوێك بۆ جێبەجێکردنی نەنرا[٣٦]، هەربەهەمان شێوەش سەبارەت بەسێ بەندە نهێنییەکە[٣٧]. لەم بارەیەوە (خدوری) دەڵێت: سەرۆك وەزیرانی نوێ پێی گوت کە "کێشەی کورد تەنها کێشەیەکی عیراقی نییە، بەڵکو کێشەیەکی هەرێمیشە. مەلا مستەفا کە بەناوی نەتەوەی کوردەوە دەدوێت نوێنەرایەتی هەموو کوردەکان ناکات لەبەرئەوەی زۆربەی سەرۆکە کوردەکان لەدژین"[٣٨].

هەر لەبارەی بەرنامەی حکومەتەکەی (بزاز)ەوە (ناجی طالب) ئەوەی دەربڕی کەئەو ڕێزی لێدەگرێت پاش ئەوەی سەرۆك وەزیرانی

---

[36] بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٨. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٥.

[37] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ ل ٥٥٩، پاشکۆی ژمارە (٢٧)ی سەرچاوەکە.

[38] د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦٥.

خۆیاندابوو، سەرەنجام پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتی پەرتکەو زاڵبەیەی بەرامبەر بەکورد بەکاری هێنا سەری گرت. هەر لەئەنجامی ئەو دووبەرەکییەی نێوانیاندا، تا دەهات وابەستەییان بەهێزەکانی ترەوە پتر دەبوو، وەڕەنگدانەوەی لەسەر ئەو پەراوێزی سەربەخۆییەی کەپێشتر لەسیاسەتو بڕیارەکانیاندا بەدی دەکرا، روونتر لەجاران دەرکەوت، ئەو بارە پتر خۆی لەجۆری پەیوەندی نێوان پارتی باڵی (بارزانی) لەگەڵ ئێرانو پارتی باڵی بیرۆی رامیاری پێشوو لەگەڵ عیراقدا دەنواند.

لەپاش دەست لەکارکێشانەوەی (بزاز)، پێکهێنانی کابینەی نوێی حکومەت بە (عمید رکن ناجی طالب) سپێردرا، لەکوردەکاندا (احمد کمال قادر) بەوەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ئاوەدانکردنەوەی باکوور دامەزرێنرا، بەلاّم هەر لەو قۆناغەدا بەیاننامەکە هەڵپەسێردراو هیچ هەنگاوێك بۆ جێبەجێکردنی نەنرا[36]، هەربەهەمان شێوەش سەبارەت بەسێ بەندە نهێنییەکە[37]. لەم بارەیەو (خدوری) دەڵێت: سەرۆك وەزیرانی نوێ پێی گوت کە "کێشەی کورد تەنها کێشەیەکی عیراقی نییە، بەڵکو کێشەیەکی هەرێمیشە. مەلا مستەفا کە بەناوی نەتەوەی کوردەوە دەدوێت نوێنەرایەتی هەموو کوردەکان ناکات لەبەرئەوەی زۆربەی سەرۆکە کوردەکان لەدژین"[38].

هەر لەبارەی بەرنامەی حکومەتەکەی (بزاز)ەوە (ناجی طالب) ئەوەی دەربڕی کەئەو رێزی لێدەگرێت پاش ئەوەی سەرۆك وەزیرانی

---

[36] بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٣٨. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٨٥.

[37] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ ل ٥٥٩، پاشکۆی ژمارە (٢٧)ی سەرچاوەکە.

[38] د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦٥.

پێشـــوو رایگەیانـــدوە. بـــەڵام لەڕاســـتیدا هـــیچ هـــەنگاوێکی بـــۆ جێبـــەجێکردنی نـــەنا، بەهـــەمان شـــێوەش لـــەبارەی تـــەواوکردنی رەشنووسی پـــرۆژەی یاســـای پارێزگاکانـــەوە کـــە لەبنچـــینەدا (بـــزاز) ئامادەی کردبوو[39].

پاش ئەوەی ئاماژەمان بەچەند نمونەیەك کـرد لـەبارەی بۆچـوونی توێژەران لەسـەر بەیاننامەکـەی (٢٩/٦/١٩٦٦)ی حکومەتەکـەی (بـــزاز)، بەپێویســـتی دەزانـــین کـــەلێرەدا پوختـــەی بەیاننامەکـــەو لێکدانەوەو باری سەرنجی خۆمان لەبارەیەوە بخەینەروو.

لەپێشەکییەکەیدا ئاماژە بۆ هۆکارەکانی راگەیانـدنی دەکـات، و لەو بارەیـەوە چـەند سـەرنجێکمان لا دروسـت بـووە کـەگرنگترینیان ئەمانەن:

١-دەرکردنو راگەیاندنی بەیاننامەکە لەسەر ئارەزووی حکومەت بوو، نەك لەئەنجامی رێککەوتن لەگەڵ سەرکردە کوردەکاندا.

٢-بزووتنەوەی کورد لەباشووردا بـە (بـارودۆخی نائاسـایی) نـاو دەبات، لەبری ناوی کوردستان وشەی (باکور)ی بەکارهێناوە.

٣-بەیاننامەکـە بەشـێکە لـەپرۆگرامی حکومەتەکـەی (بـزاز)و پشتی بەستووە بەبڕگەی چوارەمی نوسـراوی پێسـپاردنی پێکهێنـانی حکومـەت لەلایەن ناوبراوەوە کەجەخت لەسـەر یەکپارچـەیی خـاکی عیراق دەکاتەوەو پێی وایە کەپەیوەندییەکانی نێوان عەرەبو کورد وا دەخوازێت بەراستگۆییو لێبڕاوانە بۆ بەرژەوەندیی نیشتمان کار بکەن.

---

[39] بڕوانە: د. مجید خدوری، س پ، ل ٣٦٥. هەر بـەپێی ئـەو سەرچـاوەیە هـاتووە، هەرچەند هەر چوار حکومەتەکەی دوای حکومەتی (بزاز) هاتنە سەر حوکم ئەوەیان دەربڕی کەئەوان رێز لەبەرنامە دوازدە بەندیەکەی حکومەتەکەی (بزاز) دەگرن، بەلام هیچیان دەرفەتی جێبەجێکردنیان نەبوو. بڕوانە، هـ س، ل ل ٣٦٥-٣٦٦.

لەراستیدا حکومەت لەبەرنامەکەیدا ئامانجی سەلماندنی هەبوونی گەلی کوردو مافەکانی نەبوو، بەڵکو پێچەوانەکەی دروستە، چونکە ئاماژەیەکی ناراستەوخۆی داوە بەوەی بزووتنەوەی کورد مەترسی سەرەکییە لەسەر یەکپارچەیی عیراقو یەکێتیی نیشتمانی گەلەکەی.

هەر لەپێشەکییەکەدا جەخت لەسەر ئەوە کراوەتەوە کەحکومەت لێبڕاوانە سورە لەسەر پابەندبوون بەو بەرنامەیەو جێبەجێکردنی وەکو خۆی لەنزیکترین دەرفەتدا کەبۆی بڕەخسێت.

سەبارەت بەناوەڕۆکی دوازدە خاڵەکەی بەیاننامەکە، دەکرێت بەم شێوەیە بیخەینەڕوو:

١-لەخاڵی یەکەمدا هاتووە کەحکومەت لەدەستوری کاتیی هەمواركراودا بەتەواوی دانی بەنەتەوەی کورددا ناوەو ئامادەیە ئەو راستییە لەدەستوری هەمیشەیشدا دوپات بکاتەوەو.. هتد. شایانی ئاماژەپێدانە کەهەرچەند لەتەواوکەری ئەو بڕگەیەدا باسی لەپێکهاتەی نەتەوەیی کردووەو گەلی کوردی بەیەکێك لەدوو گەلە سەرەکییەکەی عیراق ناوبردووە، هەروەها ئاماژەی داوە بەیەکسانی نێوان کوردو عەرەب لەمافو ئەرکەکاندا. بەڵام لەگەڵ بایەخی ئەو دانپێدانانەشدا لەبواری راگەیاندندا، هێشتا ئەو رستەیەی کەتایبەتە بەگەلی کوردو مافە نەتەوەییەکانیەوە هەر لەڕووی زمانەوانیو داڕشتنیشەوە واتای تەواوی بەدەستەوەنەداوەو پچڕانی تێکەوتووە، کەناکرێت ئەستۆپاکی نیازی حکومەت لەو بارەیەوە بکرێت، چونکە لەگەڵ ئەو پرنسیپە چەسپاوەدا دژە کەدەڵێت (یاسادانەر هەڵەناکات).

٢-حکومەت بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی کە لەخاڵی یەکەمدا ئاماژەیان پێدراوە لەچوارچێوەی یاسای پارێزگاکاندا کە لەسەر بنچینەی ناناوەندێتی دەبێت خستۆتەڕوو. دیارە ئەو

میکانیزمە جگە لەپەیڕەوکردنی نیوەچڵی سستمی ناناوەندێتی کارگێڕی هیچ جۆرە ناوەرۆکێکی رامیاری لەخۆناگرێت، و لەوەش زیاتر پرۆژەی یاسای پارێزگاکان بۆ هەموو عیراق بوو، نەك تەنها بۆ بەشێك لەناوچەکانی باشووری کوردستان، لەبەر ئەوە لەکاتی جێبەجێکردنیشدا هیچ تایبەتمەندییەکی یاسایی‌و رامیاری بۆ گەلی کورد تێدا دەستەبەر نەدەبوو.

٣-لەبارەی مافە زمانەوانییەکانەوە، تێیدا هاتووە کەحکومەت دان بەزمانی کوردی وەك زمانێکی فەرمی لەپاڵ زمانی عەرەبیدا دەنێت لەو ناوچانەی کەزۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن، هەروها خوێندنیش بەهەردوو زمانەکە دەبێت بەو شێوەیەی کەیاساو ئەنجومەنی شارەوانییەکان دیاری دەکەن.

پێمان وایە کەئەم خاڵە دوو تێبینی هەڵدەگرێت:

أ-هەڵوێستی حکومەت لەو بارەیەوە شتێکی نوێ‌و پۆزەتیڤی تێدا نەبوو، بەڵکو تەنها دووپاتکردنەوەی هەڵوێستە یاسایی‌و رامیاریەکانی حکومەتەکانی پێشووتری عیراقە هەر لەسەردەمی فەرمانڕەوایی پاشایەتیەوە.

ب-ئەندازەو ئاستی خوێندنی بەزمانی کوردی دیاری نەکردو بەڵکو لەو بارەیەوە یاساو ئەنجومەنی شارەوانییەکانی سەرپشك کرد. لەسەر ئەو بنچینەیە وای دەبینین کەدارشتنی دەقەکە بەو شێوەیەی کەهاتووە بواری خراپ راڤەکردن‌و بەکارهێنانی داوە. لەگەڵ ئەوەی کەلانی کەمی مافە زمانەوانی‌و کەلتورییەکانی گەلی تێدا رەچاو نەکردووە. دیارە بەحوکمی پێکهاتەی دەزگای دەسەڵاتی یاسادانان‌و ئەنجومەنی شارەوانییەکان لەو سەردەمەدا نەدەکرا چاوەڕوانی هەڵوێست‌و کاری باشیان لێبکرایە.

٤-نیازی حکومەت بۆ هێنانەکایەوەی ژیانی دیموکراتیو ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پەرلەمانیو بەشداریکردنی کورد تێیدا بەرێژەی دانیشتوانەکەی، دەکرێت وەك پرنسیپ بەهەڵوێستێکی پۆزەتیڤ لەقەڵەم بدرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرەچاوکردنی چەند راستییەك سەرلەبەری پرسەکە بێ ناوەرۆك دەمێنێتەوە، کەبریتین لە:

أ-جۆری سستمی فەرمانڕانی تاکڕەوی لەعیراقداو شێوازو رێوشوێنی دەسەڵات گرتنە دەستەکەی کەدرێژەپێدەری کودەتاکەی سەرۆك کۆماری پێشوو (عبدالسلام) بوو.

ب-فەرمانڕەواییکردن لەسایەی دەستورێکی کاتییو نادیموکراسی لەڕووی ناوەرۆكو شێوازی دانانیەوە.

جـ-نەبوونی پایەکانی تری سەرکەوتنی پرۆسەیەکی لەو چەشنە وەك دەستەبەربوونی مافو ئازادییە گشتییەکانو فرەپارتیو ئازادییە رامیارییەکان، ئەمەش لەئەنجامی کاریگەریی ئەو فاکتەرانەی کە لەهەردوو خاڵەکەی پێشوودا ئاماژەمان پێدا.

د-لەبارێکدا تەنانەت ئەگەر پرۆسەی هەڵبژاردن بەپشت بەستن بەیاسای هەڵبژاردنێك ئەنجام بدرایە، ئەوا لەسایەی ئەو جۆرە سستمی فەرمانڕەواییەدا ئومێدی ئەوە نەدەکرا کەیاسایەکی دیموکراسیانە بێتو کۆتو بەندی جۆراوجۆر لەسەر مافی بەشداربوونی هاووڵاتیان دانەنێت، بەرادەیەك کە لەئاکامدا هەر تەنها ئامانجو خواستەکانی دەستەی فەرمانڕەوای بەدیدەهێنا، نەك گەل*.

* مەرجەکانی هەڵبژاردن ئەوانەن کەبۆ مەبەستی رێکخستنی پرۆسەی هەڵبژاردنەکان لەناو یاسای هەڵبژاردنەکاندا دەستنیشان دەکرێن، بەبێ بوونیان پرۆسەکە بەشێوەیەکی رێکوپێك ئەنجام نادرێت، کەچی کۆتو بەندەکانی هەڵبژاردن ئەوانەیە کەلەیاساکەدا دادەنرێت بەمەبەستی بێبەش کردنێکی ناڕەوایانەی

٥-بەیاننامەکە ئاماژەی بەمافی کورد کرد لەبارەی بەشداریکردن لەپۆستە گشتییەکانو بوارەکانی خوێندنی باڵادا، کە لەراستیدا ئەو مافانە لەسایەی ئەو هەلومەرجەدا نەهیچیان جێبەجێکراو نەئومێدی ئەوەیان لێدەکرا کەجێبەجێ بکرێن. ئەوەی لەم بارەیەوە جێگەی سەرنجە دەقی دوابڕگەی شەشەمی بەیاننامەکەیە کەباس لەوە دەکات، زانکۆی بەغداد پرۆژەیەك لەباکووردا دەکاتەوە هەر کاتێك دارایی پێویست بۆ ئەو کارە دەستەبەربێت، چونکە لەلایەکەوە ناوەرۆكو سیماو ئامانجەکانی ئەو پرۆژەیەی روون نەکردۆتەوە، لەلایەکی تریشەوە حکومەت پرسی توانای دارایی کردە مەرجێکی سەرەکی ئەنجامدانی پرۆژەکە! لەکاتێکدا کەحکومەت هەمیشە ئەو توانایەی لەبەردەستدابووە بۆ درێژەپێدان بەپرۆسە سەربازیەکانی لەکوردستاندا لەشەڕەکانی بەر لەرێککەوتنی ئاگربەستەکەو هەروەها لەدوای جێبەجێنەکردنی بەیاننامەکەوە، لەکاتێکدا کەجیاوازیی نێوان تێچوونی ئەو دوو مژارە شیاوی بەراوردکردن نییە.

٦-لەکاتێکدا بەیاننامەکە ئاماژەی بەمافی کوردان کرد لەبارەی ئەوەی کەفەرمانبەرانی کوردستان کورد بن، بەڵام گەلی کورد لەسایەی سیاسەتەکانی حکومەتو ئەو بارودۆخەی تێیدا دەژیان توانای بەرهەمهێنانی رێژەی پێویستی لەفەرمانبەران بۆ ناوچەکەیان

---

رێژەیەکی هاووڵاتیان لەپرۆسەکەدا، بەبیانووی هەمەجۆری وەکو نەتەوەیی، ئاینی، ئاینزایی، توانای دارایی، پلەی زانستی، رەنگی پێست، و توخم. بەو شێوەیە دیاریکردنی مەرجەکان پرسێکی رێکخستنیو کارگێڕی پێویستە، بەڵام دانانی کۆتو بەند لەیاساکەدا پرسێکی رامیارییە. بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بڕوانە: د. حميد الساعدی، س پ، ل ل ٨٩-٩٢. د. غالب علي الداودي واخرون، القانون الدستوري، دار الكتب للطباعة والنشر، بغداد، ب س، ل ل٣٣-٣٩.

نەبوو، بەتایبەتیش کەحکومەت تا ئەو کاتە تەنانەت یەك زانکۆشی دانەمەزراندبوو، لەبەر ئەوە لەو بارەیەوە چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کەرێژەیەکی بەرچاو لەو فەرمانبەرانەی کەبۆ ناوچەکە دادەمەزرێندرێن لەکورد نەبن، بەتایبەتی دوابڕگەی حەوتەمین خالّی بەیاننامەکە پاساوی بۆ ئەو بارە هێناوەتەوە کەدەڵێت لەناوچەکەدا فەرمانبەران لەکورد دەبن‌و جگە لەئەوان بەکەسی تر نادرێت مەگەر بەرژەوەندی ناوچەکە وابخوازێت!.

٧-خالّی هەشتەم ئاماژە بەوە دەکات کەژیانی پەرلەمانی ئەوە دەخوازێت کەرێکخراوی رامیاری دیاریکراو دامەزرێنرێت‌و رۆژنامە ئازادبێت لەدەربڕینی خواستەکانی گەل‌و کوردەکانیش لەسنوری یاسادا بەشداری لەم مافانەدا دەکەن‌و، بەپێی داخوازییەکان رۆژنامەکان لەناوچە کوردیەکان بەزمانی کوردی یان عەرەبی دەبێت.

لەلێکدانەوەی ناوەرۆکی ئەو بڕگەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کەلەگەڵ ئەوەی فرەیی رامیاری‌و ئازادی رۆژنامەنوسی دووپایەی گرنگن بۆ ژیانی دیموکراسی‌و پەرلەمانی لەولاتدا، بەلام حکومەت بەڕاشکاوی دانی بەدیاردەی فرەپارتی لەولاتدا نەنا، کەپێویست بوو لەبەر رۆشنایی‌ی دەستورو لەچوارچێوەی یاسای پارتەکاندا رێکخرێت، تەنانەت لەبەکارهێنانی زاراوەی (پارت) خۆی دوورگرتوو، و بەشێوەیەکی تەمومژاوی ئاماژەی بەدامەزراندنی رێکخراوی رامیاری کرد.

٨-بەیاننامەکە لەخالّی نۆیەمداو لەسێ بڕگەدا بەڵێن دەدات کە لێبوردنی گشتی پاش نەمانی توندوتیژی دەر بکات، بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەپەیوەندیان بەبارودۆخی (باکوور)ەوە هەبووە، هەروەها گێڕانەوەی فەرمانبەران‌و کرێکاران بۆ سەر کارەکانیان.

هەرچەند ئەنجامدانی ئەو هەنگاوانە لەو هەلومەرجەدا، لەڕووی ڕواڵەتییەوە بەهەڵوێستێکی پۆزەتیڤ دێتە بەرچاو، بەڵام ئازادکردنیان نەبەواتای گێڕانەوەی ئیعتبارو قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی کەلێیان کەوتووە دەگەیەنێت‌و نەبەڕاشکاوی یان بەناراستەوخۆ دان پێدانانە بەوەی کەئەوان بەشێکن لەبزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی نەتەوەیی‌ی گەلێك، بەڵکو پتر واتای ئەوە دەبەخشێت کەئەوانە تاوانبار بوون وەك هەر تاوانبارێکی ترو حکومەت لێیان خۆش بووە.

٩-حکومەت داوای ئەوە دەکات کە لەماوەی دوومانگدا هەموو ئەوانەی پێشتر لەسوپادا یان لەپۆلیسدابوون یان سیڤل بوون‌و بەشداریان لەبزووتنەوەکەدا کردووە، بەخۆیان‌و چەك‌و تەقەمەنییەکانەوە پەیوەندی بەشوێنەکانی خۆیانەوە بکەنەوەو بەپێی پلانی حکومەت بۆ ئەو بوارە هەڵسوکەوت بکەن، هەرکاتێك ئاشتی هاتەکایەوە (هێزی فرسان) بەپێی پلانی حکومەت ڕەوانەی شوێنەکانی خۆیان دەکرێنەوەو چەکەکانیان لێوەردەگیرێتەوە. دیارە ئامانجی سەرەکی حکومەت لەدانانی ئەو مەرجەدا بێهێزکردنی پێگەی سەربازی بزوتنەوەکە بو بەجۆرێك کەدواتر بتوانێت لەبواری ململانێی سەربازی‌و رامیاری‌و دیپلۆماسیدا پێگەی خۆی بەهێز بکات‌و لەو ڕوانگەیەوە مامەڵە لەگەڵ پێشهاتەکاندا بکات.

ئەوەی جێگەی سەرنجە کەسەرکردایەتی‌ی کورد هەرتەنها بەراگەیاندنی بەیاننامەیەك بەو ناوەڕۆکە کرچ‌و کاڵەوە کەئاماژەمان پێدا، بەو مەرجە پێشوەخت‌و مەترسیدارەی حکومەت قایل بوو، لەکاتێکدا کەئەو چەکدارانە لەڕووی ژمارەیان‌و شارەزایی سەربازییەوەو ئەو چەکانەی کەلەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان جێگەی بایەخ بوو، لەبەر ئەوە داماڵینی بزووتنەوەکە لەوان، کەلێنێکی

فرەلایـــەنی دروســـت دەکـــرد ئاکـــامی نێگـــەتیڤی هەمەچەشـــنەی لێدەکەوتـــەوە، شـــایانی بەراوردکردنـــە کەحکومـــەت بـــۆ پرســـی مامەڵەکردن لەگەڵ (هێزی فرسان)دا کەهاوکاری حکومـەت بـونو لەژێر فەرمانی ئـەودا کاریـان دەکـرد، بەهـەمان ئـەو گـوڕو تینـە ئامادەیی چـەکداماڵینی ئـەوانی تێـدا نـەبوو، بـەڵکو ئـەو کـارەی لەچوارچـێوەی پلانـــی خـــۆیو رەچـــاوکردنی بەرژەوەندییەکانیـــداو هاتنەکایەوەی ئاشتییەوە گرێدا.

١٠-حکومـــەت بـــەڵێنی دا کەدەســـتەیەکی تایبـــەت بـــۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە کوردییەکان دابمەزرێنێتو بودجەی بۆ تەرخان بکاتو چەند هەنگاوێکی تری چاکسازی لەبوارەکانی کۆمەڵایـەتیو روونـاکبیریو شـارەوانیدا بنێـت، لـەم بڕگەیـەدا ئـەوە دەردەکـەوێت کەحکومەت لەبوارەکانی ئاوەدانکردنەوەو گەشـەپێدانی کوردسـتاندا جگـە لەبـەڵێنی تەمومـژاوی هـیچ بەرنامەیـەکی روونو پشـت بەستوو بەتوێژینەوەو ئامـاری دروسـتی لـەو بارەیـەوە نەخسـتەڕوو، تەنانـەت ئامـادەیی ئەوەشـی نیشـان نـەدا کەدەزگایـەك لەئاسـتی وەزارەتدا بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکات.

وێڕای هەموو ئەوانەش، لەبارێکدا ئەگەر بەڵێنەکانی حکومـەت لەم بارەیەوە بەڕاست لێکبدەینەوە، بەڵام هێشتا لەسایەی سسـتمێکی فەرمانڕەوایی‌ی رامیاریو ئابووریو کارگێڕی لەو چەشنەدا چـاوەڕوان نەدەکرا کەگەلی کوردو سەرکردایەتییەکەی هیوایەکی ئەوتۆی لەسەر هەڵچنن.

١١-لـــەخاڵێکی تـــردا هـــاتووە کەحکومـــەت کـــار بـــۆ نیشتەجێکردنەوەی هەموو ئەوانە دەکات کە لەشوێنەکانی خۆیانـەوە گواستویانەتەوە یان دەرکراون، حکومەت بۆی هەیە هـەر ناوچـەیەك تـاپۆ بکـاتو خاوەنـەکانیان قەرەبوویـەکی دادپەروەرانـەو بەپەلـە

بکرێنەوە. ناوەرۆکی ئەم برگەیە گوزارشت لەڕاستیی پیادەکردنی حکومەتەکانی عیراق بۆ سیاسەتی راگواستنو بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان دەکات کەدرێژەی هەبووەو هاوکات رەواییو پاساو بەحکومەت دەدات کە بەبیانووی (بەرژەوەندیی گشتیی)ەوە دەست بەسەر هەرناوچەیەکی کوردستاندا بگرێتو بیکات بەموڵکی دەوڵەت.

سەبارەت بەسێ بەندە نهێنییەکەش، هەرچەند بایەخو گرنگییەکی رێژەییان هەبوو، بەڵام هیچیان جێبەجێ نەکران، و سەرلەبەریان لەئامانجو خواستە بنچینەییەکانی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی نەبوونو گوزارشتیان لەکرۆکی ئەو بزووتنەوەیە نەدەکرد. لەلایەکی ترەوە ئەوەی جێگەی سەرنجە قایل بوونی (بارزانی)یە بەوەی ئەو سێ بەندە بەنهێنی بمێنێتەوە لەکاتێکدا کەئاشکرانەکردنیان لەبەرژەوەندی حکومەت بوو نەك کورد، هەروەها هەردوو بەندی یەکەمو دووەم بەشێوەیەك لەشێوەکان لەبەندەکانی بەیاننامەکەدا هاتووە، بەتایبەتی لەبەندی هەشتەمو نۆیەمدا. لەراستیدا ئەمە سەرکەوتنێکی تری دیپلۆماسیەتی حکومەت بوو بەسەر کورددا، چونکە ئاشکراکردنی بەندەکان دەبووە مایەی وروژاندنی چەند لایەنێکی تری ناو عیراق کەنەیاری حکومەت بونو بەمەبەستی بەدەستهێنانی چەند دەستکەوتێك فشاریان لەسەر دروست دەکردو بەوەش کورد دەیتوانی باروپێگەی بێهێزی حکومەت بەقازانجی خۆی لەو ململانێیە رامیارییە-دیپلۆماسییەدا بقۆزێتەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە دوور نییە هۆی قایل بوونەکەی (بارزانی) لەبارەی بەنهێنی هێشتنەوەی سێ خاڵەکە کارێکی دەست قەست بووبێتو پتر پەیوەندی بەبڕگەی کۆتایی بەندی سێیەمەوە بێت وەکو پێشووتر ئاماژەمان پێدا کەتێیدا هاتووە، "پارتی دیموکراتی کوردستان باسکی جەلالی

لەكوردستاندا هەڵوەشێنرێتەوەو هەموو چەكدارەكانیشیان وەكو جاشەكانی تر چەك كرێن"![*].

دیارە سوربوونی (بارزانی) لەسەر جێبەجێكردنی حكومەت بۆ ئەو مەرجەی دوایی، لەڕوانگەی بەرژەوەندییەكانی باڵای نەتەوەیی گەلی كوردو لەتای تەرازووی ململانێی هێزەكاندا لەبەرامبەر حكومەتی عیراق، سەنگو بایەخی ئەوتۆی نەبوو تاوەكو (بارزانی) لەقۆناغو پرۆسەیەكی وەها هەستیارو چارەنووسسازدا پێی لەسەر دابگرێتو وەك خاڵێكی نهێنی دانوستانی لەسەر بكاتو پێی قایل بێت، هەر هیچ نەبێت بەبەراورد لەگەڵ پرسە چارەنووسسازەكانی تری عیراقو كوردستاندا.

دواتریش هەر لەدرێژەی ئەو هەڵوێستەیدا، لەو یاداشتەی كە لەكۆتایی مانگی (٩/١٩٦٦)دا پێشكەش بەسەرۆك كۆماری كردو هەروەها لەسەردانەكەی ناوبراودا بۆ كوردستانو دیداریان لەگەڵ یەكتریدا لە (٢٦/١٠/١٩٦٦)دا، دیسانەوە بابەتی چەكداماڵینی (نەیارەكانی)و بڕینی یارمەتییەكانی حكومەت لێیانو دوورخستنەوەیان لەپرۆسەی وتووێژەكاندا، داواكاریی سەرەكی (بارزانی) بوو لەحكومەت[٤٠].

---

[*] ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢١٦.

[40] بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٢٦. بەپێی (محسن دزەیی)، لەو كۆبوونەوەیەدا هەردوو لایەنەكە ئارەزووی خۆیان بۆ چارەسەركردنی كێشەكان بەرێوشوێنی ئاشتیانەو برایانەو جێبەجێكردنی بەندەكانی بەیاننامەكەی (بزاز) دەربڕی، هەروەها دوای گەڕانەوەی شاندەكەی حكومەت، (بارزانی) خۆشحاڵی خۆی بەو سەردانە دەربڕیو رایگەیاند كە هیچ گومانی لەنیازپاكیو پیاوچاكی سەركۆمارو ئارەزووی ئاشتیخوازانەی نەبووە!. بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٤١.

هەر لەدرێژەی ئەو دوو بەرەکییەدا باڵی بیرۆی سیاسیی پێشووی پارتی لە (١٩٦٧/٣/٢٧)دا کۆنگرەیەکی بەناوی (کۆنگرەی شەشەمین) بەست‌و کۆمەڵێك بڕیاری لێکەوتەوە، کەجگە لەو خاڵەی کەتایبەت بوو بەسووربوونیان لەسەر فشار خستنە سەر حکومەتی عیراق بۆ جێبەجێکردنی بەیاننامەکەی (بزاز)، ئیتر زۆربەی خاڵەکانی تر دووپاتکردنەوەو قوڵترکردنەوەی سیاسەت‌و هەڵوێستەکانی پێشووتریان بوو لەبارەی سەرکردایەتی‌ی پارتی باڵی (بارزانی)یەوە[٤١].

ئەم هەنگاوەو دژە هەنگاوەکانی نەیارەکەی ئەوەندەی تر کاریگەریان لەسەر بێهێزکردنی بەرەی نێوخۆیی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی بەجێهێشت‌و سەرەنجام لەبەرژەوەندیی حکومەتی عیراقدا شکایەوە لەسەر هەموو ئاستەکانی سیاسی‌و دیپلۆماسی‌و ئابووری‌و سەربازیدا.

---

شایانی ئاماژە پێدانە کە (جەمال نەبەز) رۆژی سەردانەکەی (عارف) بە (١٩٦٦/١٠/٢٨) باس دەکات کە بەمەبەستی دڵنیایی کردنەوەی (بارزانی) بوو لەنیازی حکومەت بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکەی (بزاز)، و (بارزانی) ئەوەی دەربڕی کەئاشتی‌و هێمنی لەعیراقدا بەئاوات دەخوازێت. بڕوانە، جەمال نەبەز، س پ، ل ٢٧٦.

41 بۆ زانیاری پتر لەبارەی گرنگترین بڕیارەکانی ئەو کۆنگرەیەوە، بۆ نموونە: بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٢٧-٢٢٨.

## باسی چوارەم
## پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو باڵەکەی سەرکردایەتیی کوردو حکومەتی عیراق لە (١٩٦٧-١٩٦٨/٧/١٧)

### تەوەری یەکەم:
### سەردەمی هەردوو کابینەی حکومەتەکەی (ناجی طالب)و (عبدالرحمن عارف)

لەسایەی ئەو هێمنییە رێژەیی‌یەی کە لەئاکامی درێژەکێشانی ماوەی وتووێژەکانی نێوان (بارزانی)و حکومەتدا هاتبووە کایەوە، ژمارەیەك لەبەرپرسانی پارتی باڵی (بارزانی) لەنێوان (١٦/١/١٩٦٧-٤/٤/١٩٦٧)داو لەسەر داوای سەرۆك کۆمار سەردانی بەغدادیان کردو چاویان بەژمارەیەك لەبەرپرسانی حکومەت کەوت[42]. ئەوەی بەدیدەکەین لەوبارەیەوە ئەوەیە کەهیچ لایەنێکیان کارنامەیەکی فەرمییان بۆ سەردانەکە رێکنەخستبوو، بەڵکو پتر لەسەردانی مجامەلەی رامیاری دەچوو، هەر بۆیە هیچ ئاکامێکی یاسایی‌و رامیاری لێنەکەوتەوە.

لە (١٩/١/١٩٦٧)دا (فواد عارف) و (بابە علی شێخ محمود) بەواژۆی خۆیان یاداشتێکیان پێشکەش بەسەرۆك کۆمار کردو تێیدا داوایان لێکرد کەپێویستە حکومەت هەنگاوی راستەقینە بنێت بۆ جێبەجێکردنی بەیاننامەکەی (بزاز) کەتا ئەو کاتەش هیچ بەندێکی

---

[42] ئەوانەی بەشداربوون لەسەردانەکانی ئەو ماوەیەدا: ادریس بارزانی، مسعود بارزانی، حبیب محمد کریم، صالح یوسفی، نافذ جلال، محسن دزەیی. بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٨٩-١٩١. محسن دزەیی، س پ، ل ل ١٤٥-١٤٩.

بەتەواوی جێبەجێ نەکرابوو بەپێی ئەوەی کە لەناوەڕۆکی سیازدە خاڵەکەی ئەو یاداشتنامەیەدا ئاماژەی پێدراوە[٤٣].

لە (٣/٥/١٩٦٧)دا (ناجی طالب) داواکاری دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کردو لە(٨/٥/١٩٦٧)دا پەسەند کرا، وە لە(١١/٥/١٩٦٧)دا کابینەی نوێی حکومەت بەسەرۆکایەتی (عارف)ی سەرۆك کۆمار پێکهات‌و چوار جێگری سەرۆك وەزیرانی لەخۆگرتبو، کەئەوانیش بریتیبوون لە(طاهر يحيى)و (فواد عارف)[٤٤] وەکو نوێنەری کورد کە بەرێنمایی‌ی (بارزانی) ئەو پۆستەی وەرگرت[٤٥]و(عبدالغنی الراوی)و (اسماعیل مصطفی)[٤٦].

لەگەڵ گرژتربوونی پەیوەندییەکان‌و دواتر هەڵگیرسانی جەنگی نێوان وڵاتانی عەرەبی‌و ئیسرائیل لە (٥/٦/١٩٦٧)دا، حکومەتی عێراقی کاری دەکرد لەپێناو مسۆگەرکردنی بەرەی کوردستان لەوەی کە لەکاتی بەشداریکردنی سوپای عێراق لەو جەنگەدا، هیچ جموجۆڵێکی سەربازی لەلایەن کوردەوە لەدژی سوپای عێراق نەکرێت کەکار بکاتە سەر پلان‌و چالاکییە سەربازییەکانی لەو شەڕەداو ئەگەر بکرێت هێزی پێشمەرگە لەپاڵ سوپای عێراقدا بەشداری پێبکرێت لەشەڕدا لەدژی ئیسرائیل[٤٧].

---

43 بۆ دەقی یاداشتنامەکە بڕوانە، فواد عارف، س پ، ل ل ٢٩١-٢٩٨.

44 بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١٩٦.

45 بڕوانە، د. شێرکۆ فتح الله عمر، س پ، ل ١٣٤.

46 (محسن دزەیی) ناوی (اسماعیل مصطفی)ی شیعە ئاینزای وەك چوارەمین جێگری سەرۆك وەزیران دێنێت. بڕوانە، محسن دزەیی، س پ ل ١٥١.

47 بایەخی سەرەکی بێلایەنکردن‌و دابینکردنی بەرەی کوردستان لەوەدا دەردەکەوێت وەکو (عبدالکریم فرحان) گوزارشتی لێکرد بەوەی لەو هەلومەرجەدا زۆربەی

لەبەرامبەریشدا بەرپرسانی ئیسرائیلی وەکو (شماریە جوثمان) دەڵێت: بەو شێوەیە بیریان دەکردەوە "یارمەتیدانمان بۆ کوردەکان کەڵکی زۆری پێگەیاندین، بۆ ئەوە یارمەتیمان دەدان لەجەنگیاندا لەدژی عیراق، تاوەکو رێگە لەعیراق بگرین هێرش بکاتە سەرمان، یان بەشداری لەجەنگێکی وەهادا بکات"[48].

حکومەتیش لەلایەن خۆیەوە داوای لەهەردوو لایەنە کوردییەکە کرد کەهەڵوێستی خۆیان لەو بارەیەوە دەربڕن، سەرکردایەتی پارتی باڵی بیرۆی رامیاری پێشوو هەڵوێستی خۆی بە بەڵێنی پشتگیریکردن‌و ناردنی هێزێك بۆ بەرەی جەنگ دەربڕی[49]. هەروەها حکومەت لەرێگەی ناردنی چەند کەسایەتییەکەوەو دواتریش لە (٥/٦/١٩٦٧)دا بەناردنی شاندێکی فەرمی بۆ لای بارزانی لەگەڵاڵە[50]، دەیویست لەو بارەیەوە لەهەڵوێستی ئەوانیش دڵنیا بێت،

---

سوپای عیراقی لەوبەرەیەدا دابەش ببوون. بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ١٩٨. بەپێی هەندێك سەرچاوە سەرکردایەتی‌ی کوردو بارزانی دەستپێشخەریان کرد بۆ ناردنی بروسکەو نامە بۆ حکومەتی عیراق‌و سەرۆکی میسر لەبارەی ئەنجام نەدانی کورد هیچ کارێك دژی سوپای عیراق کە کار بکاتە سەر بەشداریکردنی سوپاکە لەجەنگ دژ بەئیسرائیل، بڕوانە، د. شێرکۆ فتح الله عمر، س پ، ل ١٩٧.

48 شلومونکدیمون، س پ، ل ١٩١.

49 بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٣٥.

50 شاندەکە پێکهاتبوو لە (لیوا روکن حمودی مهدی)، (لیوا رکن ابراهیم الانصاری) سەرکردەی تیپی دووەم، (لیوا رکن کمال مصطفی عەلەمدار) سەرۆکی لیژنەی باڵای ئاشتی، (لیوا رکن حسن حلمی) سەرکردەی تیپی یەکەم، (لیوا رکن فاضل عباس حلمی)، و(عمید رکن عبدالمنعم المصرف) موتەصەریفی لیوای هەولێر، (شێخ ناظم العاصی). بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٥٢.

ناوبراو لەگەڵ ئەوەی بایەخێکی ئـەوتۆی بەداخوازیەکـەی حکومـەت نەدا، بەڵام هەرچۆنێك بێت بەڵێنی پێدان و لەوبارەیەوە دڵنیای کردن و بەڵێنەکەشی بەڕاستی بوو[51].

بـەڵام لەلایـەکی تـرەوە سـڵی لـەوە نـەدەکردەوە کـە لەلێـدوان و کۆڕەکانـدا لایـەنگری خـۆی بـۆ ئیسـرائیل و بایـەخی هاوپـەیمانێتی لەگەڵیدا دەبڕێت و هەروەها ئاشکرابوونی پەیوەندییـەکانیانی بـەلاوە گرنگ نەبوو، هەروەك چۆن بێ ئومێدی خۆی لەعەرەب دەردەبڕی[52]، و کوردو ئیسرائیلی بەهاوچارەنووس لەبەرامبەر عەرەبدا ناوزەد دەکردو تەنانەت پاش تەواوبوونی جەنگەکـەش سـەردانی ئیسـرائیلی کـردو چـاوی بەگـەورە بەرپرسـانی حکومەتەکـەی کـەوت و بڕێـك چـەك و تەقەمەنی لێوەرگرتن[53].

لەلێکدانەوەی هەڵوێستی هـەردوو لایەنـە کوردییەکـەدا لەمـەڕ جەنگی عەرەب-ئیسرائیل، گەیشتینە چەند ئەنجامێك و گرنگترینیـان دەخەینە ڕوو:

---

[51] بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٩٤. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٣٥. شـلومونکدیمون لـە ١٩٣. لـەو هەلومەرجـە رامیـاری و سـەربازییە ناسـکەدا کەحکومەتی عیراقی پێیدا تێپەڕدەبوو، (بارزانی) لەبری ئەوەی بـەپێی بنـەماکانی دانوسـتانی سـەرکەوتوو رەفتـاری بکردایـەو فشـاری بخسـتایە سـەر حکومـەت بەمەبەستی سەپاندنی مەرجی قورس و بەدەستهێنانی بەڵێن و مافی پـتر بـۆ گـەلی کورد، کەچی بەڵێنی بەشاندەکەی حکومەتداو گوتی "بروسکەیەك بەسـەر هـەموو یەکەکانی پێشمەرگەدا گشتاندن دەکەم بەراگرتنی هەموو کردەوەکـانی دژ بەسـوپا ئەگەر هەبێت و سوپاش بەتەواوی رێگەی لەبەردەمدا بۆ بەشداریکردن لەشـەڕەکاندا کە بەداخەوە تێیدا دۆڕاو دەبێت". محسن دزەیی، س پ، ل ١٥٣.

[52] بڕوانە، شلومو نکدیمون، س پ ، ل ل ١٢١، ١٤١، ١٦٠.

[53] بڕوانە، هـ س، ل ل ٢٠١-٢٠٣. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٣٥.

١-حکومەت لەداواکارییەکەیدا لەهەردوو لایەنە کوردییەکە بەوەی کەهەڵوێستیان لەو بارەیەوە نێگەتیڤ نەبێت، بەڵکو پێویستە پۆزەتیڤ بێت، تا ئەندازەیەکی باش ئامانجی خۆی پێکا.

٢-حکومەت توانی لەرێگەی دەرکردنی بەیاننامەو راگەیاندنی چەند خاڵێکەوە لەچوارچێوەی کارنامەی خۆیدا، وێڕای پێدانی بەڵێنی جۆراوجۆر، سەرکردایەتی کوردی بەدەمەوە بگرێت بەبێ ئەوەی هیچ پابەندێتیەکی یاسایی و رامیاری بخاتە ئەستۆی خۆی.

٣-لەئەنجامی درێژەکێشانی دووبەرەکی نێوانیاندا، سەرکردایەتی ی کورد نەیانتوانی ئەو هەلومەرجە نالەبارەی کەحکومەت لەسەر هەردوو ئاستی نێوخۆیی و دەرەکی پێیدا تێپەڕدەبوو لەبەرژەوەندیی کورددا بقۆزنەوەو فشار بخەنە سەر حکومەت و بەشێك لەداواکارییە بنچینەییەکانی گەلی کوردی پێ جێبەجێ بکەن، سەرەنجام هەلومەرجەکە گۆڕاو ئەوانیش هیچ ئامانجێکی ریشەیی کوردیان بەدەست نەهێنا.

٤-لەئاکامی بەراوردکردنی نێوان هەڵوێستی هەردوو لایەنە کوردییەکە لەوبارەیەوە وای بۆ دەچین کەهەڵوێستی (بارزانی) بەرامبەر بەڕوداوو پێشهاتەکان و حکومەتی عیراق جۆرێك لەمانۆڕی سیاسی و دیپلۆماسی پتری پێوە دیارە، چونکە هەڵوێستی خۆی بەتەواوی وابەستەی سیاسەتەکانی حکومەت نەکردو هاوکات هەموو سەرە داوەکانی وتووێژەکانی لەگەڵدا نەبری[54]، بەڵکو هەولێدا جگە لەعیراق دەرگای تر بۆ پشتیوانی و هاوکاریکردن لەسەر خۆی بکاتەوە، وەك ئەو پەیوەندیانەی کە لەگەڵ ئێران و ئیسرائیلدا

---

[54] بڕوانە، شلومو نکدیمون،س پ، ل ١٥٥.

ئەنجامیدا[55]. هەرچەندە هەندێك جار پەیوەندییەكانی لەگەڵ ئێراندا لەسەر حسابی بزووتنەوەی نەتەوەیی گەلی كورد لەرۆژهەڵاتی كوردستاندا دەبوو، پەیوەندییەكانی (بارزانی) لەگەڵ ئەو دوو وڵاتەدا بواری ئەنجامدانی مانۆڕی رامیاری دیپلۆماسی لەدژی حكومەتی عیراقی باشتر بۆ رەخساندو ئەندازەیەكی هەستكردن بەمەترسیو دڵەڕاوكێی بۆ حكومەتی عیراق دروست كرد[56].

**تەوەری دووەم:**

**سەردەمی كابینەی حكومەتەكەی (طاهر یحیى)**

(عبدالرحمن عارف) ی سەرۆك كۆمارو سەرۆك وەزیران، پاش ماوەیەكی كورت لەكاركردنیدا، لەپۆستی دووەمیاندا دەستی لەكار كێشایەوەو (ناجي طالب)ی بەپێكهێنانی كابینەی نوێ راسپارد بەڵام ناوبراو دوای ئەوەی كەنەیتوانی كابینەكە پێكبهێنێت، لە (١/٨/١٩٦٧)دا دەستی لەكار كێشایەوەو سەرۆك كۆماریش (طاهر یحیى)ی بۆ ئەو كارە راسپارد[57].

لەبارەی هەڵوێستی سەرۆك وەزیرانی نوێوە لەمافو داخوازییەكانی گەلی كورد، ناوبراو دوو لیژنەی پێكهێنا، یەكەمیان لیژنەی باڵای ئازووقە بەسەرۆكایەتی خۆیو دووەمیان لیژنەی ئاساییكردنەوەی بارودۆخی باكوور كە بەهاوبەشی لەنوێنەرانی حكومەتو نوێنەرانی (بارزانی) پێكهاتبوو[58].

---

55 بڕوانە، هـ س، ل ١٣٥.

56 بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ل ٢٣٦-٢٣٧.

57 بڕوانە، عبدالكريم فرحان، س پ، ل ٢٠٥. محسن دزەیی، س پ، ل ١٥٤.

58 لیژنەكە پێكهاتبو لە: نوێنەرانی حكومەت، (طاهر یحیى) سەرۆك وەزیرانو سەرۆكی لیژنەكە، وهەریەكە لەوەزیرانی نێوخۆو داراییو ئابووریو پیشەسازیو

(طاهر يحيى) لەدوا کابینەیدا کەساڵێكو چەند رۆژێکی خایاند دوو جار سەردانی بارزانیی لەکوردستاندا کرد، و لەسەردانەکەی کۆتایی مانگی ئابدا بۆ گەلاڵە، بەڵێنی لەبارەی جێبەجێکردنی بەیاننامەکەوەدا[٥٩]. وە لە (٢٧/١٠/١٩٦٧)دا شاندێکی رەوانەی لای (بارزانی) کردو هەڵوێستی حکومەتی لەبارەی هەندێك لەداخوازییەکانی کوردەوە روونکردەوە[٦٠]. بەڵام سەرلەبەری ئەو هەوڵانە

---

کشتوکاڵو کاروباری باکوورو سەرکردەی تیپی یەکەمو موتەسەریفی لیوای هەولێر (عبدالمنعم المصرف)و (لیوا کمال مصطفی عەلەمدار)، فەرمانەدەی کۆلیجی ئەرکان نوێنەرانی (بارزانی)، هەریەك لە (محسن دزەیی)و (نافذ جلال). بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ٢٠٩. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٩٥-١٩٦. هەر لەسەردەمی ئەم کابینەیەی ناوبراودا، بۆ یەکەمین جار وەزارەتی کاروباری باکوور دامەزرێندراو پۆستەکە بە (عمید عبدالفتاح سعید شاڵی) سپێردرا. بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٥٤.

59 بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ١٥٨. (عبدالکریم فرحان) دەڵێت: لەو کۆبوونەوەیەدا پێشنیازی پەیمانێکی نیشتمانیم کرد کە لەچوار خاڵ پێکهاتبوو، کەس هیچ رایەکی لەبارەوە دەرنەبڕی، واپێدەچوو کەهەموان بەناراستەوخۆ پێی قایل بن، و دواتر سەرۆك وەزیران سووربوونی حکومەتی لەسەر جێبەجێکردنی بەیاننامەکەی (بزاز) بە (بارزانی) راگەیاند. پوختەی خاڵەکان بریتیبوون لە: ١-هەڵگیرسانەوەی شەڕ تاوانو خیانەتە بەرامبەر نیشتمانو هاوولاتی. ٢-پاش کشانەوەی چەکدارە کوردەکان دامودەزگاکانی کارگێڕی خۆجێییەتی دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیانو کارەکانیان ئەنجام دەدەن. ٣-هەموو کوردەکان دەگەڕێنەوە سەر پیشەکانی خۆیانو.. هتد. ٤-شۆڕشگێڕە کوردەکان چەکە مام ناوەنجیو قورسەکانیان بەحکومەت دەدەن. بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ل ٢٠٩-٢١٠.

60 شاندەکە پێکهاتبوو لە: عقید عبدالهادی الراوی، عبدالفتاح شاڵی، عقید کمال مصطفی عەلەمدار، عبدالمنعم المصرف. بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ١٩٦.

هیچ هەنگاوێکی کردارەکیو راستەقینەی لێنەکەوتەوەو بەبێ ئاکام مایەوە. لەسەر ئاستی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لایەنە کوردییەکە، تا دەهات نێوانیان بەرەو ئاڵۆزیو پێکدادانی پتر دەچوو[61]، بەو شێوەیە بارودۆخەکە بەبەرژەوەندیی حکومەت شکایەوەو باری سەرکردایەتیی کوردی بەگشتی بێهێزترکرد*.

وێڕای گرژتربوونی پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتو (بارزانی) لەئاکامی فشاری رەوتی توندڕەوی ناو سوپا بۆ سەر سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نامەگۆڕینەوە لەوبارەیەوە لەنێوانیاندا هەر درێژەی هەبوو، کە بەشێوەیەکی گشتی جەختیان لەسەر تاوانبارکردنی یەکتری بەپێشێلکردنی رێککەوتنی ئاگربەستو داواکاریان بۆ سنووردانان بۆ دەستدرێژییەکانیان بۆ سەر یەکتری دەکردەوە[62].

هەر لەدرێژەی ئەو هەلومەرجەدا (بارزانی) هەوڵێکی دیپلۆماسیی خستە گەڕ لەرێگەی ناردنی نامەوە بە (عزیز شریف)دا، بەمەبەستی روونکردنەوەی بارودۆخەکەو ئاگادارکردنەوەی بەرپرسانی ژمارەیەك لەوڵاتانی وەك سوریاو میسرو جەزائیرو یەکێتیی سۆڤیێت لەسیاسەتە هەڵەکانی حکومەتی عیراقی لەبارەی

---

[61] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەو بۆ نمونە بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ل ٢٢٠-٢٢٢. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ل ٢٢٧-٢٢٨. مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٩٧-١٩٩.

* بۆ زانیاریی پتر لەبارەی هەڵسەنگاندنی سەرکردایەتیی کورد لەو قۆناغەدا بۆ نمونە بڕوانە، د. شێرکۆ فتح الله عمر، س پ، ل ١٢.

[62] بۆ زانیاری پتر لەو بارەیەوە، بڕوانە، مسعود البارزانی، ب٣، س پ، ل ل ١٩٩-٢٠١.

گەلی کوردەوەو داواکردنی لێیان کەجۆرێك لەفشار بخە نەسەر حکومەت بۆ ئەوەی بەو سیاسەتانەی خۆیدا بچێتەوە. بەلاّم کودەتاکەی رۆژانی (١٧-٣٠/٧/١٩٦٨)ی بەعسییەکان[٦٣]، کۆتایی بەو قۆناغە هێنا بەبێ ئەوەی نەشەڕەکانو نەهەوڵە دیپلۆماسییەکان ئاکامێکی ریشەیی بۆ گەلی کورد بەدەستەوە بدەن[٦٤]، بەوەش قۆناغێکی نوێی پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتو سەرکردەکانی گەلی کورد دەستی پێکرد.

---

[63] لەبارەی وردەکاریەکانی ئەو کودەتایەوە، بۆ نمونە بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ل ٢٣٦-٢٣٧. شلومونکدیمون، س پ، ل ٢١١. شایانی ئاماژەپێدانە کە (طاهر یحی)ی سەرۆك وەزیران بەماوەیەکی زۆر کەم بەر لەڕوودانی ئەو کودەتایەدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بە (عارف)ی سەرۆك کۆمار کرد. بەڕای ئێمە ئەوەش نیشانەیەکی تری پشێویی بارودۆخی رامیاری ولاّت بەگشتیو حکومەت بەتایبەتی بوو. لەوبارەیەوە بڕوانە، عبدالکریم فرحان، س پ، ل ٢٣٣.

-Iraq، History. www.infoplease.com.

-Borgna Brunner، Iraq Timeline، www.infoplease.com.

[64] لەو بارەیەوە بۆ نمونە بڕوانە، محسن دزەیی، س پ، ل ل ١٥٨-١٧٤. ئیبراهیم جەلال، س پ، ل ٢٤٢و لاپەڕەکانی دواتر. شۆڕش حسن عمر، س پ، ل ل ١٠٢-١١٤.

## پوختەی ئەنجامەکان

لەئاکامی ئەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە چەند ئـەنجامێك، لێـرەدا پوختەی گرنگترینیان دەخەینە روو:

١-گـەلی کـورد لەهـەموو قۆناغـە مێژووییەکانیـدا کـەخاوەن دەوڵەت، میرنشین، یان پارتو بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی نەتـەوەییو نیشتمانی بووە بایەخی دانوسـتانی رێوشـوێنە ئاشـتیەکانی زانیـوەو بەپێی تواناو رەخساوی هەلومەرجەکان پیادەی کردووە.

٢-مەرج نییە لەهەموو بارەکاندا ئامانجی لایەنە دانوستانکارەکان لەوتوێژەکانیاندا گەیشتن بوو بێت بەرێککەوتن، هەروەها مەرج نییە ئامانجە راگەیەندراوەکانیان ئامانجە راستەقینەکانیان بووبێت.

٣-چالاکی دیپلۆماسی لای گەلی کـوردیش ریشـەیەکی مێـژوویی قوڵی هەیەو قەوارە کوردییەکان هەر لەسەردەمی لۆلۆییو میتـانیو میدییەکانەوە بۆ نمونە بایەخیان زانیوەو بەپێی هەلومەرجو رێورەسمی باوی سـەردەمەکانیان لەگـەڵ قـەوارەکانی دەوروبەریانـدا پـەیڕەویان کـردووەو هەوڵیانـداوە وەکـو ئـامرازێکی ئاشـتیانەیەی راپەڕانـدنی سیاسەتی دەرەوەیان کەڵکی لێوەرگرن.

٤-پرۆسـەکانی دانوسـتان لـەو سـەردەمانەی کـەکورد خـاوەنی قەوارەی سەربەخۆی وەك دەوڵەتو نیمچـە سـەربەخۆی وەك میرنشـین بووە، لەدوو ئاستی تـا ئەندازەیـەك هاوتـا لەگـەڵ دەوڵـەتانی تـردا ئەنجامدراوە، وەکـو ئـەوەی لەسـەردەمی دەوڵـەتی میـدیو دەوڵـەتی دۆسـتەکی ومیرنشـینەکانی ئـەردەڵانو بابـانو سـۆرانو بۆتانـدا روویانداوە، بەڵام دانوستانەکانی نێوان سـەرکردایەتیی گـەلی کـورد لەباشـورو دەسـەڵاتدارانی ئینگلیـزو حکومەتـەکانی عـیراق هـەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە لەنێوان دوولایەنـدا بـووە کـە بەلایـەنی

کەمەوە لەڕوی ئاستو سروشتی یاساییانەوە لەیەکتری جیاواز بوون، لایەنێکیان لەسەر ئاستی فەرمیو لەسروشتی دەوڵەتدا کەحکومەت نوێنەرایەتی دەکرد، ئەویتریان لەسەر ئاستی سیاسی-میللیو لەسروشتی بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی نەتەوەییدا کەسەرکردایەتییەکی میللی دەینواند.

٥-(شێخ عبدالسلامی دووەم) لەسنووری توانا و رەخسانی هەلومەرجەکەدا چەند رێوشوێنێکی رامیاریو دیپلۆماسی گرتەبەر لەچەشنی هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانو یەکخستنی هەڵوێستی هۆزو تیرە کوردییەکانو پێوەندی کردن بەپارتو کۆمەڵەو کەسایەتییە کوردییەکانو ناردنی بروسکە بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانیو کارکردن بۆ پتەوکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ کەمینەکانی نێوچەکەو وتووێژکردن لەگەڵ هەندێك لەبەرپرسانی تورکو دواتریش رووسدا. وێڕای بایەخی ئەو هەولانە، بەلام ئەنجامێکی راستەوخۆی بەدەستەوە نەدا، بەپلەی یەکەم بەهۆی بەرپابونی یەکەمین جەنگی جیهانو شوێنەوارەکانییەوە لەسەر نێوچەکە بەگشتیو باشووری کوردستان بەتایبەتی.

٦-وتووێژەکانی نێوان سەرکردایەتیی گەلی کورد لەباشوور لەسەردەمی (شێخ محمودی حفید)و حکومەتی عیراقداو دەسەڵاتدارانی بەریتانیا لەم ولاتەدا، وێڕای ئەوەی کەکورد سێ جار بوو بەخاوەن حکومەتی نێوخۆیی تایبەت بەخۆی لەناوچەکەدا، بەلام بەهیچ شێوەیەك بوونو کاریگەری دامو دەزگاکانی ئەو حکومەتە کوردیانە لەمیانی پرۆسیسەکانی وتووێژدا لەگەڵ هەردوولایەنی عیراقو بەریتانیادا رەنگی نەداوەتەوە، بەم شێوەیە لەلێکدانەوەی وتووێژەکانی ئەو قۆناغەدا هیچ کاتێك هەست بەوە ناکرێت کە لەنێوان دوو لایەندا بووە کەهەردووکیان خاوەنی حکومەت بووبن،

چونکە وتووێژەکان سروشتی یاسایی‌و فەرمیان وەرنەدەگرت، وەك ئەوەی پێویست بوو وابێت، بەڵکو لەلایەنی کوردەوە لەپرۆسەکان پتر مۆرکی تاکەکەسی‌و سەرکردایەتی‌ی میللی-نیوچەیی بەخۆوە بینی، نەك مۆرکی فەرمی حکومەتی کوردستان.

٧-ئامانج‌و داخوازی (شێخ محمودی حفید)و هەڵوێستەکانی لەمەڕ بارودۆخی کوردستان‌و عیراق لەسەر بنەمایەکی جێگیرو بەرنامەدار نەبوو، بەڵکو پتر مۆرکی کاردانەوەی لەبەرامبەر سیاسەتەکانی حکومەتەکانی بەریتانیاو عیراقی لەمەڕ خواستەکانی گەلی کورد لەباشوور پێوە دیارە. لەم روانگەیەوە دەبینین داخوازییەکانی ناوبراو لەوتووێژەکاندا جۆرێك لەمۆرکی گشتگیریی‌و ناڕوونی‌و ناوردی‌و هەڵکشان‌و داکشانی پێوەدیارە، بەڵام هەڵوێستی هەردوو حکومەتی بەریتانی‌و عیراقی لەوتووێژەکاندا لەبارەی دۆزی نەتەوەیی گەلی کوردەوە لەباشوور، لەسەر بنەمایەکی ستراتیجی تا ئەندازەیەکی زۆر روون دارێژرابوو، بەجۆرێك کە لەباشترین باردا ئامادەیی سەلماندنی لانی هەرە کەمی خواستە کارگێڕی‌و زمانەوانیەکانی گەلی کوردبن.

٨-خەباتی رامیاری‌و دیپلۆماسی‌و چەکداری کورد لەسەردەمی (شێخ محمودی حفید)دا چەند رێوشوێن‌و شێوازێکی بەخۆوە بینی کەسەرجەم تەواوکەری یەکترین گرنگترینیان:

أ-کارکردن بۆ سازدانی بەرەی نێوخۆیی‌ی کورد.

ب-نامەگۆڕینەوە، ناردنی یاداشتنامە، ناردنی نوێنەری تایبەت بەشێوەی تاك‌و هەندێك جاریش بەشێوەی دەستە نێردراو.

ت-سەردانی کردنی بەرپرسانی عیراقی‌و بەریتانی‌و پێشوازیکردنیان‌و ئەنجامدانی کۆبوونەوە لەگەڵیاندا لەئاستی هەرە بالاوە تا نزمترینیان.

پ-پرس‌و راوێژکردن بەکەسانی دەوروبەری هەرچەندە بەئەندازەیەکی سنووردداریش بێت.

ج-ناردنی نامەو یاداشتنامە بۆ ناوەندە نێودەوڵەتییەکانی وەکو کۆنگرەی ئاشتی لەپاریس‌و رێکخراوی کۆمەڵەی گەلان.

ح-بەکارهێنانی خەباتی چەکداری‌و ئەنجامدانی رێککاری ناوبەوناو لەگەڵ ژمارەیەك لەبەرپرسانی توركدا بەمەبەستی فشار خستنە سەر عیراق‌و بەریتانیا بۆ سەلماندنی بەشێك لەماف‌و داخوازییەکانی گەلی کورد.

٩-(شێخ محمود) لەچارەنوسسازترین‌و دژوارترین هەلومەرجی نێوخۆیی‌ی باشووری کوردستان‌و عیراق‌و نێودەوڵەتیدا کاری دەکرد، کەوێستگە سەرەکییەکانی بریتی‌بوون لەیەکەمین جەنگی جیهانی‌و کاریگەرییەکانی لەسەر جیهان‌و ناوچەکەو دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق‌و بەزۆر لکاندنی باشوری کوردستان بەو وڵاتە تازە دامەزراوەوەو دانانی یەکەمین دەستوری عیراق‌و ماندێتی عیراق‌و دواتر سەربەخۆبوونی عیراق‌و بەئەندامبوونی لەرێکخراوی کۆمەڵەی گەلاندا. هەرچەندە (شێخ محمود) بۆی نەلوا کە لەرێگەی کارو چالاکییە سەربازی‌و دیپلۆماسییەکانییەوە ئامانجە بنچینەییەکانی گەلی کورد لەباشوردا بەدی بهێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت کاریگەری سەرلەبەری دۆزی نەتەوەیی کورد لەباشورو هەوڵەکانی سەردەمی ناوبراو لەپرسەکانی عیراق بەگشتی‌و ئەو ئەندازە کەمەی مافە سەلمێندراوەکانی ئەم گەلە لەقۆناغی پاشایەتی عیراقدا رەچاو نەکرێت لەچەشنی بەنیوەچڵی سەلماندنی رامیاری‌و یاسایی بەشێکی هەرە کەمی مافەکانی گەلی کورد لەباشوردا لەشێوەی مافەکانی هاوڵاتیبوون‌و مافە کارگێڕی‌و کلتووری‌و زمانەوانییەکان‌و بەشداریکردنی ژمارەیەك لەنوێنەرانی کورد لەدامودەزگاکانی

فەرمانڕەوایی عیراق‌و دەربڕینی چەندین بەیاننامەی فەرمی‌و بەڵێنی زارەکی‌و جێگیرکردنی چەندین مەرج لەبەڵگەنامە یاساییە نێوخۆیی‌و نێودەوڵەتییەکاندا لەبارەی مافەکانی گەلی کوردەوە، بەتایبەتی لەسەروبەندی تاج لەسەرنانی فەیسەڵ‌و دانانی دەستورو لکاندنی باشوری کوردستان بەعیراق‌و مەرجەکانی سەربەخۆییبوونی‌و بەئەندامبوونی لەڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلاندا دیارە سەلماندنی ئەو بڕە مافانە بەهەموو کەموکوڕییەکانیەوە، بایەخی خۆیان هەبووە. چ بۆ ئەو قۆناغە بێت یان سەلماندنی بەشێك لەمافەکانی گەلی کورد بێت لەسەردەمی کۆماریدا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو گرنگی‌و بایەخەشدا، هێشتا پێمان وایە کەرۆڵی کورد لە بەلاداخستنی ئەو پرسانەی ئاماژەمان پێدا یەکلاکەرەوە نەبوو.

١٠-چەند تێبینییەکی سەرەکی لەسەر سیاسەت‌و هەڵوێستەکانی (شێخ محمود) بەدی دەکرێن گرنگترینیان:

أ-دانەمەزراندنی دەزگایەکی دیپلۆماسی یان تەنانەت لیژنەیەك بۆ راپەڕاندنی کارو چالاکی دیپلۆماسی حکومەتەکەی، لەکاتێکدا کەسەردەمی ناوبراو پێکهێنانی سێ حکومەتی لەباشوری کوردستاندا بەخۆوە بینی، هەرچەندە ئەنجامدانی کارێکی بەو چەشنە لەو قۆناغەدا ئاسان نەبوو، چونکە حکومەتی عیراقیش لەسەرەتاوە ئەو جۆرە دامودەزگایەی نەبوو.

ب-داوانەکردنی بۆ ئامادەبون لەبەردەم لیژنەی ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلاندا کەبۆ وەرگرتنی راوبۆچونی دانیشتوانی ناوچەکە هاتبوون لەبارەی دیاریکردنی چارەنوسی باشوری کوردستانەوە، لەبەرئەوەی ئامادەبوون‌و خستنەڕووی بۆچون‌و داخوازییەکانی کورد لەو قۆناغە هەستیارەداو لەو ئاستە بەرزەدا کارێکی یەکجار پێویست بوو، چونکە دەرفەتێکی تری لەو چەشنە دواتر دووبارە نەبۆوە.

ت-پشــت نەبەســتنی وەکــو پێویســت بەتوێــژی سیاســەتوانو رووناکبیرانی کــورد لەراپەرانــدنی کاروچــالاکییە رامیــاریو دیپلۆماسییەکانیدا.

پ-ساردبونەوەی ناوبراو لەدوایین قۆناغــەکانی ژیــانی رامیاریــدا لەپێشــەوایەتی کردنــی گــەلی کــوردو بزووتنــەوە نەتەوەییەکــەی لەباشوردا.

١١-ئەوەی تێبینی دەکرێت کەهیچ کام لەحکومەتەکانی عیراقــی قۆنــاغی پاشــایەتی بەرنامەیــەکی روونیــان بــۆ چارەســەرکردنی دادپەروەرانەی دۆزی نەتەوەییی گەلی کورد نەخستەکارو هیچ کاتێــك ئــەو پرســە نــەبووە بابــەتێکی فــەرمی ســەرەکی کارنامــەی ئــەو حکومەتانــە، جگــە لەچــەند سیاســەتو هەڵوێســتێکی لاوەکــیو ناراستەوخۆ لەو بارەیەوە، لەبــەر ئــەوە دۆزی نەتــەوەییی کــورد لــەو قۆناغەدا بەچارەسەرنەکراوی مایەوە.

١٢-رابەرانی بزوتنەوەکانی بارزان (شێخ احمدو مصطفی بــارزانی) لــەپاڵ خــەباتی چــەکداریدا، بڕوایــان بەرێگــە چــارەی ئاشــتیانەی کێشەکان هەبووەو بایەخی رێوشوێنی رامیاریو دیپلۆماسیان زانیوەو کاریان پێکردووەو زۆربەی ئەو رێوشوێنو ئامرازانــەیان بــەکارهێناوە کەهەلومــەرجی ئــەو کاتــەی کوردســتان دەیڕەخســاند، لەچەشــنی کــارکردن بــۆ یەکخســتنی ریــزو هەڵوێســتی کــوردیو هــەوڵی هەماهەنگی کردن لەگەڵ کەمینەکانی کوردستانو نــاردنی نامــەو یاداشــتو نێــردراوی تایبــەتی بــۆ وتووێــژکردن لەگــەڵ بەرپرســانی عیراقیو بەریتانیو تەنانەت هەندێك جار تورکیو روسیشــدا، بــەلام لەگەڵ ئەوەشدا بــارودۆخی نالــەباری باشــوری کوردســتان لەهــەموو رووەکانییــەوەو کاریگــەری نێگــەتیڤی هــەردوو جــەنگی جیهــانیو سیاسەتەکانی هەردوو حکومەتی عیراقو بەریتانیا بەرامبەر بەگــەلی

کوردو مافەکانی، وێڕای هەڵوێستی ئەو وڵاتانەی تر کەکوردستانیان داگیر کردووە، سەرلەبەر ئاستەنگ بوون لەبەردەم بەدیهێنانی ئامانجە سەرەکییەکانی خۆی.

١٣-دیدو سیاسەتەکانی سەرکردایەتی‌ی کوردی بۆ دانوستان لەگەڵ حکومەتەکانی عیراقدا هەمیشە لەپێناو گەیشتن بووە بەرێوشوێن‌و ئامانجە هاوبەشەکانی نێوانیان کەبەرژەوەندی هەردوو لایەن بێنێتەدی، بەپێچەوانەی حکومەتەکانی عیراقەوە کەتاکە پاڵنەرو ئامانجیان بریتی بووە لەبەدەستهێنانی بەرژەوەندییە تاک لایەنەکانی خۆیان، ئەم هۆکارەش فاکتەرێکی هەرە بنچینەیی سەرنەگرتنی وتووێژەکانی سەرلەبەری پرۆسەکانی دانوستانی نێوانیان بووە.

١٤-لەئاکامی بەراوردکردنی نێوان ئامانجەکانی هەردوو لایەنی دانوستانکاردا، بۆمان دەرکەوت کەئامانجی سەرەکی لایەنی کوردی لەوتووێژەکاندا گەیشتن بووە بەرێککەوتنێك کەلانی کەمی خواستە نەتەوەیی‌و دیموکراسییەکانی گەلی کورد بهێنێتەدی، کەچی تاکە ئامانجی حکومەتەکانی عیراقی بریتی بوو لەچەواشەکردن‌و فریودانی بەرامبەرو ئەنجامدانی مانۆڕی رامیاری‌و بەدستهێنانی کات‌و خۆرێکخستن‌و خۆسازانەوە بوو بۆ خولێکی تری جەنگ لەدژی کوردو داگیرکردنەوەی کوردستان، ئەمەش هۆکارێکی تری سەرەکی‌ی سەرنەگرتنی وتووێژەکانی نێوانیان بوو.

١٥-دانوستانەکانی نێوان هەردو لایەنی پەیوەندیدار پتر لەچوارچێوەی پەیوەندییە رامیارییەکاندا بووە، بە بەراورد لەگەڵ تەوەرەکانی تردا، بەبۆچونی ئێمە هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی رامیاری دۆزی نەتەوەیی کورد کەپرسێکی سیاسییە بەر لەهەموو بوارەکانی تری ژیان.

١٦-هەرەسهێنانی سستمی پاشایەتیو هاتنەکایەی سستمی کۆماری لەسەردەمی (قاسم)دا بووە مایەی بوژاندنەوەی هیوای کورد لەبارەی بەدەستهێنانی بەشێك لەمافەکانی لەبەر ئەوە دەستپێشخەری کرد لەچوونە پێشەوە لەدەسەلاتدارانی نوێی عێراقو لەدوو سالی یەکەمدا جۆرێك لەهاوپەیمانێتی کاتیی لەنێوان هەردوو لایەندا دروست بوو وە حکومەتیش چەند هەنگاوێکی روالەتی نا، بەلام بەهۆی جۆری بیرکردنەوەی دەسەلاتدارانی عێراقو جۆری پێکهاتەی سستمی دەستوریو رامیاری ولاتو تێروانینیان بۆ دۆزی کورد زەمینەی درێژەدان بەو هاوپەیمانێتییە نەرەخساو سەرلەبەری هەولە رامیاریو دیپلۆماسییەکانی سەرکردایەتیی کوردی لەو قۆناغەدا ئامانجە بنچینەییەکانی خۆیان نەپێکا، بەلام لەبەرامبەر ئەوەشدا چارەسەرنەکردنی دادوەرانەی حکومەت بۆ دۆزی کورد هۆکاری سەرەکی شکستهێنانی ئەو حکومەتە بوو لەبەدیهێنانی سەرجەم ئامانجەکانی خۆیدا، بەو شێوەیە ئەو قۆناغەش زەمینەو هەلومەرجەکانی دانوستانی سەرکەوتووی بەخۆوە نەبینی.

١٧-خەباتی رامیاریو چەکداری گەلی کورد لەباشووردا لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییو نیشتمانیو دیموکراتییەکانیدا، هەر لەسەردەمی پاشایەتییەوە درێژەی هەبوو، لەو قۆناغەدا چەند دەسکەوتێکی نیوەچلی بەدەستهێناوە، بەرووخانی پاشایەتیو راگەیاندنی حکومەتی کۆماری لەسالی (١٩٥٨)دا بزوتنەوەکەی چووە قۆناغێکی نوێوە لەرووی هەلومەرجو ئامانجو شێوازی کارکردنەوەو، سەرکردایەتیی کورد هەولیدا کە لەئاستی بەرپرسیارێتی ئەو قۆناغەدا بێت.

١٨-ئەو گۆرانکارییەی لەسالی (١٩٥٨) لەعێراقدا هاتەکایەوە، کودەتابوو، نەك شۆڕش، چونکە نەیتوانی گۆڕانکاریی ریشەیی

لەکۆمەڵگەدا ئەنجام بدات کەئامانجی پرۆژەی هەر شۆڕشێکە، ئەو ڕاستییەش ڕەنگدانەوەی نێگەتیڤی هەبوو لەسەر چارەسەرکردنی دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد لەباشور لەسایەی ئەو ستەمەدا.

١٩-جۆرو ئاستی پەیوەندییەکانی نێوانیان لەماوەی دوو ساڵی یەکەمیدا، سەرباری هەموو کەم و کوڕیو ئاڵۆزییەکانی بەڵام بۆ هەردوو لایەن لەزۆر ڕووەوە بەکەڵك بوو.

٢٠-سەرکردایەتیی کورد لەپرۆسیسکردنی سیاسیو دیپلۆماسیی خۆیدا زۆربەی ڕێوشوێنو ئامرازە ڕەخساوەکانی ئەو بوارەی گرتەبەر بۆ دەربڕینی سیاسەتو هەڵوێستەکانی لەمەڕ پرسەکانی عیراق بەگشتیو دۆزی کورد بەتایبەتی، بۆ نمونە لەوانە:

أ-کارکردن لەپێناوی ڕێکخستنو سازدانی بەرەی نێوخۆیی گەلی کوردو پاراستنی یەکڕیزییان.

ب-دامەزراندنی پەیوەندی ڕێککاریو هاوکاری لەگەڵ هەندێك لەپارتو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقیدا، کە لەپێناو ڕووخاندنی حکومەتی پاشایەتیدا کاریان دەکرد.

ت-دەستپێشخەری کردن لەناردنی بروسکەی پیرۆزباییو دەربڕینی پشتیوانی لەڕابەرانی کودەتاکەو دەسەڵاتدارانی نوێی عیراق.

پ-دەرکردنی بەیاننامە بۆ گەلی کورد، تاوەکو پشتیوانی لەحکومەتی کۆماریو چەسپاندنی کۆڵەکەکانی بکەن.

ج-ڕەوانەکردنی دەستەی نێردراو بۆ پایتەخت، بۆ ئەنجام دانی دیدارو گفتوگۆکردن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی حکومەتی کۆماریدا، بەمەبەستی دەربڕینی هەڵوێستی گەلی کورد لەحکومەتی نویو خستنەڕووی مافو خواستەکانیو پێویستی دانپێدانانو جێبەجێ کردنیان لەلایەن حکومەتەوە.

ح-ئەنجام دانی خەباتی رامیاریو دیپلۆماسیو یاساییو سەندیکایی لەپێناو سەلماندنی مافەکانی گەلی کورد لەدەستورو یاساکانی دەوڵەتداو بەدیهێنانیان بەکردەوە.

خ-کارکردن لەپێناو بەنێودەوڵەتیکردنی دۆزی کوردو دەستەبەرکردنی پشتیوانیو هاوکاری چەند دەوڵەتێکی جیهان، کەهەندێك جار هەڵوێستەکانیان پشتگیرییەکی مەعنەوی پێویست بوو لەدۆزی کورد، ئەم هەنگاوە هۆشداری سەرکردایەتیی (پارتی) لەبارەی گرنگی وەبەرهێنانی فاکتەری نێودەوڵەتی لەبواری دیاری کردنی چارەنووسی کوردا دەسەلمێنێت.

٢١-گرتنەبەری رێگە چارەی رامیاریو دیپلۆماسیو راگەیاندنی ئامانجو دروشمو سیاسەتی روونو ئاشکرا بۆ بەدەستهێنانی مافەکان بەلای گەلی کوردو سەرکردایەتییەکەیەوە، ستراتیج بو، نەك تەکتیك، ئەمەش بەپێچەوانەی حکومەتی عیراقەوە کەئەو رێگەچارانەی وەکو تەکتیك دەبینیو پەیڕەوی دەکردو، گرەوی بنچینەیی لەسەر رێوشوێنی سەربازیو توندو تیژیو سیاسەتی فریودانو چەواشەکردن دەکرد بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیو سەرکەوتن بەسەر بەرامبەرەکەیدا، بەڵام لەئاکامدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ئەو جۆرە سیاسەتەش یەکێك بوو لەفاکتەرە سەرەکییەکانی بێهێزبوونی دەسەڵاتەکەیو دواجار هەرەسهێنانی.

٢٢-لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (قاسم)دا گەلی کوردو سەرکردایەتییەکەی تا ئەندازەیەك هێشتا یەکێتی ناوەندی بڕیارو ریزەکانیان پاراست بوو، هەرچەندە بەراییەکانی دووبەرەکیو لێکترازان سەری هەڵدابوو، ئەمەش بەپێچەوانەی باری حکومەتی عیراقەوە کە لەسەر هەردوو ئاستی حکومیو میللی تا دەهات ناکۆکیو ململانێکانی نێوانیان قوڵتر دەبوو، بەچەشنێك کەبووە

فاكتەرێكی بەهێزبوونی بەرەی كوردیو لەهاوكێشەی كێشمەكێشی نێوانیاندا بەكەڵك بوو.

٢٣-سیاسەتی سەركردایەتیی كورد لەبواری پێكەوەگرێدانی ئامانجە نەتەوەییەكانی گەلی كوردو ئامانجە گشتییەكانی گەلانی عیراقدا جۆرێك لەدووربینیو واقیعبینی رامیاریو دیپلۆماسی دەنواند، بەتایبەتی پاش ئەوەی لكاندنی زۆرە ملێی باشووری كوردستان بەعیراقەوە هەر لەسەردەمی پاشایەتییەوە بوو بەدیفاكتۆو سەركردایەتیی كورد تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت ناچاربوو لەچوارچێوەی ئەو واقعە سەپاوەدا رەفتار بكات، بەم شێوەیە توانی تارادەیەك هاوسۆزیی بەشێك لەهێزە نیشتمانیو دیموكراتیخوازەكانی عیراق بۆ خۆی دەستەبەر بكات ئەگەر بەشێوەیەكی كاتییش بێت، بەجۆرێك كەكاری كردە سەر سنووردراكردنی تواناو مەودای مانۆڕی رامیاریو سەربازیی حكومەت لەدژی گەلی كوردو (پارتی).

٢٤-لەبواری ئەندازەی رەچاوكردنی رەوشت لەسیاسەتدا، سەركردایەتیی گەلی كورد لەسیاسەتو هەڵوێستەكانیدا، پابەندبوونی خۆی بەبەها رەوشتیو یاساییەكانی مەیدانی سیاسەتەوە سەلماند، بەپێچەوانەی دەسەڵاتدارانی حكومەتی عیراقەوە، دیارە ئەمەش لەلایەكەوە لەو راستییەوە سەرچاوە دەگرێت كەسەركردایەتیی كورد رێبەرایەتیو نوێنەرایەتی دۆزی نەتەوەییو نیشتمانی گەلێك دەكات كەخۆی قوربانی دەستی لەدەستدانو فەرامۆش كردنی بەها رەوشتیەكانە لەسیاسەتی نێوخۆیی عیراقو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیشدا، لەلایەكی ترەوە جیاوازی نێوانیان لەشێوازی پرۆسەكردنی سیاسەتدا دەنوێنێت كەتێیدا سەركردایەتیی كورد بەشێوەیەكی سەرەكی تێكەڵ كردنی سیاسەتو سۆزداری پێوە دیارە، بەپێچەوانەی حكومەتی عیراقەوە كە بەشێوەیەكی پراگماتیو

بەپشت بەستن بەپرنسیپی پەنابردنە بەر هەموو ڕێوشوێنێك بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی، کاری کردووە.

٢٥-لەلێکدانەوەی هاوکێشەی پەیوەندییەکانی نێوانیاندا کەپێکهاتووە لە (هاوکاری، ململانێ، کێشمەکێش) دەردەکەوێت کەتەرازووی بنەماکانی هێزی ماددی بەشێوەیەکی گشتیو بەئەندازەیەکی گەورە بەقازانجی دەوڵەتی عیراقو حکومەت شکاوەتەوە، بەڵام بنەماکانی هێزی مەعنەوی بەقازانجی گەلی کورد بووە، بەهۆی ڕەوایی دۆزەکەیو سروشتی گشتگیرییو هەمەلایەنەیی لەئامانجو دروشمو سیاسەتەکانیدا لەسەر ئاستی گەلی کورد بەتایبەتیو گەلانی عیراقدا بەگشتی.

٢٦-ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم قۆناغەدا، ئەوەیە کەهیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نیە بیسەلمێنێت، کەدیدارو گفتوگۆو دانوستانەکانی نێوانیان لەسەر بەرنامەیەکی پێشتر نەخشە بۆکێشراوو ئامادەکراو ئەنجامدرابن، بەڵکو پتر مۆرکی سەرپێیی پێوەدیارە، لەچەشنی نەبوونی شاندی پسپۆر بۆ ئەنجام دانی دانوستان، نەبوونی کارنامەی دانیشتنەکان، نەبوونی کۆنووسی دانیشتنەکانو، ڕانەگەیاندنی ئاکامەکان بەوردی بۆ ڕای گشتی.

هیچ ڕێککەوتنێکی نووسراو لەنێوان هەردوو لایەندا بەدیناکرێت، بەم شێوەیە حکومەت جگە لەراگەیاندنی چەند لێدوانو بەیاننامەو دەقێکی دەستوریو یاسایی گشتی پابەندێتیەکی یاسایی نێوخۆیی یان نێودەوڵەتی ڕوونی نەدەخستە ئەستۆی خۆی.

٢٧-هەندێك جار دیدارو گفتوگۆکان بەشێوەی ڕاستەوخۆ لەنێوان سەرکردایەتی هەردوولایەندا لەشێوەی (دیپلۆماسیەتی لوتکە) ئەنجام دراوە واتا لەدوو ئاستی نوێنەرایەتیکردنی هاوتادا، یان لەرێگەی نوێنەرێکی سەرۆکی حکومەتو خودی سەرۆکی پارتییەوە

ئەنجام دراوە، واتا لەدوو ئاستی ناهاوسەنگداو حکومەت پشتی نەدەبەست بەشاندی پسپۆرو سیڤیل، بەڵکو سەرۆکی حکومەت خۆی یان بەکەسانی سەربازی باوەڕپێکراوی خۆی دەسپارد، ئەمەش رەنگدانەوەی پێکهاتەو ئایدیای حکومەتی عیراق بوو لەوسەردەمەدا کەتێیدا دامەزراوەی سەربازی جڵەوی دەسەڵاتی سیاسیی وڵاتی بەدەستەوە بوو.. لەلایەنی کوردەوە، پرۆسەکان بەشێوەیەکی گشتی رێکخستن‌و بەرنامەرێژی تەواوی لەخۆنەگرتبوو.

٢٨-شێوازی گەیشتن بەدەسەڵات لەعیراقداو جۆری ئەو سستمی فەرمانڕەواییی‌و دەستورەی کەدەهاتە کایەوەو شێوازی بیرکردنەوەو سیاسەتی حکومەتەکان لەسەر هەردوو ئاستی نێوخۆیی‌و دەرەکیدا، کاریگەری سەرەکی هەبوو لەسەر نەگەیشتنی ئەو حکومەتانە بەچارەسەرێکی دیپلۆماسیانەو دادپەروەرانەی کێشەکانی عیراق بەگشتی‌و دۆزی نەتەوەیی گەلی کورد لەباشووری کوردستاندا بەتایبەتی، چونکە مافی چارەی خۆنووسینی گەلێکی داگیرکراو یان تەنانەت سەلماندنی مافە کەلتوری‌و دیموکراتییەکانیش لەچوارچێوەی سیاسەتێکی دارێژراو لەسەر عەقڵیەتی کودەتاکردن جێی نابێتەوە، ئەم راستییەش لایەنێکی سەرەکی هۆکارەکانی سەرنەگرتنی هەوڵە دیپلۆماسییەکانی سەرکردایەتیی کورد لەگەڵ ئەو حکومەتانەدا روون دەکاتەوە.

٢٩-درێژەکێشانی جەنگی حکومەتی عیراقی سەردەمی (قاسم) لەدژی گەلی کورد هەلی بۆ بەعس‌و ناسیۆنالیستەکان رەخساند کەپرۆسەی کودەتاکەیان بەسەر (قاسم)دا سەرکەوتوو بێت، لەم رووەوە بەڵێنیان بەسەرکردایەتیی کورددا کەمافەکانیان دەستەبەر بکەن لەکاتی گەیشتنیان بەدەسەڵات، هەڵوێستی ئەوان‌و کورد لەو

بارەیەوە بۆ ئەو قۆناغــە بــەقازانجی هــەردوولایان لــەکۆتایی هێنــان بەدەسەڵاتی (قاسم) تەواوبوو.

٣٠-لەقۆناغی فەرمانڕەوایی‌ی حکومەتی بەعســدا، حکومــەتو سەرکردایەتی‌ی کورد بەهۆی کاریگــەری سیاســەتەکانی حکومــەتی پێشووەوە، پێویستیان بەئاشتی‌و وتووێژکردن هەبوو، لەبەرئــەوە هــەر لەسەرەتاوە هەردوو لایەنەکە ئارەزووی پێکهاتنیان بۆ یەکتری دەربڕی، بەڵام حکومەتی بەعس هەمیشە هەڵوێستی بەرەو تونــدی دەڕۆیشــت لەگەڵ قــایمتربوونی پێگــەی دەســەڵاتەکەی لەســەر هــەردوو ئاســتی نێوخۆیی‌و نێودەوڵەتی.

٣١-دروشمی سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد بۆ ئەو قۆناغە بریتــی بوو لەدیموکراسی بۆ عیراق‌و ئۆتۆنۆمی بــۆ کوردســتان، هــەر لەبــەر رۆشــنایی ئــەو دروشمــەدا ســەرکردایەتی‌ی کــورد پــرۆژەی خــۆی بــۆ وتووێژەکان دادەڕشت، بەڵام لەبەرامبەردا حکومەتی بــەعس بــەڵێنی زۆری داو کەمیشــی جێبــەجێ نــەکرد، چــونکە دواتــر دەرکــەوت کەسەلماندنی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لەگەڵ ناوەرۆك‌و ئامانجی کۆتایی ئایدۆلۆجی بەعس‌و سیاسەتی حکومەتەکەیدا یەکناگرێتەوە، کە بــەکودەتا دەســەڵاتی گرتــە دەســت‌و دەستوریشــی بەرێگەیــەکی نادیموکراســی دانــا، هــەر لەبــەر ئــەوە ســادەترین فۆرمــەکانی ناناوەنــدێتی‌ی کــارگێڕی لەشــێوەی ئۆتۆنــۆمی بەگــەلی کــورد رەوا نەبینی، ئەوەش هۆکاری هەرە بنچینەیی‌ی سەرنەگرتنی وتووێــژەکانی نێوانیان بوو.

٣٢-هــەر لــەم قۆناغــەدا ســەرکردایەتی‌ی کــورد پارێزگــاری لەیەکڕیزی‌و یەك هەڵوێستی‌ی خــۆی کردبــوو، هاوکــات توانایــەکی دیپلۆماسی تا ئەندازەیــەك باشــی نوانــد لەوتووێژەکانیــداو پــڕۆژەی تێروتەسەلی دەخستەڕوو کە لەڕووی رواڵەت‌و ناوەڕۆکــەوە گونجــاوبوو،

کەچــی لەبەرامبــەردا حکومــەتی بــەعس تــاك لایەنــە یاســای پارێزگاکــانی راگەیانــدو چارەســەرکردنی دۆزی نەتــەوەیی کــوردی لەجێبەجێکردنی ئەو یاسا کارگێڕییەدا خستەڕوو!.

٣٣-حکومەتی بەعس هەر لەسەرەتاوە گرەوی لەســەر سیاســەتی چەواشەکردن‌و بەدەمەوەگرتنی کــورد دەکــرد، بەمەبەســتی بەدەســت هێنانی کات‌و خۆرێکخستن‌و خۆ بەهێزکردن، بۆ ئەوەی لەقۆناغەکانی دواتردا لەپێگەیەکی بەهێزترەوە مامەڵە لەگەڵ خواستەکانی کورددا بکات‌و لەم کارەشیدا بۆ ماوەیەکی کاتیی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام سەرەنجام بەسەریدا شکایەوەو، لەبەرامبەریشدا ســەرکردایەتیی کــوردی هەمیشــە گــرەوی لەســەر رێبــازی ئاشــتیی‌و خــۆدوورگرتن لەڕووبەڕووبونەوەی چەکداری دەکــرد، مەگــەر تــەنها لــەو کاتانــەدا نەبێت کەتاکە ئەلتەرناتیڤی بەردەست بوبێت بۆ بەرگری لەخۆکردن.

٣٤-ســەرکردایەتیی کــورد لەهەڵوێســتەکانیدا گــرەوی لەســەر نواندنی نیازپــاکیی خــۆی‌و پابەنــدبوونی بــە بــەها رەوشــتییەکانی سیاسەتەوە دەکرد، بەپێچەوانەی حکومەتی بەعســەوە کــە لــەرێگای دەستگیرکردنی ئەندامانی شاندی کوردی دانوســتانکارەوە لەبەغــداد پێشــینەیەکی لــەبواری پێشــێلکردنی بنــەما رێســایی‌و عــورفی‌و نەریتییەکانی دیپلۆماسیەت‌و دانوستاندا تۆمار کرد.

٣٥-بوونی پــارتی وەکــو هێزێکــی رامیــاری-چــەکداری‌و رۆڵــی لەسەرکردایەتی کردنی بزووتنــەوەی کــورددا لەباشــور رەنگدانــەوەی لەسەر هاوکێشەی ململانێکە لەگــەڵ بەعســدا هــەبوو، چ لــەبواری چــەکداریدا یــان رامیاریــدا، بەتایبــەتی لەرێگــەی ئــەو کادرانــەی کەزەمینەسازییان بۆ چــالاکییە رامیــاری‌و دیپلۆماســیەکانی دەکــرد وەکـــو ئامـــادەکردنی پـــرۆژەی وتووێـــژکردن‌و بەشـــداریکردن

لەوتوویژەکانداو دریژەدان بەخەباتی روونا کبیریی و رۆژنامەنوسی بزوتنەوەکە.

٣٦-لایەنی کورد لەم قۆناغەدا پتر لەجاران رەچاوی ئامادەکردنی پیداویستییەکانی خەباتی دیپلۆماسی کرد، لەچەشنی وتوویژکردن لەریگەی شاندەوە، نەك تەنها ناردنی نوینەری تاکە کەسی، هەروەها ئەنجامدانی کۆبونەوەی شاندە کوردییەکە بەتەنها بۆ تاووتویکردنی هەنگاوەکانی داهاتوویان و هەلسەنگاندنی ئەوانەی پیشووترو تۆمارکردنی کۆنوسی کۆبوونەوەکان و هەولدان بۆ بەشداریکردن لەو کۆڕو کۆبونەوانەی کە کاریگەریان لەسەر دۆزی کورد دەبیت لەچەشنی کۆبونەوەکانی قاهیرەی تایبەت بەپرۆسەی یەکگرتنی عەرەب و، کارکردن لەپیناوی گواستنەوەی دۆزی کورد بۆ ناوەندە نیودەولەتییەکان و دەستەبەرکردنی پشتیوانی هەمەچەشن بۆی، بەلام لەگەل ئەوەشدا ئەنجامەکانی وەکو پیویست نەبوون، بەهۆی زالبونی بەرژەوەندییەکان و فەرامۆشکردنی بەها مرۆیی و رەوشتییەکان لەسیاسەتی نیودەولەتیداو یەکانگیربونی بەرژەوەندییەکانیان لەگەل حکومەتی بەعسدا.

٣٧-زۆربەی کات وتوویژەکان لەسەر ئاستیکی فەرمی و بالا ئەنجامدەدران و، هەندیك جاریش حکومەت بۆ مەبەستی تاکتیکی شاندی میللی بەکاردەهینا.

٣٨-دەستوری (٤/٤/١٩٦٣) ویڕای ئەوەی کە بەریوشوینیکی دیموکراسی دانەنرا، ناوەڕۆکیکی نادیموکراسیشی بۆ ریکخستنی کاروباری دەسەلات لەخۆگرتبوو، بەجۆریك کەیارمەتیدەر بوو بۆ چڕکردنەوەی دەسەلاتەکان و چەسپاندنی سستمیکی فەرمانڕەوای دکتاتۆری، هەروەها دەستورەکە کەم و کوڕی لەداڕشتن و ریکخستنی

چەند بوارێکی دەستوری پێویست لەخۆگرتبوو. لەبارەی گەلی کوردو مافەکانیشیەوە هیچ ئاماژەیەکی تایبەتی پێنەدا.

٣٩-پرۆسەی وتووێژەکانی نێوانیان هیچ رێککەوتنێکی گشتگیریی و چارەسەرێکی ریشەیی لێنەکەوتەوە، بەهۆی جیاوازیی ئایدیۆلۆجیاو سیاسەتیان و نەڕەخسانی زەمینەو مەرجەکانی دانوستانی سەرکەوتوو، لەوانەش نەبوونی جۆرێك لەهاوسەنگی رێژەیی لەتەرازوی هێزەکانی نێوان لایەنە دانوستکارەکاندا.

٤٠-لەسەردەمی فەرمانڕەوایی‌ی بەعسدا حکومەت درێژەی بەسیاسەتەکانی سەرکوتکردن و راگواستن و بەعەرەبکردنی کوردستان دا، چ لەسەردەمی جەنگدا یاخود لەسەروبەندی وتووێژەکاندا.

٤١-نەسەلماندنی یاسایی و پراکتیکی مافەکانی گەلی کوردو درێژەدان بەسیاسەتی جەنگ و سەرکوتکردنی، هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ هەرەس هێنانی حکومەتی بەعس لەرێگەی کودەتایەکەوە.

٤٢-دەسەڵاتدارانی نوێی عیراق لەسەردەمی (عبدالسلام عارف)دا بڕیاریاندا کەدرێژە بەجەنگی کوردستان بدەن و هیچ جۆرە نەرمییەك نەنوێنن، بەڵام سەرنەکەوتنیان لەبواری سەربازیدا ناچاری کرد کە بەشێوەیەکی تاکتیکی رێگەی وتووێژکردن بگرنەبەر، لەبەرامبەریشدا بارودۆخی کوردستان بەگشتی و نێوریزەکانی سەرکردایەتی‌ی کوردی لەم قۆناغەدا هاندەربوون بۆ چوونە پێشەوە لەدەستپێشخەرییەکی حکومەت بۆ وتووێژکردن.

٤٣-لەوتووێژەکانی نێوان سەرکردایەتی‌ی کوردو حکومەتی عیراقی سەردەمی (عبدالسلام عارف)دا خاڵی ناکۆکی سەرەکی نێوانیان بریتی‌بوو لەجۆرو ئەندازەی مافەکانی گەلی کورد کەبڕیاربوو لەدەستوری کاتیی عیراقدا بچەسپێنرێت، سەرەنجام رێککەوتنی (١٩٦٤/٢/١٠)ی لێکەوتەوە، ئەو رێککەوتنەی کەکۆمەڵێك

مەترسیو کێشەی گەورەی لەکۆڵ حکومەت کردەوەو لەبەرامبەریشدا دووبەرەکی ریزەکانی بزووتنەوەی کوردی قـوولتر کـردەوەو کاریگـەری خراپی لەسەر پێگەو توانـای کـورد بەگشـتیو توانـای دیپلۆماسـی بزوتنەوەکەی بەتایبەتی بەجێهێشتو لەقۆناغەکانی دواتردا بـەڕوونی رەنگیدایەوەو حکومەتی عیراقو ولاّتانی ناوچەکە رۆڵـی نێگـەتیڤیان لەئالۆزترکردنی رەوشەکەدا بینیو ئـەو بـارەش حکومـەتی پـتر بـێ دەربەسـتر کـرد لەپێشـکەش کردنـی هەرچەشـنە چارەسـەرێکی راستەقینەی دۆزی کورد.

٤٤-یـەکێك لەئامانجـە سـەرەکییەکانی سـەرکردایەتیی کـورد سەلماندنو چەسپاندنی مافەکانی گـەلی کـورد بـوو لەدەسـتورەکانی عیراقـدا، حکومەتـەکانی عیراقـیش لەوبارەیـەوە بـەڵێنی پێـدەدانو جێبەجێیان نەدەکرد.

٤٥-دەستوری (٢٢/٤/١٩٦٤)ی سەردەمی (عبدالسلام عارف) وێڕای ئەوەی کە کەموکوڕیو هەڵەی بابەتیو رواڵەتی زۆری تێدابوو، هیچ رێکخستنێکی دەستوریی لـەبارەی گـەلی کـوردو مافەکانیـەوە لەخۆنەگرتبوو. هەروەها سەبارەت بەدەسـتوری (٢٩/٤/١٩٦٤)کـە جگـە لەچـەند بڕگەیـەکی گشـتیو تـەمو مـژاوی، هـیچ چەشـنە رێکخستنێکی دەستوریی شایسـتەی لـەو بارەیـەوە لەخۆنـەگرتبوو، وێڕای ئەوەی کەزۆرێك لەبەندەکانی ئەو دەستورە کاریگەریی یاساییو رامیاری نێگەتیڤی لەسـەر گـەلی کـوردو مافـەکانی بەراسـتەوخۆو ناراستەوخۆ بەجێهێشت.

٤٦-لەسـایەی ئاگربەسـتەکەدا، لایـەنی کـورد زۆر خاڵـەکانی پابەندێتییەکەی خۆی جێبەجێ کرد، بەڵام حکومەتی عارف نەك هەر پابەندییەکانی خۆی جێبەجێ نەکرد، بەڵکو لـەوەش پـتر درێـژەی دا

بەسیاسەتەکانی راگواستنی کوردو بەعەرەبکردنی کوردستانو پاوانکردنی دەسەڵاتو سنوردارترکردنی ئازادییەکان.

٤٧-پرۆسێسی دانوستان دیاردەو سستمەو چەند توخمو مەرجی دیاریکراو لەخۆ دەگرێت، لەم روانگەیەوە دەردەکەوێت کەپرۆسەکانی دانوستانی نێوان سەرکردایەتیی کوردیو حکومەتەکانی عیراق فۆرمی سستمی بەخۆوە نەبینیوەو وەکو پێویست توخمو مەرجە دیاریکراوەکانی لەخۆنەگرتبوو، ئەمەش شەقڵێکی سەرەکی وتووێژەکانی نێوانیان بووە.

٤٨-هەرچەندە کەکورد بەناوەندێتی قایل بوو، لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت هیچ هەنگاوێکی کردارەکیو راستەقینەی بەئاراستەی چارەسەری ئاشتیانە نەناو رێگەچارەی سەربازی گرتە بەر.

٤٩-سەرکردایەتیی کورد پەنای بردە بەر چەند دەوڵەتێکی عەرەبی وەکو میسرو سوریا تاوەکو نێوانگیریان لەگەڵ حکومەتدا بکەن، بەڵام بێ ئاکام بوو، بەهۆی گرێدانی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ عیراقدا.

٥٠-حکومەت لەجەنگی کوردستاندا ئەو سەرکەوتنە خێراو چاوەڕوانکراوەی کە بەتەمای بوو بەدەست نەهێنا، هاوکات بەلەناوچوونی (عبدالسلام عارف) کێشەکانی عیراق بەگشتیو نێو ریزەکانی حکومەت بەتایبەتی تەشەنەیان سەند، لەبەرامبەریشدا جۆرێك لەپێکهاتنەوەی کاتیی ریزەکانی سەرکردایەتی کوردی گرتەوە، ئەم هۆکارانە فاکتەری سەرەکی بوون لەبەردەم گرتنەبەری حکومەتدا بۆ رێوشوێنی ئاشتییانە بەمەبەستی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، بەتایبەتی پاش ئەوەی کەحکومەت ئەوپەڕی تینو توانی سەربازیی خۆی بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەکەی کورد خستەکار.

٥١-حکومەتی عیراق لەسەردەمی (عبدالرحمن عارف)ی سەرۆك کۆمارو (عبدالرحمن بزاز)ی سەرۆك وەزیراندا بەئاراستەی هێورکردنەوەی بارودۆخی کوردستانو زاڵبون بەسەر بزوتنەوەکەیدا بەرێوشوێنی دیپلۆماسی لەرێگەی وتووێژەکانەوە کاریان دەکرد کە بەیاننامەکەی (٢٩/٦/١٩٦٦)ی لێکەوتەوە کەهەردوو باڵەکەی سەرکردایەتی پارتی پێی قایل بوون، نەك رێککەوتنی کوردو حکومەت کە دواتر خاڵەکانی جێبەجێ نەکرد. بەو شێوەیە حکومەت لەو رێگەیەوە توانی بزوتنەوەی چەکداری کورد بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سڕ بکاتو ماوەی گونجاو بۆ خۆرێکخستنەوەو خۆبەهێزکردن بەدەست بهێنێتو، لەبەرامبەریشدا دووبەرەکیو جەنگی خۆکوژی کورد لەجاران قوڵتر بکاتەوە کەتا سەرەتای ساڵی (١٩٦٩) بەکردەوە درێژەی کێشاو حکومەت فشاری پتر خستەسەر هەردوو لایەنی کوردیو خۆی لەپابەندێتیەکانی پێشووی لەبارەی مافەکانی کوردەوە دزیەوەو سەرکردایەتیی کوردیش وەکو قەوارەیەکی بێهێز مایەوەو هیچ دەستکەوتێکی یاساییو کردارەکی بۆ کورد لەم قۆناغەدا بەدەست نەهێنا. ئەوەش ئەو راستییەمان بۆ دەردەخات کەدوژمنانی کورد گرەو لەسەر سیاسەتی پەرتکەو زاڵبە دەکەنو دووبەرەکی گەلی کوردیش خاڵێکی لاوازی سەرەکیو دەردێکی کوشندەیەتی کە لەململانێی دیپلۆماسیو سەربازیدا هەمیشە بەروونی رەنگی داوەتەوە.

٥٢-پرۆژەکەی (بزاز) وێڕای ئەوەی کەپرۆگرامی حکومەت بوو، هیچ بەندێکی نە لەسەردەمی خۆیو نە لەسەردەمی کابینەکانی دواتردا جێبەجێ نەکرا، لەناوەرۆکیشدا هیچ دانپێدانانو چارەسەرێکی یاساییو رامیاریو ریشەیی بۆ دۆزی نەتەوەیی کورد لەباشوردا لەخۆ نەگرتبوو جگە لەباسکردنی چەند مافێکی نیوەچڵیو کارگێڕیو

کەلتوری کە بەهیچ شێوەیەك گوزارشتی لەکرۆکی دۆزی کوردو ئامانجە بنچینەییەکانی بزوتنەوەکەی نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا یەکگرتنی هۆکارە خۆیی‌و بابەتیەکان کوردی ناچار کرد کەپێی قایل بن.

٥٣-هەوڵە دیپلۆماسیەکانی نێوان سەرکردایەتی کوردو حکومەتی عیراق تا کودەتاکەی بەعس لە (١٧/٧/١٩٦٨)دا درێژەی هەبوو، بەلاّم سەرلەبەریان هیچ ئاکامێکی بەئاراستەی جێبەجێکردنی بەڵێن‌و پابەندێتییەکانی حکومەت بەرامبەر بەگەلی کوردو سەرکردایەتییەکەی لێنەکەوتەوە، چونکە رێککەوتن‌و چارەسەرکردنی دادپەروەرانەی دۆزی کورد لەئایدیاو سیاسەتی راستەقینەی حکومەتدا نەبوو، بەلاّم بەلای حکومەتەوە پرسەکە خۆی لەبەدەمەوەگرتنی سەرکردایەتی‌ی کوردو بەگژیەکتریدا کردنیان‌و بەدەستهێنانی کات‌و خۆسازدانەوە بۆ خولێکی جەنگی کوردستاندا دەبینیەوەو لەو بوارەشدا تا ئەندازەیەکی گەورە ئامانجەکانی خۆی پێکا.

٥٤-جۆری سستمی فەرمانڕەوایی‌و دەستورەکەی سەردەمی (عبدالسلام- عبدالرحمن عارف) دیموکراسی نەبوون، ئەو راستییەش هۆکارێکی سەرەکی تری سەرنەگرتنی وتووێژەکانی ئەو قۆناغەیان بوو، چونکە لەسایەی سستمی دکتاتۆریدا ئەستەمە کێشەی نەتەوەیی هیچ گەلێك بەشێوەیەکی دەستوری‌و دادپەروەرانە چارەسەر بکرێت.

٥٥-توانای دیپلۆماسی‌ی کورد بەند بوو بەتوانای گەلی کوردو سەرکردایەتییەکەیەوە لەهەموو رووەکانی توانای ماددی‌و مەعنەوییەوەو تەرازووی هێزەکان‌و فاکتەرەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی (ئابووری، کۆمەلاّیەتی، سەربازی، رامیاری، کەلتوری،

باری جیۆپۆلەتیکی کوردستان، فاکتەری نێوچەیی‌و نێودەوڵـەتی‌و .. هتد).

٥٦-دانوستان پرۆسەیەکی دوورودرێژەو چەندین قۆناغ‌و هـەنگاوی یەك بەدوای یەك‌و تەواوکەریی لەخۆدەگرێت، بەڵام زۆربـەی جارەکـان لەوتووێژەکانی نێوان هەردوو لایـەنی کـوردی‌و حکومـەتی عیراقـدا ڕەچاوکردن‌و پەیڕەوکردنی پلەبەندی ئەو قۆناغ‌و هەنگاوانەی بـەخۆوە نەبینیوە، بەتایبەتیش لەلایەن سـەرکردایەتی‌ی کوردییـەوە، ئـەوەش لەبەر هۆکار گەلێکی خۆیی‌و بابەتی کەژینگە نێوخۆییەکـەی گـەلی کـوردو بزوتنەوەکـەی‌و سـەرکردایەتییەکەی پێکهێنـاوە، وێـڕای کاریگەری ژینگەی نێودەوڵەتی لەوبارەیەوە.

٥٧-دانوستانی سـەرکەوتوو زەمینـەو مـەرج‌و شـەقڵی تایبـەت بـەخۆی هەیـە کەدانوسـتانکاری سـەرکەوتوو یـەکێك لەتوخمـە سەرەکییەکانی پێـك دەهێنێـت، لـەم ڕووەوە پرۆسێسـی وتووێـژەکانی هەردوو لایەنی کوردی‌و حکومەتەکانی عیراق مەرجی سـەرکەوتنیان تێـدا نـەبوو، لەبەرئـەوە سـەرلەبەریان ڕێککـەوتنێکی جـێگیری لێنەکەوتەوە کەببێتە مایەی چارەسەرکردنی ریشەیی دۆزی نەتـەوەی کورد لەلایەك‌و سەقامگیری‌و گەشەپێدانی عـیراق لەلایـەکی تـرەوە، هۆکاری هەرە سەرەکی سەرنەگرتنی وتووێـژەکانیش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئایدیاو سیاسەتەکانی حکومـەتی عـیراق بەرامبـەر بەگـەلی کـوردو مافەکانی.

٥٨-لەسـەر لەبـەری قۆناغـەکانی وتووێـژەکانی نێوانیانـدا لەدامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوە، لایەنی کوردی دام‌و دەزگایەکی یان تەنانەت لیژنەیەکی تایبەتمەندو پسـپۆڕی بـەبواری دانوسـتان یـان تایبەت بەپێگەیاندنی کادر بۆ ئەو بوارە، یان هەوڵدان بـۆ ناردنیـان بۆ هەندەران بۆ فێربوونی زانست‌و بەدەستهێنانی شارەزایی لەو بوارەدا

نەبوو، بەتایبەتیش لەو سەردەمانەدا کەکورد خاوەنی حکومەتو قەوارەی نێوخۆیی‌ی نیمچە سەربەخۆ بووە وەکو سەردەمی (شێخ محمود)، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر توانای ئەنجامدانی وتووێژکردنی شاندە کوردییەکان بەجێهێشت، لەبەرامبەریشدا حکومەتەکانی عیراق بایەخی گونجاویان دابوو بەدامەزراندنی دامو دەزگای تایبەت بەو بوارەو پێگەیاندنی کادری پسپۆرو بەئاشنایی کردنیان بەزانستو هونەرەکانی دانوستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر خەڵکانی عەسکەری دانوستانیان دەکرد! کەچی ئەو کەسانەی کە لەلایەنی کوردییەوە لەوتووێژەکاندا بەشداریان پێدەکرا کەسانێك بوون کە لەئەنجامدانی کارەکانیاندا پشتیان بەتواناو سەلیقەی خۆیان دەبەست کەبەشێوەیەکی تا رادەیەکی زۆر نازانستیانە لەمیانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و کاری رامیاریاندا فێری دەبوون، ئەوەش دەبووە مایەی ئەوەی کەدانوستکارانی هەردوو لایەن لەزۆر رووەوە لەگەڵ یەکتریدا جیاواز بن، وەکو جیاوازی لەئایدیاو توانای شارەزایی لەزانستو هونەرەکانی دیپلۆماسیەتدا، لەبەر ئەوە بۆمان دەرکەوت کەلایەنی کوردی هەمیشە لەوتووێژەکاندا گرەوی لەسەر بنەما رەوشتیەکان کردووە، کەچی لایەنی حکومەتی عیراقی هەمیشە لەرواڵەتدا باسی لەبنەما رەوشتییەکان کردووەو بەکردەوەش پێچەوانەکەی ئەنجامداوە.

## پێڕست



**دكتۆر واحد عومەر محێدین**

* ساڵی 1965 لە کەرکوک لەدایك بوە.
* ساڵی 1988 بەکالۆریۆسی لە کۆلێجی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدا بەدەست هێنا.
* ساڵی 1992 بڕوانامەی ماستەری لەبواری پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا لە کۆلێجی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدا بەدەست هێنا.
* ساڵی 2005 دکتۆرای لەبواری مێژوی سیاسیی هاوچەرخی کورد لە کۆلێجی زانستە سیاسییەکانی سلێمانی وەرگرت.
* ئێستا ڕاگری کۆلێجی یاسای زانکۆی سلێمانییە.
* ئەندامی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستانە.



نرخ (3000) دینار